چاپی دووەم

# شرحی ابن عقیل

## بە کوردی

لەگەڵ لێکدانەوەو إعراب کردنی سەرجەم دەقەکانی قورئان و فەرمودەکان، و ڕاڤەکردنی سەرجەم دێرەکانی ئەلفیە بە کوردی

ئامادەکردنی

سەربەست جەباری

بەرگی یەکەم

# شرحی ابن عقیل

# به کوردی

لەگەڵ لێکدانەوە و إعراب کردنی سەرجەم دەقەکانی قورئان و فەرمودەکان ، و ڕاڤەکردنی سەرجەم دێرەکانی ئەلفیە بە کوردی

ئامادەکردنی

سەربەست جەباری

# شرحى ابن عقيل به كوردى

ئامادەكردنى : سەربەست جەبارى

تيراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانەى : ڕێ نوێ

ژمارەى سپاردن: لە بەڕێوبەرايەتى كتێبخانە گشتييەكان ژمارەى سپاردنى ( ١٢٤٤ ) ى ساڵى ( ٢٠١٢ ) ى پێدراوە.

## پێشەکی وەرگێڕ

الحمدُ لله رافع الدرجات لمن انخفض لجلاله ، وفاتح البركات لمن انتصب لشكر إفضاله ، والصلاة والسلام على حبيبنا محمد وآله وأصحابه وأتباعه إلى يوم الدين.

أما بعد : بێگومان باشترین و چاکترین شتێك مرۆڤ پێوەی سەرقاڵ بێت و ساتەکانی تەمەنی لەگەڵدا بەڕێ بکات و خۆی لە پێناودا ماندوو بکات و هەوڵ و کۆششی تەواو بکات بۆ وە دەست هێنانی بریتیە لە زانست و زانیاری بەسوود ، دیارە زانستیش بوارێکی بەرفراوانەو جۆرەها زانست بوونی هەیە لە ژیانی ئێمەدا ، هەر زانستێکیش بە پێی بابەت و ناوەڕۆکەکەی گرنگەو بە سوودە ، جا زانستە ئیسلامیەکان گرنگی و پایەی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ ژیانی مرۆڤ سەرچاوەی زانستە ئیسلامیەکانیش بریتیە لە قورئان و سوننەت کە پێیان دەوترێت ( العلوم الأصلية ) چونکە قورئان و سوننەت بریتین لە وەحی خوای پەروەدگارو دوورن لە هەڵەو کەم و کورتی ، کەواتە قورئان و سوننەت مەبەستی سەرەکین لە خوێندن و گەڕان بە دوای زانستە ئیسلامیەکاندا ، مرۆڤیش بۆ گەیشتن بە هەر مەبەستێك پێویستی بە هۆکار و ئالیەتێك هەیە کە دەبێتە هۆی ئاسان بەدەست هێنانی مەبەستەکە ، جا زانایانی ئێمە بۆ گەیشتن بە حاڵی بوونی تەواو لە قورئان و سوننەت چەند زانستێکیان داناوە و ناویان ناوە (( علوم الآلة )) یان (( علوم الوسائل)) کە هۆکارن بۆ چاك حاڵی بوون لە (( علوم المقاصد )) کە بریتین لە قورئان و سوننەت.

دیارە (( علوم الآلة )) بە شێوەیەکی گشتی چوارن :

( ١ ) – زانستەکانی قورئان (( علوم القرآن )).

( ٢ ) – زانستەکانی فەرموودە (( علوم الحديث )).

( ٣ ) – زانستی اصول الفقه.

( ٤ ) – زانستەکانی زمانی عەرەبی (( علوم اللغة العربية )).

جا ئەوەی مەبەستی ئێمەیە لێرەدا بریتیە لە جۆری چوارەم کە ئەویش (١٢) بەشن واتە زانستەکانی فێربوونی زمانی عەرەبی دوانزەن ، کە لەم دوو دێڕەدا کورت کراوەتەوە :

نحو ، وصرف ، عروض ، ثمّ قافية　　　وبعدها لغة ، قرضٌ ، وإنشاء

خطٌ ، بيانٌ ، معان ، مع محاضرة　　　والاشتقاق لها الأدابُ اسماء

جا لەم دوانزە زانستەش گرنگترینیان چوارن کە بریتین لە (( نحو وصرف وبلاغة وأدب )) ئەم چوار زانستە لەسەرجەم حوجرەو خوێندنگا ئاینیەکان و کۆلێژەکانی شەریعەو زمانی عەرەبی دەخوێنرێن.

بێگومان بناغەو بنچینەی ئەم چوارەش بریتیە لە زانستی (( النحو )) کە فێربوونی فەرزە لەسەر هەرکەسێك بیەوێت لە دەقەکانی قورئان و سوننەت حاڵی بێت شتێکی مەحاڵە تێگەیشتن لە ماناو مەبەستی دەقەکان بەبێ زانینی زانستی (( نحو )) وەکو مامۆستا مەلا عبدلکریمی مدرس – ڕەحمەتی خوای لێبێت – دەفەرموێت :

بەبێ نحو وصرف دەس نادا بۆ کەس

فەهمی ئەساسی دینی موقەدەس

جا بە درێژای مێژووی موسڵمانان و هەر لەو سەردەمی زانستی نحو پەیدا بوو زانایانی ئێمە گرنگی زۆریان داوە بەم زانستەو بە چەندەها شێوە کتێب و نامیلکەیان لەسەر نوسیوە بە شیعرو پەخشان ، یەکێك لەو کتێبە بەناوبانگانەی جیهانی ئیسلامی لە زانستی نحودا بریتیە لە کتێبی

ئەلفیەی[١] ابن مالك – ڕەحمەتی خوای لێبێت – كە بریتیە لە هەزار دێڕە شیعر كە زۆر بە ووردی و جوانی پوختە و كاكڵەی یاساكانی زمانی عەرەبی تێدا باسكراوە ، زانایانیش گرنگی زۆریان بەم كتێبە داوە و زیاتر لە (٥٠) زانا شەرح و ڕاڤەی ئەم كتێبەیان كردووە ، گرنگترین ئەم ڕاڤانەش بریتیە لە شەرحی ابن عقیل – ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت – لەبەر ئەوەی ڕاڤەیەكی پوخت و جوانی كردووە و بەڵگەی زۆری لە دەقەكانی قورئان و سوننەت و شیعرە عەرەبیەكان كە شیعرەكانیش ئەوانەن كە دەكرێنە بەڵگە لەسەر یاساكانی ڕێزمانی عەرەبی واتە شیعری پێش نیوەی سەدەی دووەمی كۆچی ، بۆیە لە زۆرێك لە وولاتانی ئیسلامیدا ئەم شەرحی ابن عقیلە كراوەتە مەنهەجی خوێندن لە خوێندنگەو كۆلێژەكاندا، بۆیە منیش لەسەر داوای چەند قوتابی و خوێندكارێكی بەڕێز هەستام بە شەرح و ڕاڤەكردنی كتێبی شەرحی ابن عقیل بە تۆماركردنی لەسەر كاسێت ساڵی (٢٠٠٤ ) بە دواوە ، كاتێك داوام لێكرا شەرحی ابن عقیل بە چەند برایەك بڵێمەوە كە لە یەكێك لە مەدرەسە شەرعیەكانی شارۆچكەی چەمچەماڵ دەیانخوێند ، دواتریش كاسێتەكان لە ناو خوێندكاراندا بڵاوبویەوەو برای بەڕێزیش كاك (( گەیلان )) كە خوێندكاری بەشی عەرەبی كۆلێژی پەروەردە بوو هەستا بە تۆماركردنی كاسێتەكان لەسەر (C.D) و دواتریش چەن برایەكی دڵسۆز داوایان لێكردم ئەم شەرحە بنوسنەوە و بكرێتە كتێب و منیش داواكەیانم پێ باش بوو ، بەڵام ئەوەی لە تۆمارەكاندا ووترابوو زۆر نەدەگونجا بۆ نوسینەوە و كردن بە كتێب ، بۆیە سەر لە نوێ هەستام بە وەرگێڕان و نوسینەوەی شەرحی ابن عقیل لەگەڵ دانانی پەراوێزی وورد بۆ ئەو شوێنانەی پێویستی بە لێكدانەوەی زیاتر دەكرد لەگەڵ ماناكردن و إعراب كردنی سەرجەم دەقە قووڕئانیەكان و

---

[١] – دواتر پێناسەی كتێبی ئەلفیە دەكەین – إن شاء الله.

فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) کە بە بەبەڵگە هێنراوەتەوە ، هەوەها ماناکردنی دێرە شیعرەکانی ئەلفیە بە کورتی لە پەراوێزەکەدا ، لەگەڵ ماناکردن و دیاری کردنی بەڵگە شیعرییەکان کە بە بەڵگە (( الشاهد )) هێنراوەتەوە لەسەر یاساکان.

جا بێگومان وەرگێڕانی کتێبی زانستی نحو وصرف کارێکی ئاسان نیە و قورسە و بۆیە هەندێك لە مامۆستایان پێیان باش نیە یاساکانی ڕێزمانی عەرەبی (( النحو والصرف )) بکرێتە کوردی ، بە پاساوی ئەوەی کەسێك بیەوێت فێری زانستی نحو وصرف بێت دەبێت هەوڵبدات فێری زمانی عەرەبی بێت و بە عەرەبیش بخوێنێت ، بەڵام هەندێکی تر لە مامۆستایان – لەوانە مامۆستا مەلا عبدولکەریمی مدریس خوای گەروە دەرەجەی عالی بکات – پێیان شتێکی چاکە وەرگێڕانی کتێبەکانی نحو و صرف بۆ زمانی کوردی ، بۆیە منیش دوای بیرکردنەوە و ڕاوێژکردن هەستام بەم کارە و ئومێدم وایە بەم کارەم خزمەتێکم بە بە زانستە ئیسلامیەکان کردبێت کە خۆم بە خزمەت کاری ئەو زانستانە دەزانم ، داواکارم لە خوای گەروە یارمەتیم بدات بۆ تەواو کردنی ئەم کتێبە بە نرخەو هەموو ئەو شتانەی کە خزمەت بە بەرنامە پیرۆزەکەی ئیسلام بکات ، خوای گەورە ئەم چاکەیەم لێ وەرگرێت و بۆمی بکات ، بە توێشووی ڕۆژێك کە پێویستمان بە دەنکە خەردەلەیەك لە چاکە هەیە ، خوای پەروەدگار لە دایك و باوك و مامۆستا بەڕێزەکانم خۆش بێت و ڕێزداری دنیاو قیامەتیان بکات بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە ، لە کۆتای ئەم پێشەکیەشدا پێویستە بڵێم هەر هەڵەیەك لەم کارەدا هەبێت ئەوە لە نەفس و شەیتانەوەیەو هەرچاکەو پێکانیکیشم هەبێت ئەوە فەزڵ و بەخششی خوای گەورەیە.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آل محمد وأصحابه أجمعين

سربست جباری

١٤٣٣/١/١ – چەمچەماڵ / ئاشتی

# كورتەيەك دەربارەی ژيانی پێشەوا ابن مالك ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ خاوەنی كتێبی ئەلفيە

ناوی (( محمدی كوڕی عبداللەی كوڕی مالك ))ە و نازناوی ((جمال الدين)) و ناسراوە بە (( ابن مالك )) لە شاری جەيانی وڵاتی ئەندەلس لە دايك بووە ساڵی (٦٠٠ ) كۆچی ، لەسەرتای تەمەنيەوە سەرقاڵی خوێندن و بە دەست هێنانی زانست و زانياری بووە و لە شارەكەی خۆيان ، دواتر بەمەبەستی زياتر دەسكەوتنی زانست چەند وڵاتێك گەڕاوە لای چەند زانايەكی گەورەی جيهانی ئيسلامی ئەو كات زۆربەی زانستە ئيسلاميەكانی خوێندوە و دوواتر بووە بە يەكێك لە زانا ناودارەكان و زۆرێك لە قوتابيانی زانست لە خزمەتيدا فێری زانستەكان بوون بە تايبەت لە بواری زانستەكانی زمانی عەرەبی.

ابن مالك لە بواری نوسين و دانانی كتێب دا خاوەنی نزيكەی ( ٥٠ ) كتێبە لە بوارە جياجياكاندا بە تايبەت لە بواری زانستەكانی زمانی عەرەبی ((علوم اللغة العربية ))دا، بۆيە زانايان ووتويانە ابن مالك لە بواری نحو وصرفدا دەريايەكە هاو وێنەی نيە.

بەناوبانگترين كتێبی ابن مالك بريتيە لە كتێبی (( الألفية )) كە ((الخلاصە)) شی پێدەوترێت ، ئەم كتێبی ئەلفيەيە پوختەكراو و كورتكراوەی كتێبی (( الكافيە الشافيە ))يە كە دانراوی ابن مالك خۆيەتی و پێكهاتووە لە نزيكەی سێ هەزار دێڕە شيعر دەربارەی وردەكاری زانستەكانی نحو و صرف ، دواتر ابن مالك زۆر بە

ووردی و زیرەکانە ئەو سێ هەزار دێڕەی پوخت کردۆتەوە لە ( ١٠٠٠ ) دێڕدا بۆ ئەوەی بتوانرێت لەبەر بکرێت* خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.
زانای پایە بەرز لە ١٢ ی شعبانی ساڵی ٦٧٢ کۆچی ، لەشاری دیمەشق کۆچی دوایی کردووە لە مزگەوتی (( الامـوی )) نوێـژی لەسەر کراوە و لە هەمان شار نێژراوە ، خوای گەورە لێی خۆش بێت و دەرەجەی عالی بکات و بەهەشتی بەرین جێگای بێت.

## کورتەیەك دەربارەی ژیانی پێشەوا ابن عقیل
## – ڕەحمەتی خوای لێبێت –

نـاو تـەواوی (( عبداللـەی کـوڕی عبـدالرحمن ی کـوڕی عبداللـە )) یـە و نازناوی (( بهاء الدین ))ە و ناسراوە بە ابن عقیل ، کە نەژادی دەگەڕێتەوە سەر (( عقیلی کوڕی ابو طـالب )) ڕەزای خوای لێبێت ، لە ٩ ی محرەمی ساڵی ٦٩٨ ی کۆچی لە شـاری (( حلب )) ی وولاتـی شام لە دایك بووە ، دواتر چۆتە شاری قاهیرە و لەوێ دەستی بە خوێندن کردووە لای گەورە زانایان و شارەزایانی ئەو شارەو زۆربەی زانستەکانی بە دەست هێناوە و بووە بە یەکێك لە پێشەوایانی سەردەمی خۆی و زۆرێك لە خوازیارانی زانست و زانیاری لە خزمەتیدا خوێندوویانە.
پێشەوا ابن عقیل لە زۆرێك لە بوارەکاندا کتێب و نوسراوی هەیە بە تایبەت لە بوارەکانی (( تەفسیر و فقە و نحو و زانستی فەرموودە ناسی )) ، بە ناوبانگترینیـان کتێبـی (ابـن عقیـل)ە بریتیە لـەو شـەرح و ڕاڤەیـەی کـە

---

* زانایانیش گرنگی زۆریان داوە بەم کتێبی ئەلفیەو شەرح و ڕاڤە و پەراوێزیان بۆ کردووە ، هەروەها وەرگێڕاوە بۆ زمانی فەرەنسی و ئیتاڵی.

بەنازناوی خۆیەوە ناونراوە لەسەر ئەلفیەی ابن مالك لە زانستی نحو وصرفدا ، کە شەرح و ڕاڤەیەکی پوخت و جوان و پڕ مانای کردووە.
زانای پایە بەرز لە مانگی ربیعی یەکەم ساڵی ٧٩٦ ی کۆچی لە شاری قاهیرە کۆچی دوای کردووە و لە نزیك گۆڕی پێشەوای خۆی ئیمامی شافیعی نێژراوە. خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی خێریان بداتەوە.

## چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

یەکەم / ئەم کتێبە پێکهاتووە لە سێ بەش : ( ١ ) ئەلفیەی ابن مالك کە بریتیە لە دێڕە شیعرەکان و هەموویان ژمارەیان بۆ دانراوە و بەپێی پێویستیش سەرباسیان بۆ دانراوە.
( ٢ ) شەرحی ابن عقیل ئەویش بریتیە لە ڕاڤەو لێکدانەوەی زانای پایە بەرز (( ابن عقیل )) لەسەر دێڕەکانی ئەلفیە ، بە لێکدانەوە و خاڵبەندی کردن و هێنانەوەی بەڵگە لە دەقەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) و شیعرە عەرەبیەکان ، هەروەها باس کردنی ڕای زانایان دەربارەی بابەتەکان ، لەگەڵ هەندێ وردە کاریدا.
( ٣ ) دانانی پەراوێز لە لایەن بەندەوە ، دەربارەی راڤەکردن و اعراب کردنی سەرجەم دەقەکانی ئەو ئایەت و فەرموودانەی (( ابن عقیل )) کردوونی بە بەڵگە بۆ بابەتەکان ، هەروەها ماناکردنی دێڕەکانی ئەلفیە بە کورتی لەگەڵ ماناکردنی ئەو دێڕە شیعرانەی (( ابن عقیل )) باسی کردووە بەبەڵگە لەسەر یاساکان ، هەروەها ڕوونکردنەوەی ئەو شوێن و بابەتانەی پێویستیان بە ڕوونکرنەوە هەیە ، لەگەڵ إعرابی کردنی زۆربەی ڕستە (( جملة )) کان بۆ زیاتر سوود وەرگرتن.

دووەم / ئەو دێڕە شیعرانەی کە بەبەڵگە هێنراونەتەوە لەلایەن (( ابن عقیل)) بۆ بەڵگە بوون ((الاستشهاد)) لەسەر بابەتەکان ، هێمای پیتی ((ش)) لەسەرەتایاندا دانراوە بۆ زانینی ئەوەی کە ئەمانە شاهدو بەڵگەن و ئەلفیەکە نین، جا بەندە لە پەراوێزەکەدا تەنها مانای ئەو دێڕانەم کردووە و إعرابیانم نەکردووە لەبەر ئەوەی لە زۆربەی کتێبەکانی (( شرح ابن عقیل )) دا إعرابی کراوە.

سێ یەم / زۆرجار زاراوەی عەرەبیم بەکارهێناوە و زاراوە نحوییەکانم وەکو خۆی داناوە و باسکردووە و نەمکردۆتە کوردی پەتی چونکە ئەوە ئاسانترو باشترە ، بۆ نمونە لە بری ئەوە بڵێم کرداری ڕانەبردوو دەڵێم ((فعلی مضارع)) ..... هتد.

چوارەم / ئەم بەرگی یەکەمە لە سەرەتای کتێبەکەوە دەست پێ دەکات تاوەکو بابەتی (( نواسخ الابتداء )) چونکە لە زۆر شوێن لە قۆناغی یەکەم ئەوەندە دەخوێنرێت .

پێنج / پێویستە خوێندکار هەوڵدان لە کاتی خوێندنی ئەم کتێبەدا کتێبە عەرەبیەکەی لەبەردەستدا بێت ، بۆ ئەوەی باشتر حاڵی بێت و لە هەمان کاتدا فێری زمانی عەرەبیش بێت .

## پێشەكى ابن مالك بۆ ئەلفیەكەى

١- قال محمدٌ هـــو ابنِ مـــالكِ : أحمدُ ربّی الله خیر مالـــك
٢- مُصلیاً على النبيِّ المصطفى وآله المستكملین الشَّـرفا
٣- واســـتـــعینُ الله في الفیـــه مقاصد النحو بها محويّه
٤- تقّربُ الاقصى بلفـــظ مُوجَز وتبسط البذل بوْعدِ مُنّجَز
٥- وتقتضي رضاً بغـــیر سُخطِ فائقةً الفیة ابـــنِ معـــط
٦- وهو بسبق حائزٌ تفضـــیلاً مُستوجبٌ ثنائي الجمیلا
٧- والله یقضي بهبـــاتٍ وافـره لي وله في درجات الآخرة

پوختەى ماناى ئەم حەوت دێڕە پێشەكیە بەم شێوەیەیە :

( ١ ) دەڵێت محمد كە ئیمام و پێشەواى زانستى زمانى عەرەبیەو ناوى محمدى كوڕى عەبدولاَّى ئەندەلسیە و شافعى مذهبە – ڕەحمەتى خواى لێبیت – ستایشى خواى پەروەدگار دەكەم بە جوانترین شێوە ئەو خوایەى باشترین و چاكترین خاوەنە.

( ٢ ) داواكارم لە خواى پەروەدگار ڕێزو ڕەحمەت و حورمەت ببەخشێتە پێغەمبەرى هەڵبژێراو ، وە بۆ ئەو شوێنكەوتووانى خاوەنى ڕێز و پلەو پایەى تەواون.

( ٣ ) داواى یارمەتى و كۆمەكى لە خواى گەورە دەكەم بۆ هۆنینەوەى هەزار دێڕەكە كە یاساو مەبەستەكانى زانستى ڕێزمانى عەرەبى لە خۆ گرتووە.

( ٤ ) هەزار دێڕەكەم سیفەتى وایە نزیك دەكاتەوە بۆ خوێنەرانى بە ووشەو ویژەى كورت و پوخت و پڕ مانا ، هەروەها بلاَّو دەكاتەوە و دەبەخشێت بە بەڵێنیكى دامەزراو و جێ بەجێ كراو.

( ٥ ) هەروەها دەبێتە هۆى ڕەزامەندى خوێنەرانى بەبێ ڕەنجان و ناڕەزایى – هەروەها ئەم هەزار دێڕەى من سەركەووتو و باشترە لە هەزار دێڕەكەى

ابن معط ناوی یحیی ی كوڕی عبد المعطی و خەڵكی كیشوەری ئەفریقیای باك

وور بووە و حنفی مذهب بووە و یەكێكە لە زانا گەورەكان و خاوەنی ئەلفیەیەكە لە زانستی ڕێزمانی زانستی عەرەبیدا.

( ٦ ) بەلاَم ئەلفیەكەی ابن معط بەڕێزترە چونكە پێش من داینـاوە و پێشەنگ بووە لەبەر ئەوەی ئەو پێش من كەوتوە بۆیە من سوپاس و ستایشی دەكەم بە جوانترین شێوە.

( ٧ ) داوا دەكەم لە خوای گەورە – پێمان ببەخشێت خێر و بەخششی زۆر بۆ من و ئەویش – واتا ابن معط – لە پلە بەرزەكانی بەهەشتدا. أمین اجمعین.

## م / الكلام و مايتألف منه

## باسى قسه ( ڕسته ) و ئەو شتانەى قسه پێکدێنێت

٨- كلامُنا لفظٌ مفيد كأسْتَقم     واسمٌ و فعل ثم حرفٌ الكلم

٩- واحدهُ كلمةٌ و القول عَم     وكلمةٌ بها كلام قد يُؤَمّ [1]

كلام له زاراوەى زانايانى نحودا بريتيه له وێژه (لفظ)ێكى بەسوود به شێوەيەك جوان و گونجاو بێت وەستان لەسەرى واتا لەسەر ئەو قسەيه .
جا ووشەى ( لفظ ) [2]ڕەگەز (جنس )ێكه له خۆ دەگرێت كلام و كلمه و كلم [3]، هەروەها له خۆ دەگريت ووشەى بێ مانا وەكو ( دێز ) [4]وە مانادار وەكو ( عمرو ) وە ووشەى ( مفيد ) دەردەكات له پێناسەكە واتا پێناسەى كلام ئەو ووشانەى مانايان نيه .

---

[1] ماناى ئەم دووديڕەى ابن مالك – ڕەحمەتى خواى لێبێت به كورتى وايه :
كلام لاى ئێمەى خاوەن ڕێزمان بريتيه له وێژەيەكى به سوود وەكو ( استقم ) ، بەشەكانى كلام سيانن :ناو( اسم ) – كردار ( فعل ) – پيت ( حرف ) .
وە تاكى (الكلم) (كلمة)ـەيه ، وە ووشەى قول گشتگيره و كلام و كلم و كلمه له خۆ دەگرێت . هەندێ جاريش كلمه به كاردێت و مەبەست پێى كلامه .

[2] لێرەدا ابن عقيل ڕەحمەتى خواى لێبێت – دواى پێناسەى كلام دەست دەكات به شەرح و ڕاڤەكردنى پێناسەكە .

[3] ئەم سێ ووشەيه ماناكانيان بەم شێوەيەيه : أ – كلام – قسه :– دەبێت له دوو ووشه زياتر بێت و ماناى تەواوى هەبێت
ب– كلمة – تاكه :– واته ووشەيەك جا يان اسمه يان فعله يان حرفه
ج – كلم – ناوێكى كۆيه و له زاراوەى زانستى نحودا بريتيه لەوەى پێكهاتبێت له سێ ووشه و زياتر چى ماناى هەبێت يان نا ، دواتريش به نمونه باسى دەكەين .

[4] ووشەى ( دَيْز ) له ئەصلدا ووشەى ( زيد )ـه و پيتەكانى پاش و پێش كراوە ، وە كراوەته نمونه بۆ ئەو ووشانەى مانايان نيه .

وە دەستەواژەی ( فائدة يحسن السكوت عليها ) دەردەكات كلمە وە هەندی لە كلم – كلم بريتيە لەوەی پێكهاتبێت لە سێ ووشە و زیاتر– ئەگەر مانای نەبیتێ و نەگونجێت وەستان لەسەری وەكو ( إن قام زيد) واتە ئەگەر زەید هەستا[١].

وە كلام دروست نابێت مەگەر لە دوو ناودا نەبێت وەكو ( زيد قائم )[٢]، یان لە كردارێك و ناوێك وەكو ( قام زيد )[٣] وەكو قسەی ابن مالك – رەحمەتی خوای لێبێت – كە فەرمووی : استقم[٤] كە پێكهاتووە لە فعلێكی أمر و فاعلێكی شاراوە (مستتر) واتە ( استقم انت ) . جا ابن مالك بە هێنانەوەی ئەم نمونەیە[٥] خۆی بێنیاز كرد لەوەی بڵێت ( فائدة يحسن السكوت عليها) واتە ئەو قسەیە مانایەكی وای هەبێت جوان و گونجاو بێت وەستان لەسەری ، هەروەك ئەوەی فەرموویێتی (كلام ) بريتيە لە وێژەیەكی بەسوود ،سوودێكی وا وەكو سوود و مانای (إستقم)[٦].

هەروەها دانەر( المصنف )[٧]بۆیە فەرمووی(كلامنا)بۆ ئەوەی بزانرێت ئەم پێناسەیە بۆ كلام پێناسەی كلامە لەزاراوەی زانستی نحودا نەوەك پێناسەی كلام لە زمانەوانیدا چونكە كلام لە زمانەوانیدا ناوە بۆ هەرشتێك بوێژرێت مانای هەبێت یان نا .

وە كلم : ناوی رەگەزە[٨] مفرەدەكەی ( كلمة )یە ، كلمە ش یان اسمە یان فعلە یان حەرفە ، چونكە كلمە ئەگەر مانایەكی هەبێت لە خودی خۆی دا و

---

[١] ئەم رستەیە ( ان قام زيد ) ( كلم )ە بەڵام كلام نیە چونكە مانای نییە و بەرامبەر (مخاطب ) چاوەرێی تەواو كردنیەتی .

[٢] (زيد قائم ) رستەیەكی ناوی ( اسم )یە و پێكهاتووە لە مبتدا + خبر .

[٣] (قام زيد ) جملەیەكی فعلیە و پێكهاتووە لە فعل ماضی مبنی علی الفتح + فاعل مرفوع .

[٤] استقم – فعل امر مبنی علی السكون و فاعلە : ضمير مستتر تقديره انت

[٥] واتە نمونەی ( استقم ) .

[٦] استقم / واتە بەردەوام و دامەزراو بە .

[٧] ووشەی (المُصنّف) اسمی فاعلە وبەمانای دانەر دێت و لێرەدا مەبەستمان پێی دانەری (الفیە)یە.

[٨] ووشەی ( الجنس ) زاراوەیەكی زانستی (المنطق)ەو مەبەست پێی گشتگیرە و چەند جۆرە شتێك لە خۆ دەگرێت .

پەیوەندی نەبێت بە کاتەوە ئەوە ناو (اسم)ـە ، وە ئەگەر پەیوەندی هەبێت بە کاتەوە ئەوە کردار (فعل)ـە ، بەڵام ئەگەر کلمە ماناکەی لە خودی خۆی دا نەبوو بە ڵکو لە غەیری خۆی دا بوو ئەوە حەرفە[١] .

هەروەها کلم / ئەوەیە کە پێکهاتبێت لە سێ ووشەو زیاتر وەکو ( ان قام زید ) مانای هەبێت یان نا.

وە کلمە / بریتیە لە وێژە (لفظ)ـیەکی دانراو بۆ واتایەکی تاك . جا کە دەڵێین دانراو بۆ واتایەك ( الموضوع لمعنیً ) دەردەکات ووشەی بێ مانا وەکو (دَیْز) ، وە کە دەڵێین تاك ( مفرد ) دەردەکات کلام ، چونکە کلام دانراوە بۆ مانایەك کە مفرد نیە و لێکدراوە (مرکب) .

پاشان دانەر – ابن مالك – رەحمەتی خوای لێ بێت باسی ئەوەی کرد کە (قول) دەگرێتە خۆی و بەکار دێت بۆ هەمووی واتە ( قول ) بە کاردێت بۆ کلام و کلمە و کلم ، وە دەکرێت بە هەریەك لەم سیانە بووترێت (قول) ، وە هەندێ لە زانایان ووتویانە ئەصل وایە قول تەنها بە کاربێت بۆ تاك واتە مفرد .

دواتر دانەر باسی ئەوەی کرد کلمە هەندێ جار بەکاردێت و مەبەست پێی کلامە وەکو ئەوەی بە ( لا اله الا الله ) دەوترێت کلمەی اخلاص واتە خوا مەبەست بوون .

جا هەندێ جار کلام و کلم پێکەوە کۆدەبنەوە وە هەندێ جاریش لێك جیادەبنەوە . نمونەی پێکەوەبوونیان و کۆ بوونەوەیان وەکو (قد قام زید)[٢] ئەم ڕستەیە (کلام)ـە چونکە مانایەکی تەواو و جوانی هەیە ، هەروەها (کلم)ـە چونکە پێکهاتوە لە سێ ووشە .

---

[١] حرف – لە خودی خۆیدا مانای نیە تاوەکو نە خرێتە ڕستەوە ، بۆ نمونە حەرفی (مِن) چەند مانایەکی هەیە و بە پێی ڕستەکە مانای دەست نیشان دەکرێت .

[٢] ئەم ڕستە بەم شێوەیە اعراب دەکرێت

نموونەی ڕستەیەك :

کلم بێت و کلام نەبێت ( إنْ قام زید ) (کلم)ـە چونکە سێ ووشەیە بەڵام (کلام) نیە چونکە ماناکەی تەواو نیە و نەبووە ، نموونەی جیابوونەوەی کلام لە کلم ( زید قائم ) ئەمە دوو ووشەیەو مانای تەواوی هەیە بۆیە کلامە و کلم نیە .

## نیشانەکانی ناو ( علامات الاسم )

ابن مالك دەفەرموێت :

١٠- بالجر والتنوین و الندا وأل ومسند للاسم تمییز حصل .[1]

دانەر لەم دێرەدا باسی نیشانەکانی ناو دەکات ، کە بریتین لە :

١- الجر[2] / ئەمیش لە خۆ دەگرێت مجرور بوون بە هۆی حرف و مجرور بوون بە هۆی اضافە و مجرور بوون بە هۆی تبعیە . وەکو ( مررت بغلامِ زیدٍ الفاضلِ )[3] لەم ڕستەیەدا غلام مجرورە بە هۆی حرف و زید مجرور بە هۆی

---

- قد / حرف تحقیق مبنی علی السكون .

قام / فعل ماضی مبنی علی الفتح .

زید / فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة .

[1] مانای ئەم دێرەی الفیە بە کورتی :- بە هۆی مجروربوون و تەنوین و بانگ کردن (النداء ) والف و لام و پاڵدانی شتێك بۆ لای ناو ( الاسناد ) جیابوونەوە پەیدا دەبێت بۆ اسم.

[2] ووشەی ( الجر ) / زاراوەیەکی زانستی (النحو)ـەو مەبەست پێی ئەو ناوانەیە کە حاڵەتی إعرابیان مجرورە ، وە سێ جۆر مجروربوون هەیە لە زمانی عەرەبیدا کە بریتین لە : مجرور بە حرفی جر ، مجرور بە هۆی اضافە ، وە مجرور بە هۆی تبعیەوە.

[3] اعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە :

مرر : فعل ماضی مبنی علی السكون لاتصاله بضمیر رفع متحرك

اضافە وە ووشەی (فاضل) یش مجرورە بە هۆی تبعیە . جا ووتەی ابن مالك کە فەرمووی ( بالجر ) گشتگیرترە لە ووتەی غەیری خۆی کەووتوویانە ( بحرف الجر ) چونکە ئەم ووتەیە لە خۆ ناگرێت مجرور بوون بە اضافە و مجرور بوون بە تبعیە .

٢- التنوين[١] / ئەمیش چوار جۆرە : أ / تنوینی تمکین / ئەوەیە کە دەلکێت بە اسمی (معرب)ەوە[٢] .وەکو : زيدٌ و رجلٌ ، تەنها جمعی مؤنثی سالم[٣] نەبێت وەکو ( مسلماتٍ ) وە تەنها ووشەی ( جوارٍ و غواش )[٤] نەبێت کە دواتر باسیان دەکەین .

ب / تنوینی تنکیر[٥] : -ئەمەش دەلکێت بە ناوی مبنیەوە بۆ جیاکردنەوەی ناسراو لە نەناسراو ، وەکو ( مررت بسيبويهِ و بسيبويهٍ آخر )[٦]

---

تُ : ضمير متصل مبني على الضم في محل رفع فاعل

بغلام : / ب :- حرف جر . غلام :- اسم مجرور وعلامة جره الكسر الظاهرة وهو مضاف

زيدٍ :- مضاف اليه مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة

الفاضل / صفة مجرور و علامة جره الكسرة الظاهرة .

[١] ووشەی تنوین :- بریتیە لە پیتی نون لە خوێندنەوەدا بەڵام لە نوسیندا جیاوازە لە نون بە دوو فەتحە یان دوو ضمة یان دوو کسرة دەنوسرێت .

[٢] ناوی معرب / بەو ناوانە دەوترێت کە حاڵەتی کۆتاییان دەگۆرێت و جێگیر نین پێچەوانەکەی ( مبنی ) ە ، لە بەشەکانی داهاتوودا باسیان دەکەین انشاء الله تعالى .

[٣] واتە / جمعی مؤنثی سالم هەرچەندە ناوێکی معربە بەڵام تنوینەکەی تمکین نیە بەڵکو تنوینی مقابلە یە وەکو لە مەودوا باسیان دەکەین .

[٤] ووشەی جوار / کۆ (جمع )ی جاری یە و اسمێکە کۆتاییەکەی یایەکی ئەصلیە ، ووشەی جوار ئەصلەکەی ( جواريٌ ) یایەکەی حذف بووە و تنوینێك لە جێی دانراوە. ووشەی غواش بە هەمان شێوەیە ، جاری واتا پۆیندە ، وە غاش واتا داپۆشەر، وە ئەم دوو ناوە تەنوینەکەیان تمکین نیە.

[٥] واتە هەر ناوێك ئەم تەنوینەی پێوە بوو ئەوا ناوێکی نەناسراوە ( نکرە ) بۆیە پێی دەلێن تنوینی تنکیر.

ج / تنوینی مقابله[1]:- ئەمەش دەلکێت بە جمعی مؤنثی سالم و وەکو (مسلمات) ئەم تنوینە لە بەرامبەر نونی جمعی مذکر سالم دایە و وەکو (مسلمین) .

د / تنوینی عوض[2] : - ئەمیش دەبێتە سێ جۆر :

١- عوض عن الجملة : واتە لە بری ڕستەیەك تنوینێك دادەنێین ئەم جۆرە دەلکێت بە ووشەی ( إذْ ) وە لە بری ئەو ڕستەیەیە کە لە دوایەوە هاتووە ، وەکو فەرموودەی خوای گەورە ﴿وانتم حينئذٍ تنظرون[3]﴾ واتە / کاتێك ڕۆح دەگاتە گەروو ، ڕستەی ( بلغت الروح الحلقوم ) حذف کراوە و لە بریدا تەنوینێك هاتووە .

---

[1] اعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە :/ مررت / فعل و فاعله . بسيبويه / جار و مجرور . و / حرف عطف /بسيبويهٍ/ جارو مجرور . /اخر / صفة مجرور علامة جره الفتحة بدل الكسرة لانه ممنوع من الصرف .

[1] مقابلة / واتە بەرامبەر ، ڕووبەڕوو .

[2] عوض / واتە بری یان جیاتی ( بدل ) .

[3] ئایەتی (٨٤) سورەتی الواقعه . مانای ئایەتەکە بە کورتی( ئێوە لەو کاتەدا – کاتێك ڕووح دەگاتە گەروو – تەماشا دەکەن ) ، اعرابی تەواوی ئەم ئایەت پیرۆزە بەم شێوەیە :-

وانتم / و:حسب ماقبله انتم : ضمير منفصل مبنى على الضم فى محل رفع مبتدا .

م : علامة الجمع

حينئذ : حين : ظرف مبنى على الفتح فى محل نصب مفعول فيه . وهو مضاف الى ظرف اخر وهو /اذْ/ ظرف مبنى على السكون فى محل جر مضاف اليه . تنوينه عوض عن الجملة

تنظرون / فعل مضارع مرفوع و علامة رفعه ثبوت النون لانه من الافعال الخمسة . واو الجماعة / ضمير متصل مبنى على السكون فى محل رفع فاعل .والجملة الفعلية (تنظرون ) فى محل رفع خبر مبتدأ ( انتم ).

*الشاه في هذه الأية :- قوله (حينئذٍ) فإن تنوينه عوض عن الجملة المحذوفة.

٢- عوض عن الاسم : واتە تەنوینێك لە بری ناوێك دێت ، ئەم جۆرەش دەلكێت بە ووشەی (كل)ەوە لە بری ئەو ناوەی كە (كل) بۆ لای اضافە كراوە ، وەكو ( كلٌ قائمٌ ) واتە ( كلُ انسانٍ قائمٌ ) هەموو مرۆڤێك بە پێوەیە.
لێرەدا ووشەی ( انسان ) حذف كراوەو لە بری دا تنوینێك هاتووە .
٣- عوض عن الحرف : تنوینێك لە بری حرفێك ئەمیش تایبەتە بە ووشەی ( جوارٍ و غواشٍ ) و هاو وێنەكانیان[1] .
ه / تنوینی ترنُم[2] :- ئەم تنوینەش تایبەتە بە حەرفی كۆتایی ئەو شیعرانەی كۆتاییەكەی حەرفی علەیە و پێی دەڵێن ( القوافی المطلقە ) وەكو ووتەی شاعیر :-
ش١ / أقلّی اللوم – عاذل – والعتابن كەمێك ین خرێت وقولی – أن اصبت – لقد أصابن[3] .

---

[1] واتە / هەر ناوێك كۆتایەكەی یایی ئە صلی بێت كە پێی دەوترێت (المنقوص) و جمع كرا بیت بە جمع تكسیر .
وەكو ( هولاء جوارٍ ، و مررت بجوارٍ ) پیتی یای كۆتایی جوار حذف كراوەو لەبری دا تنوینێك دانراوە كە پێی دەڵێن تنوینی عوض.

[2] ووشەی ( الترنم ) مصدەرە بە مانای گۆرانی ووتن و ئاواز و شیعر خوێندن دێت بە دەنگەوە .

[3] ئەم دێرە شیعرانە ابن عقیل دەیان هێنێتەوە بە بەڵگە ( الشاهد ) لەسەر ئەو یاسایانەی باسیان دەكات بۆیە پێویستە خوێندكار گرنگی تایبەت بدات بەم دێرە شیعرانە لە ڕووی مانا و اعراب و بەڵگەكەیان جا هەموو ئەم شاهیدە شیعریانە لە كتێبدا اعراب كراون بۆیە ئیمە لێرەدا اعرابیان ناكەین ، بەڵام مانایان دەكەین لەگەڵ دیاریكردنی بەڵگەكەیان لەسەر یاساكان .مانای ئەم یەكەم شاهیدە بەكورتی : كەمكەرەوە و وازبێنە لە لۆمەكردن – ئەی لۆمەكار – و ڕەخنەگر چونكە من بەم لۆمەكردنەی تۆ دەست لە كارەكانم هەڵناگرم ،وە هەمیشە بڵێ- ئەگەر پێكام –

لێرەدا له کۆتایی شیعرەکه ووشەی ( العتابن و اصابن )ە ، تنوینێکی هێناوه له بری حەرفی ألف لەبەر ئاواز و نەغمەی شیعرەکه ، واته له ئەصلدا ( العتابا ، و أصابا ) بووه .

هەروەها هەروەکو ووتەی شاعیر که دەڵێت :

ش٢ / أزف الترحل غير انّ ركابنا لما تُزل برحالنا وكأن قَدِن[1] .

و / تنوینی غالی[2] / ئەم جۆرەش زانای پایەدار (ئەخفەش) باسی کردووه و جێگیری کردووه ، ئەم تنوینه دەلکێت به حەرفی کۆتایی ئەو شیعرانەی که حەرفی عله نین وەکو ووتەی شاعیر :-

ش٣ / وقاتم الأعماق خاوى المخترقن[3] .

---

بێگومان کارەکانت تەواو ڕاسته . بەڵگەکەی ( الشاهد فيه ) لێرەدا شاعیر تنوینی ترنمی کردۆته سەر هەردوو ووشەی ( العتابن ، أصابن ) که کۆتایی هەردووکیان حەرفی علەیه ( ألف )ە

(1) ئەم دێره شیعره بەکورتی واته : نزیك بۆتەوه بارکردن و ڕۆیشتن بەلاّم هێشتا کاروانی ئێمه شوێنی خۆشەویستی به جێ نەهێشتووەو نەڕۆیشتووین ، بەلاّم وا نزیکه .

بەڵگه ( الشاهدفيه ) :- دوو بەڵگەی تێدایه :

أ - تنوین چۆته سەر حرف که ( قد)ە ، که تنوینی ترنمه ، ئەمەش بەڵگەیه لەسەر ئەوەی تنوینی ترنم تايبەت نيه به ناوەوه .

ب- دواتر دەخوێندرێت .

(2) ووشەی الغالی :- له غلوەوه هاتووه به مانای زیاد دێت ، بۆیه پێی وتراوه زیاده چونکه له وەزنی شیعرەکه زیاتره ، وه دەڵێن بەمانای کەمیش دێت .

(3) واتای ئەم شیعره بەکورتی :- زۆر شوێنی بیابانی دوور و نارەحەت که زۆر کەس ناتوانێت پێیدا بڕوات من به ووشترەکەمەوه بڕیومەو پێیدا ڕۆیشتووم .

بەڵگەی ئەم شیعره :- ووشەی ( المخترقن ) و ( الخفقن ) تنوینی کردۆته سەر لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان ألف و لامیان پێوەیه .

جا بە پێی قسەی ئاشکرای دانەر تنوین بە هەموو جۆرەکانییەوە تایبەتە بە ناوەوە ، بەڵام وا نییە بەڵکو ئەوەی تایبەتە بە (اسم)ـەوە تەنها تنوینی (تمکین و تنکیر و مقابلە و عوض)[1]ـە ، بەڵام تنوینی ترنم و غالی دەکرێت بلکێن بە اسم و فعل و بە حرفیش[2] .

٣- یەکێکی تر لە تایبەتمەندی و نیشانەکانی اسم بریتیە لە بانگکردن (النداء) وەکو ( یا زیدُ )[3] .

٤- چوارەم نیشانەی اسم بریتیە لە الف ولام وەکو ( الرجل )[4] .

٥- پاڵدانی شتێك بۆ لای ناو ، وەکو : ( زیدٌ قائمٌ )[5] .

کەواتە مانای ئەو دێرەی ڕابردوو بە کورتی :- پەیدا دەبێت بۆ ناو جیابوونەوە لە فعل و حرف بە هۆی مجروربوون و تنوین و بانگکردن (النداء) و الف ولام و پاڵدانی شتێك بۆ لای ناو واتە هەواڵ دان لێی (الإخبار عنه ) .

جا دانەر بە کاری هێنا ووشەی ( ال ) لە جێی الف ولام ، ئەم بەکارهێنانە ئەنجام دراوە لەلایەن هەندێ لە زانایانی پێشین - ئەویش زانای ناودار

---

[1] پێشتر باس و مانای هەر شەش جۆرەکەی تنوینمان کرد .

[2] بێگومان تنوینی ترنم و غالی لە ڕاستیدا تنوینی حەقیقی نین بەڵکو مجازین ، بۆیە دەبێت قسەی ابن مالك و زانایانی تریش تەواوبن و ڕەخنەیان نەیەتە سەر کە فەرموویانە تنوین تایبەتە بە اسمەوە .

[3] ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە إعراب دەکرێت :-

یا / حرف ندا مبنی علی السکون لا محل لها من الإعراب .

زید / منادی مبنی علی الضم فی محل النصب .

[4] واتە هەر ووشەیەك ئەلف و لامی پێوە بوو لە سەرەتاوە ئەوە اسمە ، دواتریش لە وانەکانی داهاتوودا باسی جۆرەکانی الف و لام دەکەین انشاء الله .

[5] مەبەست لە پاڵدان واتە خەبر و هەواڵدان لە ناوێك چ بە ڕستەی اسمی بێت واتە خبر وەکو ( محمد ناجح ) یان بە فعل بێت وەکو ( نجح محمد ) .

خەلیلی کوری ئەحمەدی فەراهیدیە ، هەروەها دانەر بە کاری هێنا وشەی ( مسند ) لە جێی ( الإسناد ) .

## نیشانەکانی کردار ( علامات الفعل )

١١- بتا فعلتَ وأتتْ ، وبا إفعلي ونونِ أقبلنّ فعلٌ يَنجلي[١] .

پاشان دانەر باسی ئەوە دەکات کە فعل جیادەبێتەوە لە اسم و حرف بە :-

١- تای ( فعلت ) مەبەست تای فاعلە کە بۆر ( ضمة )ی هەیە بۆ کەسی یەکەمی تاك ( المتكلم ) وەکو : (فعلتُ) وە سەر ( فتحه )ی هەیە بۆ کەسی دووەمی تاکی نێر ( المخاطب[٢] ) وەکو ( تباركْتَ ) ، وە ژێر ( کسره )ی هەیە بۆ کەسی دووەمی تاکی مێ (المخاطبة ) وەکو ( فعلتِ ) .

٢- نیشانەی دووەمی فعل بریتیە لە تائی ( أَتَتْ ) مەبەست پێی تائی تأنیثی ساکنەیە وەکو (نِعْمتْ ) و (بِئستْ )[٣] ، جا خۆمان پاراست بە وشەی ( الساكنه ) لەو تائەی کە دەلکێت بە ناوەوە چونکە تائی ناو بزواو ( متحرك )ـە بە حەرەکەی إعرابی[٤] ، وەکو (هذه مسلمةٌ ) ، ورأيت مسلمةً ، ومررت بمسلمةٍ) . هەروەها خۆمان پاراست لەو تاکەی کە دەلکێت بە حەرفەوە وەکو ( لاتَ ، رُبَّتَ و ثُمَّتَ ) وە ساکن بوونی ئەم تائی حەرفە لەگەل هەردوو حەرفی ( رُبَّ و ثُمَّ ) کەمە وەکو ( رُبَّتْ ، ثُمَّتْ ) .

---

[١] مانای ئەم دێرەی ئەلفیە بەکورتی : بە هۆی تای فاعل و تائی تأنیثي ساکنە و یای مخاطبە و نونی توکیدەوە ، فعل دەردەکەوێت و جیا دەبێتەوە لە اسم و حرف .

[٢] وشەی (المخاطب ) واتە دوێندراو قسە لەگەڵ کراو بەلآم لە رێزماندا واتە کەسی دووەمی تاك .

[٣] ( نعمت و بئست ) و هاوێنەکانی بەم شێوە اعراب دەکرێن :-

نعم :_ فعل ماضي مبني على الفتح .

ت :_ تاء التانيث الساكنه لا محل لها الاعراب .

[٤] واتە تائی لکاو بە اسمەوە متحرکە و حەرەکەکەی بە پێی شوێن لە ڕستەکەدا دەگۆرێت ، هەروەها تائی اسم بەخڕی دەنوسرێت وەکو بزوێنی کوردی .

٣- هەروەها جیادەبێتەوە فعل بە یائی ( افعلی ) مەبەست پێی یائی (فاعله)[١] وە دەلکێت بە فعلی ئەمرەوە ، وەکو (اضربي)[٢] وە بە فعلی مضارعەوە وەکو ( تَضْربِينَ ) بەلاّم ئەم یایە نالکێت بە فعلی (ماضي)ەوە .

جا دانەر فەرمووی ( یا افعلی ) وە نەیفەرموو ( یاء الضمیر ) چونکە یائی ضمیر متکلمیش دەگرێتەوە ، وە یائی متکلمیش تایبەت نیە بە فعلەوە ، بە ڵکو لە فعلدا هەیە وەکو ( أَكْرَمَنِی )[٣] ، لە اسمیشدا هەیە وەکو ( غُلامِی ) ، وە لە حەرفیشدا هەیە وەکو ( إنّی ) بە پێچەوانەی یائی ( افعلي ) کە مەبەست پێی یائی فاعله و تایبەتە بە (فعل)ەوە .

٤- یەکێکی تر لەو نیشانانەی کە فعل جیادەکاتەوە نونی ( أقبلنّ )یە و مەبەست پێی نونی توکیدە : جا سووك ( خفیفه ) بێت یان قورس(ثقیلة)[٤] بێت، جا سووکەکە وەکو فەرموودەی خوای گەورە ( لنسفعاً بالناصية)[٥] ،

---

[١] واتە / ئەم یایە بۆ مێینەیەکی دووێندراو ( المؤنث المخاطبة ) دەبێت .

[٢] اضربی و هاوشێوەکانی بەم شێوە اعراب دەکرێن :-

اضرب :- فعل امر مبنی علی حذف النون لانه من الافعال الخمسة

ی :- ضمیر متصل مبنی علی السکون فی محل رفع فاعل

[٣] (اکرمنی ) و هاوشێوەکانی بەم شێوە اعراب دەکرێن :-

اکرم :- فعل ماضی مبنی علی الفتح لامحل لها من الاعراب .

ن :- نون الوقایه .

ی :- ضمیر متصل مبنی علی السکون فی محل نصب مفعول به مقدم .

[٤] مەبەست ئەوەیە نونی نوکید دوو جۆرە :- یەکێکیان دووبارە (شدە) دارە فتحەی هەیە ( نَّ ) پێی دەوترێت قورس (ثقیله ) لەبەر ئەوەی لە خوێندنەوەدا قورسە . ئەوی تریشیان سادەیەو ساکنە و پێی دەوترێت سووك ( خفیفه ) واتە لەکاتی دەربڕین و خوێنەوەدا سووکە .

[٥] ئایەتی (١٥) ی سورەتی العلق ماناى ئايەتەكە (بێگومان ڕایدەکێشین بە پێشە سەری "قژ")

وە نونی توكيدی قورسيش وەكو فەرموودەی خوای گەورە ( لَنُخرِجَنَّكَ ياشُعَيْبُ)[1] .

كەواتە ئەو دێرەی ئەلفيە كە باسكرا ئەوەيە : جيادەبێتەوە و ئاشكرا دەبێت فعل بە تائی فاعل ، تائی تأنيثي ساكنە، و يائی فاعل و نونی توكيد.

* باسی حرف و نيشانەكانی

١٢ سواهما الحرفُ كَهَلْ وفي ولم     فعلٌ مضارع يلی لم كَيَشَمّ

١٣ وماضی الافعال بالتا مِزْ ، وسم     بالنون فعلَ الامر إنْ امر فُهم[2]

---

-اعرابی تەواوی ئايەتەكە بەم شێوەيەيە :-

لنسفعاً :- لـ :- حرف قسم مبنی علی الفتح . نسفعاً :- فعل مضارع مبنی علی الفتح لاتصاله بنون التوكيد الخفيفة المكتوبة بالألف وفاعله ضمير مستتر تقديره "نحن" .

بالناصية :- جار ومجرور متعلقان بـ( نسفعاً ) .

[1] ئايەتی (٨٨) ی سورەتی ( الأعراف ) كورتەی ماناكەی ( بێ باوەڕانی گەلی شوعەيب – ووتيان – ئەی شوعەيب – بێگومان دەرت دەكەين ) .

إعرابی تەواوی ئەم ئايەتە بەم شێوەيەيە :-

لـ :- حرف قسم مبنی علی الفتح     نخرجنك :- فعل مضارع مبنی علی الفتح لاتصاله بنون التوكيد الثقيلة .

ن :- حرف توكيد لامحل لها من اعراب ، والفاعل ضمير مسستر تقديره "نحن" .

ك:- ضمير متصل مبنی علی الفتح فی محل النصب مفعول به .

يا :- حرف نداء مبنی علی السكون .     شعيبُ :- منادی مبنی علی الضم فی محل النصب .

[2] مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفيە بەكورتی : ١٢- غەيری اسم و فعل حەرفە وەكو هل وفی لم ، نيشانەی فعلی مضارعيش ئەوەيە لە دوای (لم)ەوە دێت وەكو لم يشم . ١٣- فعل ماضی بە تا جياكەرەوە ، وە نيشانەدار بكە فعلی امر بە نونی توكيد ئەگەر مانای ئەمری لێفامرايەوە . واتە فعلی امر نونی توكيد وەردەگرێت و مانای ئەمريشی تێدايە .

دانەر ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە حرف جودا دەبێتەوە لە اسم و فعل بە خالی بوونی لە نیشانەکانی اسم و نیشانەکانی فعل ، پاشان نموونەی هێنایەوە بە سێ حەرف ( هل ، وفی ، ولم ) بۆ ئەوەی ئاگادارمان کاتەوە لەوەی کە حەرف دابەش دەبێت بۆ دوو بەش : تایبەت و ، نا تایبەت[١] ، جا ئاماژەی کرد بە ( هل ) بۆ حەرفی نا تایبەت کە دەچێتە سەر اسم و فعلیش وەکو ( هل زیدٌ قائمٌ ) و ( هل قام زَیْدٌ ) .

هەروەها ئاماژەی کرد بە (فی و لم) بۆ حەرفی تایبەت ، ئەویش دوو جۆرە:- تایبەت بە ناو وەکو حەرفی (فی) نموونەی (زیدٌ فی الدار)[٢] ، وە تایبەت بە فعلەو وەکو حەرفی (لم) کە تایبەتە بە چوونە سەر فعلی مضارع نموونەی (لم یَقُمْ زَیْدٌ)[٣] .

---

[١] مەبەست لە حەرفی تایبەت ئەوەیە : کە تایبەتە بە جملەی اسمی یان جملەی فعلی وە مەبەست لە حەرفی ناتایبەت ئەوەیە کە دەکرێت بچێتە سەر جملەی اسمی و دەکرێت بچێتە سەر جملەی فعلیش .

[٢] اعرابی تەواوی ئەم رستەیە بەم شێوەیە :

زید :- مبتدا مرفوع وعلامه رفعه الضمة الظاهرة

فی الدار :- جار و مجرور متعلق بمحذوف هو خبر ، جا دەتوانین بڵێین جار و مجرور کە پێی دەوترێت (شبه جمله) خۆی لە محلی رفعی خبردایە ، وە دەتوانین بڵێین ئەم جارو مجرورە متعلقە بە حذف کراوێك ئەو حذف کراوە خبرە ، دواتر بە ڕوونی باسی دەکەین ، إنشاء الله.

[٣] اعرابی تەواوی ئەم رستەیە بەم شێوەیە :-

لم :- حرف نفی وجزم و قلب مبنی علی السکون ، هەموو کاتێ لم بەم شێوەیە اعراب دەکرێت !

یقم :- فعل مضارع مجزوم بـ(لم) وعلامة جزمه السکون .

زید :- فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة .

دواتر دانەر دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە فعل دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر : ڕابردوو (ماضی ) ڕانەبردوو ( مضارع ) و داخوازی (امر ) ، جا نیشانەی فعلی مضارعی بەوە داناوە کە حەرفی (لم) دەچێتە سەری وەکو فعلی ( یشم )[١] وە دەڵێین ( لم یشم ) وە لە فعلی یضرب ( لم یضربْ ) بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد بە ووتەی (فعل مضارع یلي لم کیشم) .

دواتر ئاماژەی کرد بەوەی کە فعلی ماضی لە دوو فعلەکەی تر جیادەبێتەوە بە ووتەی (وماضيَ الافعال بالتا مِز)[٢] ، واتە : جیاکەرەوە فعلە ماضي یەکان بە (تاء) مەبەست پێی تائی فاعلە و تائی تانیثی ساکنەیە کە هەردووکیان تەنها دەچنە سەر فعلی ماضی[٣] وەکو ( تبارکتَ یاذا الجلال و الإکرام )[٤] ، وە وەکو :

( نعمتْ المرأةُ هندٌ )[٥] و ( بئست المرأةُ دعدٌ )[٦] .

---

[١] فعلی یشم :– بە مانای بۆن کردن دێت ئەگەر لە بابی یەکەمدا بێت ، وە بە مانای بەرزبوونەوە و خۆ بە گەورە زانین دێت ئەگەر لە بابی چوارەمدا بێت .

[٢] مز :– فعلی ئەمرە ، بە واتای جیاکەرەوە .

[٣] واتە :– هەر ووشەیەك تائی فاعلی پێوەبێت ، یان تائی تانیثی ساکنەی پێوەبێت ئەوە فعلی ماضییە .

[٤] اعرابی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە :–

تبارکْتَ :– فعل و فاعل (پێشتر باسمان کرد بە تفصیلی ) یا حرف ندا مبنی علی السکون .

ذا :– منادی منصوب وعلامة نصبه الالف لانه من الاسماء الخمسة وهو مضاف .

الجلال :– مضاف الیه مجرور علامة جره الکسرة الظاهرة .

والاکرام :– و/حرف عطف : الاکرام :– اسم معطوف مجرور .

[٥] اعرابی تەواوی ئەم رستەیە بەم شێوەیە :–

نعمت : نعم :– فعل ماضی مبنی علی الفتح ، تْ :–تاء التأنیث الساکنة لامحل لها من الاعراب .

المراة :– فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة . و الجملة الفعلیة (نعمت المراة ) فی محل رفع خبر مقدم .

هندٌ :– مبتدا مؤخر .

[٦] ئەم ڕستەیە هەمان اعرابی ڕستەی پێشووی هەیە ، وە ووشەی دَعْدٌ ناوی ئافرەتە .

پاشان له کۆتایی دێڕەکەدا باسی نیشانەکانی فعلی امری کرد کە بریتیە لە: وەرگرتنی نونی توکید و دەلالەت کردن لەسەر ئەمر بە خودی خۆی ، وەکو (اضربَنّ) و (اخرجَنّ)[١] .

جا ئەگەر ووشەیەك دەلالەتی کرد لەسەر ئەمرو نونی توکیدی وەرنەگرت ئەوە اسمی فعلە و ابن مالك ئاماژەی بۆ دەکات بە ووتەی :

١٤- و الأمرُ إنْ لم يكُنْ للنون محل      فيه هو أسْمٌ نحو صَهْ وحَيَّهَلْ[٢] .

لێرەدا ووشەی ( صه و حیهل ) ناون[٣] و فعل نین هەرچەندە مانای ئەمریان تێدایە چونکە نونی توکید وەر ناگرن ناتوانی بڵێی :- صهنّ و حیهلنّ ، هەرچەند صه بە مانای بێدەنگ بە (اسْكُتْ ) دێت و حیهل بە واتی وەرە (أقبِلْ ) دێت ، کەواتە جیاوازی نێوانیان بریتیە لە وەرگرتنی نونی توکید و وەرنەگرتنی ، لە فعلی ئەمردا دەڵێین ( اسكتَنّ ، اقبِلَنّ ) بەلاّم دروست نیە ئەمە لە ووشەی صه و حیهل .

لێرەدا کۆتایی بە بەشی ( الكلام و مايتألف منه ) هات و لەوانەی ئایندەدا بە پشتیوانی خوای گەورە دەچینە سەر ( المعرب و المبني ) .

---

[١] فعل امر مبنی علی الفتح .

[٢] واتای ئەم دێڕەی ئەلفیە بە کورتی :- ئەمر ئەگەر نونی توکیدی وەرنەگرت ئەوە فعل نیە بەڵکو اسمی فعلە ، وەکو صَهْ و حیهل ، کە مانای ئەمریان تێدایە بەلاّم نونی توکید وەرناگرن .

[٣] بەم ناوانە دەوترێت اسمی فعل کە بریتین لە چەند ووشەیەك دانراون لە جێی فعل لە مانادا وەکو فعل وان بەلاّم جیاوازیان لەگەڵ فعلدا لە چەند شتێکدایە لەوانە :-

أ – فعل عامل کاری تێدەکات وەکو ( لَنْ يكتبَ ) بەلاّم اسمی فعل عامل کاری تیّ ناکات .

ب– فعلی مضارع و امر نونی توکید وەردەگرن ، بەلاّم اسمی فعل نونی توکید وەرناگرێت .

ج– فعل جێناوی (ضمیر)ی پێوە دەلکێت وەکو ( اسكتي .اسكتا ، اسكتوا ) بەلاّم اسمی فعل جێناوی پێوە نالکێت .

د– فعل مفعولەکەی پێشی دەکەوێت وەکو ( محمداً الْزِمْ ) بەلاّم اسمی فعل مفعولەکەی پێشی ناکەوێت و ناوترێت (محمداً عليك) .

## المعرب و المبنی[1]

١٥- والاسم منْهُ معربٌ و مبنی لِشَبَهٍ من الحروف مُدْنِي[2] .

ئاماژه دهكات بهوهی كه ناو (اسم) دابهش دهبێت بۆ دوو جۆر[3] ، یهكێكیان معربه كه بریتیه لهو ناوانهی خالین له لێكچوون له حهرف[4] ، دووهمیان مبنیه ئهمیش بریتیه له و ناوانهی له حهرف دهچن ، ئهمهیه مهبهست له ووتهی ابن مالك ( لشبه من الحروف مدنی ) واته : له لێكچونێك كه نزیكی دهكاتهوه له حهرف ، كهواته هۆی

---

[1] زانایانی نحو دهستووریان وایه دوای باسكردنی كلام و باسی جۆرهكانی اسم و فعل دهكهن لهڕووی جێگیربوونیان و ناجێگیربوونیان ( المعرب و المبنی ) ووشهی (المعرب ) اسمی مفعوله و له اعراب هوه وهرگیراوه و مهبهست پێی له زاراوهی نحودا بهو ناو و فعلانه دهوترێت كه حاڵهتی كۆتاییان دهگۆڕێت به هۆی ئهو عاملانهی له پێشیانهوه دێت بۆ نموونه ( یكتبُ محمدٌ الدرسَ ) و (إنّ محمداً لنْ یكتبَ الدرسَ ) و ( سلمتُ علی محمدٍ ) دهبینین ووشهی محمد لهو سێ ڕستهیهدا جارێك مرفوعه چونكه فاعله و جارێكی تر منصوبه چونكه اسمی (إنّ)ـهیه و لهڕستهی سێیهمیشدا مجروره چونكه حهرفی جر (علی) له پێشی هاتووه ، دیاره ئهصل وایه ههموو ناوێك (معرب) بێت ، بهڵام ههندێ ناو لهم ئهصله دهردهچن و دهبنه مبنی ، وه به معرب دهوترێت (متمكن ) .

وه ووشهی ( المبنی ) له زاراوهی نحودا بهو ناوو فعل و حهرفانه دهوترێت كه حاڵهتی كۆتاییان جێگیره و ناگۆڕێت بۆیه به مبنی دهوترێت (غیر متمكن) واته دهست كاری ناكرێت جا ههموو حهرفێك (مبنی)یه ، وه ئهصل وایه فعلیش مبنی بێت بهڵام فعلی مضارع لهم ئهصله دهردهچێت ، دواتریش باسی دهكهین .

[2] مانای ئهم دێڕهی ئهلفیه به كورتی :- ناو ههندێكیان (معرب)ـن و ههندێكیشیان (مبنی)ـن ، ئهوانهی مبنین هۆی مبنی بوونیان لێكچوونێكه كه نزیكییان دهكاتهوه له حهرف ، چونكه حهرف ههموویان مبنین .

[3] دیاره به پێی معرب بوون و مبنی بوون ، دوو جۆره . ئهگهر نا ناو جۆر و دابهش بوونی زۆره .

[4] چونكه وهك ووتمان حهرف به ههموو جۆرهكانییهوه هیچ كاتێك معرب نین ، بۆیه له كاتی اعراب كردنی ڕستهدا دهڵێین حرف مبنی علی ...... لامحل لها من الاعراب .

مبنی بوونی ناو لای ابن مالك –ڕەحمەتی خوای لێبێت – تەنها بریتیە لە لێکچوونی حەرف، پاشان دانەر باسی جۆرەکانی ئەم لێکچوونە دەکات لە دوو دێڕی دوای ئەم دێڕە[1] ، ئەم بۆ چوونەی ابن مالك نزیکە لە بۆ چوونی ئەبو عەلی فارسی چونکە ئەویش هۆی مبنی بوونی کۆکردۆتەوە لە لێکچوون لە حەرف یان شتێك مانای حەرف لە خۆ بگرێت ، بێگومان پێشەوا سیبویەیش –ڕەحمەتی خوای لیّ بێت – بە دەق باسی ئەوەی کردووە هۆی مبنی بوونی اسم هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ لێکچوون لە حەرف ، یەکێکی تر لەو زانایانەی ئەم بۆچوونەی باسکردووە ( ابن ابي الربيع )ـە .

* جۆرەکانی لێکچوون ( أنواع الشَّبَه )

١٦– كالشَّبَهِ الوضعيّ في اسمي جئتنا والمعنويّ في متى و في هُنا

١٧– وكَـنـيـابَـةٍ عـن الفـعـل بـــلا تَأثُرٍ ، وكَافْتِقارٍ أُصِّلا [2]

لـەم دوو دێـڕەدا ابـن مالـك –ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت– باسـی جۆرەکـانی لێکچوونی ناو[3] لە حەرف دەکات کە چوارن :

---

[1] واتە لە دێڕی (١٦ و ١٧)ـی ئەلفیەدا .

[2] مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە : وەکو لێکچوونی دانان (وضع)ـی ئەو ناوانەی کە دانراون بە یەك حەرفی یان دوو حەرفی – واتە لە یەك یان دوو حەرف پێکدێت – وەکو هەردوو ناوی ڕستەی ( جئتَنا ) هەروەها وەك لێکچوون لە ڕووی ماناوە لە هەردوو ناوی متى و هنا ، وەکو لێکچوونی دانیشتنی ئەو ناوانەی لە جێگەی فعل دادەنیشن و عامل عملی تێناکات ، هەروەها وەك پێویست بوونی ئەصلی بۆ دوای خۆی بۆ تەواو کردنی ماناکەی.

[3] وەکو پێشتر باسمان کرد هەر ناوێك مبني بێت هۆی مبني بوونەکەی بریتیە لە لێکچوون لە حەرف چوونکە حەرف هەموویان مبنین . جا لێکچوونی ناو لە حەرف لە یەکێك لەم چوار ڕووەوە دەبێت کە باسیان دەکات .

یەکەم / لێکچوونی ناو لە حەرف لە ڕووی دانانەوە[١]، وەکو ئەوەی ئەو ناوەی کە دانراوەو بەکارهاتووە لە سەرەتاوە پێکهاتووە لە یەك حەرف وەکو تای ضربْتُ ، یان پێکهاتوە لە دوو حەرف وەکو وەکو (نا)ـی اکرمْنا بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد ابن مالك بە ووتەی ( في اسمي جئتَنَا[٢] (تا)ـی جئتَ : ناوە و بکەر ( فاعل)ـەو مبنیە چونکە لە حەرف دەچێت لە ڕووی پێکهاتەوە کە یەك حەرفە ، هەروەها (نا)ـی جئتنا اسمە چونکە مفعول بە و مبنیە لەبەرئەوەی پێکهاتووە لە دوو حەرف .

دووەم / لێکچوونی اسم لە حەرف لە ڕووی ماناوە[٣]، ئەویش دوو جۆرە : یەکەمیان لە حەرفێك دەچێت بوونی هەیەو دووەمیان لە حەرفێك دەچێت بوونی نیە[٤]، نموونەی یەکەم وەکو مانای (متی) ئەم ناوە مبنیە چونکە لە حەرف دەچێت لە ڕووی ماناوە، چونکە متی یان بەکاردێت بۆ پرسیارکردن (الاستفهام) وەکو ( متی تقوم ) [٥] یان بەکاردێت بۆ مەرج (الشرط) وەکو :

---

[١] مەبەست ئەوەیە هەندێ ناو هەیە کاتێك لە سەرەتاوە زمانی عەرەبی بەکاریان هێناوە و دایان ناوە بۆ مانایەك بە یەك حەرف یان دوو حەرف دانراوە ، ئەمەش تایبەتە بە جێناوەکان ( الضمائر ) کە هەموویان مبنین و پێکهاتەی حەرفەکانیان کەمە هەروەکو چۆن حەرفیش هەموویان پێکهاتەیان لە ڕووی ژمارەی پیتەوە کەمە مەگەر چەند حەرفێك نەبێت .

[٢] جئتنا ڕستەیەکی تەواوە و لە فعلێکی ماضي و فاعلێك جێناوی ( تَ ) و مفعولێك کە جێناوی ( نا ) یە پێکهاتووە و مانای رستەکەش ( تۆ هاتی بۆ لامان ).

[٣] مەبەست ئەوەیە هەندێ ناومان هەیە مانای حەرف لە خۆ دەگرێت وەکو باسیان دەکات بۆیە مبنین.

[٤] دیارە لە زمانی عەرەبیدا بۆ هەر مانایەك لە ماناکان زۆربەیان حەرفێکی بۆ دانراوە وەکو ئەوەی بۆ پرسیار همزە وهل دانراوە یان بۆ نەفی کردن (ما)دانراوە و بۆ نەهی (لا) دانراوە،بەلاّم هەندێ مانا حەرفی بۆ دانەنراوە وەکو (اشارة) کردن بۆیە دەڵێین إشارە لە حەرفێکی مقدر دەچێت .

[٥] ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە إعراب دەکرێت : متی تقوم ؟ متی : اسم استفهام مبني علی السکون في محل رفع مبتدا / تقومُ : فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة و فاعله ضمیر مستتر تقدیر أنت،والجملة الفعلیة في محل رفع خبر المبتدا.

(متی تَقُمْ اقُم )[١] لە هەردوو حاڵەتەکە لە حەرفێك دەچێت کە بوونی هەیە چونکە لە کاتی پرسیاردا لە همزە دەچێت وە لە کاتی مەرجدا لە حەرفی إنْ دەچێت[٢] .

نمونەی دووەم ناوی ( هُنا ) ئەم ناوەش مبنیە چونکە لە حەرفێك دەچێت کە دەبوو بوونی هەبوایە و دانرایە بەڵام دانەنراوە ، لەبەر ئەوەی ئاماژەکردنیش ( الاشارة ) مانایەکە لە ماناکان و حەقی خۆی بوو حەرفێکی بۆ دانرایە هەروەکو چۆن دایان ناوە بۆ نەفی حەرفی (ما) و بۆ نەهی حەرفی ( لا ) و بۆ ئاواتە خواستن ( التمني ) حەرفی (لَیْتَ) بۆ ئومێد بوون ( الترجي ) حەرفی ( لَعَلَّ ) وە وێنەی ئەمانەش، جا ئەسمای ئیشارە مبنین چونکە لە ڕووی ماناوە لە حەرفێك دەچن کە ( مقدرة ) .

سێهەم / لێکچوونی ناو لە حەرف لە ڕووی دانیشتن لە جێی فعل و عمل نەکردنی عامل[٣] تێیدا ، ئەمەش وەکو أسماء الافعال، نمونە

---

[١] ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە إعراب دەکرێت: متی/اسم شرط مبني على السكون في محل رفع مبتدا . تقمْ / فعل مضارع مجزوم ب(متی) وعلامة جزمه السكون و فاعله ضمير مستتر تقديره (انت). وجملة ( الشرط الفعل و الفاعل ) في محل رفع خبر . اقمْ / فعل المضارع مجزوم ب(متی) و علامة جزمه السكون وهو جواب الشرط ، وفاعله ضمير مستتر تقديره ( انا ).

[٢] واتە متی ئەگەر بۆ پرسیارکردن ( استفهام ) بێت هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ (همزە)دا نیە لە ڕووی ماناوە هەروەها ئەگەر بۆ مەرجیش بێت جیاوازی نیە لەگەڵ حەرفی ( إن )ی شرطیە بۆیە مبنیە.

[٣] لە زمانی عەرەبیدا ئەم سێ زاراوەیەمان هەیە کە زۆر بەکار دێت ( عامل ، معمول ، عمل ) عامل واتە ئەو ووشەیەی کاریگەری دروست دەکات لە ووشەکەی دوای خۆی

( دراكِ زیداً ) [١] دراكِ مبنیه چونكه له حه‌رف ده‌چێت له‌و ڕووه‌وه عمل ده‌كات و عملی تێناكرێت [٢].

جا ابن مالك خۆی پاراست به ووشه‌ی[٣] ( ضرباً زیداً )[٤] لێره‌دا ضرباً له جێی (اضربْ)ه به‌لاّم مبنی نیه چونكه (ضرباً) عامل عملی تێكردووه كه بریتیه له فعلێكی محذوف، به پێچه‌وانه‌ی ( دراكِ ) هه‌ر چه‌نده له جێی (أدركِ) كه به‌لاّم عامل عملی تیْ نه‌كردوه.

پوخته‌ی ئه‌وه‌ی ابن مالك باسی كردوه و مه‌به‌ستێتی ئه‌وه‌یه كه ( مصدر ) و ( اسم الفعل ) هه‌ردووكیان هاوبه‌شن له دانیشتنیان له جێی فعل ، به‌لاّم مصدر عامل عملی تێدا كردوه بۆیه معربه و مبنی نیه چونكه له حه‌رف ناچێت به‌لاّم اسمی فعل عامل ناتوانێت عملی تێدا بكات بۆیه مبنیه

---

له ڕووی لفظ و ماناوه ، ئه‌و كاریگه‌رییه ده‌بێته ( عمل ) ه‌كه‌،وه ئه‌و ناوه‌ی كاریگه‌ری تێدا كراوه ده‌بێته معمول ، بۆ نمونه كه ده‌ڵێین ( قام محمدُ) قامَ _ عامله و ( محمد ) معموله ضمه‌ی كۆتایی سه‌ر حه‌رفی دالی محمد بریتیه له عمه‌له‌كه . هه‌روه‌ها بۆ هه‌موو ڕسته‌یه‌كی دیكه‌ش.

[١] ئه‌م ڕسته‌یه به‌م شێوه‌یه إعراب ده‌كرێت : دراكِ/ اسم فعل امر مبني على الكسر لا محل لها من الأعراب . وفاعله ضمير مستتر تقديره ( انت ) . زيداً / مفعول به .

[٢] بۆ نمونه حروفی جر هه‌موویان عمل ده‌كه‌ن و عملیشیان تیْ ناكرێت وه‌كو ( سلمت على محمدٍ) لێره‌دا ( على ) عملی كردوه‌و ناوه‌كه‌ی دوای خۆی مجرور كردوه،به‌لاّم شتێك نیه عمل له (على) بكات .

[٣] خۆی پاراست به ووشه‌ی ( بلا تأثر ) له‌و شته‌ی له جێی فعل داده‌نیشن و عامل عملیان تێده‌كات وه‌كو (( ضرباً زيداً ))

[٤] ئه‌م ڕسته‌یه به‌م شێوه‌یه إعراب ده‌كرێت : ضرباً / مفعول مطلق لفعل محذوف وجوباً تقديره ( اضرب ضرباً ).وفاعله ضمير مستتر فيه – وجوباً تقديره ( انت ). زيداً/ مفعول به منصوب.

چونکە لە حەرف دەچێت لەو ڕووەوە لە جێی فعل دادەنیشن و عملیان تێدا ناکرێت[١] ، ئەمەی دانەر باسی کرد بینا لەسەر ئەو ڕایەی پێی وایە اسمی فعل هیچ محلێکی إعرابی نیە ئەم بابەتەش[٢] ڕای جیاوازی لەسەرەو لە بابی اسم الفعل دا باسی دەکەین، إنشاء الله تعالی .

چوارەم / لێکچوونی ناوە لە حەرف لە ڕووی پێویست بوونێکی بەردەوام بۆ دوای خۆی بۆ تەواو کردنی ماناکەی ، بۆ ئەمەش دانەر ئاماژەی کرد بە ووتەی (وكافتقارٍ أصلا ) ئەمەش وەکو ئەسمای موصولە[٣] ، نمونەی (الذي) بۆیە مبنیە چوونکە لە هەموو کاتێکدا پێویستی بە ڕستەکەی دوای خۆیەتی کە پێی دەوترێت (الصلة)[٤] بۆ تەواو کردنی ماناکەی بۆیە لە حەرف دەچێت لە ڕووی پێویست بوونی بەردەوامی بۆ شتێك کە ماناکەی تەواو بکات[٥] بۆیە مبنیە.

*پوختەی ئەو دوو دێڕەی ڕابورد ئەوەیە کە ناوی مبنی شەش جۆرە[٦] :

---

[١] هەروەکو چۆن حەرفی یای ندا-بۆ نمونە- لە جێی فعلی أنادي دادەنیشێت و معمولی هیچ عامیلێکیش نیە،واتە : کاتێك دەڵێن ( یا محمدُ ) ئەم حەرفی یایە لە جێی (أنادي)ە..

[٢] واتە بابەتی ئەوەی ئایە اسمی فعل لە ڕستەدا محلی إعرابی هەیە یان نا .

[٣] ووشەی ( موصول ) اسمی مفعولەو لە ووشەی ( وصل )ەوە وەرگیراوە کە بەمانای گەیاندن دێت ،جا بۆیە لە زمانی عەرەبیدا بەم ناوانە دەوترێت ( موصول ) چونکە ماناکەی دەگەیەنرێت بە دوای خۆی و بەبێ ڕستەکەی دوای خۆی کە پێی دەوترێت (صلة ) مانایان نیە.

[٤] ووشەی ( الصلة ) زاراوەیەکی نحویەو تایبەتە بە اسمائی موصولە،کە دواتریش بە تفصیل باسدەکرێت إنشاءالله .

[٥] هەروەکو چۆن هەموو حەرفێکیش تا نەخرێنە ناو ڕستەوە مانای تەواوی نیە ، اسمی موصولیش تاوەکو ڕستەکەی دوای خۆی نەیات مانای نیە.

[٦] مەبەستمان ئەوەیە ئەم شەش ناوە بەردەوام مبنین ، ئەگەر نا ناوی دیکەش هەیە هەندێ جار مبنیە و هەندێ جاریش معربە وەکو اسمی لای نافیە للجنس، وەکو هەندێ لە ناوەڵفرمانەکان ( بعض الظروف ) کە لە بابەتەکانی داهاتودا باسیان دەکەین ، إنشاءالله تعالی.

جێناوەکان ( المضمرات ) ، ناوەکانی مەرج ( اسماء الشرط ) ، ناوەکانی پرسیارکردن ( اسماء الاستفهام) ، ناوەکانی ئاماژەکردن (اسماء الاشارة) ، ناوەکانی کردارەکان ( اسماء الافعال) وە ناوە گەیەنراوەکان ( الاسماء الموصولة ) .

* باسی ناوی معرب

١٨- ومعربُ الاسماء ما قَدْ سَلِما    مِن شَبَه الحرف كأرضٍ وسُما[1]

مەبەستی دانەر لەم دێڕەدا ئەوەیە کە ناوی معرب پێچەوانەی مبنیە ، پێشتر باسمان کرد مبنیە ئەوەیە کە لە حەرف بچێت ، کەواتە معرب ئەوەیە لە حەرف ناچێت معربیش دابەش دەبێت بۆصحیح ئەوەیە کەپیتی کۆتایی بزوێن ( علة ) نەبێت وەکو وشەی ( أرض )، وەبۆ معتل- ئەوەیە کە حەرفی کۆتایی بزوێن ( علة ) بێت وەکو : سُما، ووشەی سُماً جۆرێکە لە خوێندنەوەی ووشەی ناو ( الاسم ) شەش شێوە خوێندنەوەی هەیەك: اِسم ، أسم همزەکەی ضمە یان کسرەی هەیە، وسِمُ ، سُمُ واتە حەرفی سینە کە ضمە یان کسرەی هەیە وە سُماً ، سِماً بە هەمان شێوە.

هەروەها اسمی معرب دابەش دەبێت بۆ -١- ناوێك کە هەموو گۆڕانکارییەکی بەسەردا بێت[2] کە پێی دەڵێن ( متمكن أمكن ) و پێشی

---

[1] مانای ئەم دێڕە بە کورتی: ناوە معرەبەکان ئەوانەن لە هیچ ڕوویەکەوە لە حەرف ناچن وەکو ووشەی ( ارض ) و ( سُما ).

[2] مەبەستمان لە گۆڕینی حاڵەتی کۆتاییە وەکو ناوی ( محمد ) لەم سێ ڕستە جیاوەزەدا : قَامَ محمدٌ ، رأيتُ محمداً ، وسلمتُ على محمدٍ.دەبینین محمد لە هەر یەك لە حاڵەتی رفع و نصب و جردا حاڵەتی کۆتاییەکەی گۆڕاوە و نیشانەی ( علامة )ی هەر سێ حاڵەتەکەی وەرگرتوە.

دەڵـێن ( المنـصرف )[1] وەکـو : زیـدٌ و عمـرٌو ، وە بـۆ -٢- ناوێـك کـە هەنـدێك گۆڕانکـاری بەسـەر کۆتاییەکەیدا دێت و نـاتوانین هـەموو گۆڕانکارییـەك لـە حاڵـەتی حـەرفی کۆتاییـدا بکـەین ئـەمیش پێـی دەڵـێن ( مـتمکن غـیر امکـن ) یـان ( غـیر المنصرف) یان ( ممنوع من الصرف ) وەکو : أحمد و مساجد و مصابیح.

جا کەواتە ئەو ناوەی بە هیچ شێوەیەك گۆڕانکاری بەسەر کۆتاییەکەیدا نایات کە پێی دەوترێت ( غیر المتمکن )و مبنیە وە ئەوانەی گۆڕانکاری بەسەر حاڵەتی کۆتاییەکەیاندا دێت ئەوە معربەو دەبێتە دوو جۆر : ( متمکن أمکن ) و ( متمکن غیر أمکن )[2] .

* باسی ( معرب ) و ( مبنی ) لە فعلدا :

١٩- وفعلُ أمـرٍ ومُضِـيٍ بُنِـيـا و أعربوا مضارعاً إنْ عَرِيا

٢٠- مِنْ نُون توكيدٍ مباشرٍ ومنْ نون ِ إناثٍ كيَرُعْنَ مَنْ فُتِنَ[3]

---

[1] ووشەی ( منصرف ) اسمی فاعلەو لە ووشەی ( الصرف ) وەرگیراوە کە بەمانای تنوین دێت ، جا کە دەڵێن منصرف واتە ئەو ناوە (صرف)واتا(تنوین)وەردەگرێت لەگەڵ وەرگرتنی کەسرەش لە حاڵەتی جر دا ، بەڵام کاتێك دەوترێت ( ممنوع من الصرف ) یان ( غیر المنصرف ) مەبەست ئەو ناوە معرەبانەیە کە تنوین و کسرە وەرناگرێ وەکو ( احمد ) لەم سێ ڕستەیەدا : قَامَ احمدُ ، رایتُ احمدَ ، سلمت علی احمدَ. دواتر لە بەشەکانی کۆتاییدا بە تفصیل باسی ئەم بابەتە ئەکرێت.

[2] کەواتە ووشەی متمکن هاومانا ( مرادف )ی معربە . پێشتریش باسمان کرد (معرب ) ئەو ووشەیە کە حاڵەتی کۆتایی گۆڕانکاری بەسەردا دێت ، جا ئەگەر هەموو گۆڕانکارییەکی بەسەرداهات و تنوین و کسرەی وەرگرت ئەوە دەبێتە ( متمکن امکن ) پێشی دەوترێت (المنصرف ) بەڵام ئەگەر حاڵەتی کۆتایی ووشەکە هەموو گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهات مەبەستمان ئەوەیە تنوین و کسرەی وەرنەگرت ئەوە دەبێتە ( متمکن غیر أمکن ) وە پێشی دەوترێت ( غیر المنصرف ) یان ( ممنوع من الصرف ) .

[3] مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیە: کرداری داخوازی و ڕابردوو هەمیشە مبنین، وە زانایان کرداری ڕانەبردوو (فعل مضارع) یان معرب کردوە بە مەرجێك ئەو فعلە

کاتێك دانەر لێبویەوە لە باسکردن و ڕوون کردنەوەی معرب و مبنی لە ناوەکاندا دەستی کرد بە ڕوون کردنەوەی معرب و مبنی لە فعلەکاندا ، جا ڕاوو بۆچوونی زانا بەصریەکان[1] وایە کە معرب بوون ئەصلە لەناو داو فەرعە لە فیعلیشدا کەواتە بنچینەو ئەصل لە فعلدا مبنی بوونە لای بەصرێکان، بەلأم کوفیەکان[2] پێیان وایە ( معرب ) بون ئەصل و بنچینەیە لە اسم و فعلیشدا ، دیارە بۆ چوونی یەکەم[3] تەواوە وە ضیاء الدین کوڕی العلج لە کتێبی (البسیط)دا نەقلیکردوە کە هەندێ لە زانایان پێیان وایە معرب بوون ئەصلە لە فعلداو فەرعیشە لە اسمدا.

---

مضارعە پەتی (خالي) بێت لە نونی توکیدی ڕاستەوخۆ و لە نونی نسوە،واتە ئەگەر نونی توکید ڕاستەوخۆ لکابوە فعلە مضارعەکەوە ئەو کات (مبنی)ەو معرب نیە وەکو (یکتُبَنَّ) ئەگەر نونی نسوەی پێوە بوو ئەوە مبنیە لەسەر سکون وەکو نمونەکەی ابن مالك – یَرُعْنَ مَنْ فُتِنَ – مانای ئەم ڕستەیە ( ئەو ئافرەتانە دەترسێنن ئەو کەسەی عاشقە-لێرەدا فعلی (یَرُعْنَ ) مضارعە و معرب نیە بەڵکو مبنیە چونکە نونی نسوەی پێوە لکاوە.

[1] مەبەست لە زانا بەصریەکان ئەو زانایانەن سەر بە قوتابخانەی شاری بەصرەن،زۆربەی مێژوو نووسان پێیان وایە زانستی نحو لە شاری بەصرەوە دروست بوە و وەئەوان یاساکانی نحو یان داناوە دواتر زانستی نحو گەشەی کردوە و گرنگی پێدراوە لەلایەن زانایانی شاری کوفەوە و مەدرەسەی کوفیەکان دروست بوە سەدەیەك دوای دروست بوونی مەدرەسەی بەصریەکان،دواتر مەدرەسەی بغدادی دروست بوە و دواتریش مەدرەسەی أندلس دروست بوە ئەم چوار مەدرەسەیە ، مەدرەسە سەرەکیەکانی زانستی نحون بە تایبەت مەدرەسەی بەصری و کوفی.

[2] مەبەست زانایانی نحوی شاری کوفەیە،شاری کوفە لە ساڵی ٦٣٨ زاینی دروست کراوە لەلایەن هاوەڵی بەڕێز سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دوای جەنگی قادسیە بەلأم شاری بەصرە ساڵی ٦٣٦ زاینی لەسەردەمی خەلیفە – عومەری کوڕی خطاب- (رضي الله عنه) دروست کراوە.

[3] مەبەست بۆچونی بەصرییەکانە.

**جا فعلی مبنی دوو جۆره :**

**یەکێکیان زانایان یەکدەنگن لەسەر مبنی بوونی ئەویش فعلی ماضیه و مبنیه لەسەر ( فتحه ) وەکو ( ضَـرَبَ ) به مەرجێك واوی جماعەی پێوه نەلکابێت، ئەگەر واوی جماعەی پێوه لکاو بوو ئەو کاته مبنیه لەسەر (ضمه )[1] وەکو ( ضربُوا ) وه ئەگەر جێناوی ( ضمیر )ی رفعی متحرکی[2] پێوه لکا بوو ئەوه مبنی دەبێت لەسەر سکون.**

**دووەم زانایان ڕایان جیایه دەربارەی مبنی بوونی وه ڕای بەهێز وایه که مبنیه ئەویش بریتیه له فعلی أمر وەك ( اضْـرِبْ )[3] که مبنیه لای**

---

[1] کاتێك فعلی ماضی واوی جماعەی پێوه لکا بوو به دوو شێوه دەتوانین إعرابی بکەین {ا} فعل ماضی مبنی علی الضم لاتصاله بواو جماعة. {ب} فعل ماضي مبني علی الفتح منع من ظهورها اشتغال المحل بحركة مناسبة للواو الجماعة.

[2] ضمائری رفعی متصل دەلکێت به فعلی ماضیه وه وەك { تُ ، تَ ، تِ ، نا ، تُما ، تم ، الف الاثنین ، واو الجماعه ، تُنَّ ، ن ( نون النسوة ) }

[3] کەواته فعلی أمر هەموو کاتێك مبنیەو مبنی بونەکەشی لەسەر چوار شته :

{ا} مبنی دەبێت لەسەر سکون ئەگەر کۆتاییەکەی حەرفی صحح بێت و هیچی پێوه نەلکابێت وەکو : اضربْ ، اسَمعْ ، اکتبْ . هەروەها ئەگەر نونی نسوەی پێوه لکا بوو وەکو : اضربْنَ ، اسمعْنَ ، اکتبْنَ .

{ب} مبني دەبێت لەسەر فتحه ئەگەر نونی توکیدی پێوه لکابێت وەکو : اضرَبَنَّ ، اسْمَعَنْ ، اکتُبَنْ .

{ج} مبني دەبێت لەسەر حذفی حرفی علة ، ئەگەر کۆتاییەکەی حەرفی عله بێت و هیچی پێوه نەلکا بێت ، وەکو اسْعَ ، ادْنُ ، امْضِ ... لێرەدا دەڵێین فعلی امر مبنی علی حذف حرف العله لانه معتل الآخر.

{د} مبنی دەبێت لەسەر حذفی نون ، ئەگەر فعلەکە یەکێك بوو له افعالی خمسه ، وەکو: اضربوا ، اسمعوا ، اکتبوا ، لێرەدا دەڵێین : فعل امر مبنی علی حذف النون لانه من الافعال الخمسة.

بەصرییەکان و معربە لای کوفیەکان. فعلی معربیش لە جۆرەکانی فعل (فعلی مضارع)ە[١] ، مضارعیش بەمەرجێك معرب دەبێت نونی توکیدی مباشر و نونی نسوەی پێوە نەلکابێت، نمونەی نونی توکیدی ڕاستەوخۆ (مباشر) (هَلْ تَضْرِبَنّ )[٢] لێرەدا فعلە مضارعەکە معرب نیەو مبنیە لەسەر فتحە ، هیچ جیاوازیەکیش نیە لە نێوان نونی توکیدی قورس (الثقیلة) یان سوك (الخفیفة) جا ئەگەر نونی پێوە نەلکابوو ئەوە مبنی نیە ، هەروەها ئەگەر نونەکە ڕاستەوخۆ پێوەی نەلکا بوو وەکو ئەوەی لە نێوان فعلە مضارعەکەو و نونە توکیدەکەدا ( ئەلفی اثنین ) هەبێت وەکو ( هَلْ تضربانٌ ) ئەصلی ئەم فعلە : هَلْ تضربانِنّ ، لێرەدا سێ نون کۆبۆتەوە[٣]، نونی یەکەم کە نونی فعلە مضارعەکەیەو و علاماتی ڕەفعێتی-حذف کراوە لەبەر ئەوەی ناکرێت سێ حەرفی هاوڕێنە کۆببێتەوە[٤] و بۆتە ( هَلْ تضربانٌ )[٥] ، هەروەها فعلە مضارعەکە معرب دەبێت کاتێك واوی جماعە یان یائی مخاطبة

---

[١] ووشەی ( مضارع ) اسمی فاعلەو لە فعلی ( ضَارَعَ ) ەوە وەرگیراوە کە بە مانای هاوشێوە دێت جا بۆیە بە فعلی مضارع ووتراوە هاوشێوە چونکە هاوشێوەی اسمە واتە هاوشێوەی اسمی فاعلە لە ڕووی ماناو ژمارەو حەرەکاتی حەرفەکانیەوە بۆ نمونە فعلی : یَکْتبُ هاوشێوەی ( کاتِبٌ )ە.

[٢] ( هل تضرِبَنّ ) لێرەدا تضربَنَّ فعلی مضارعە و مبنیە لەسەر فتحە چونکە ڕاستەوخۆ نونی توکیدی پێوەلکاوە.

[٣] (تضربانٌ) یەکێکە لە افعالی خمسة بۆیە علامەتی رفعی بریتیە لە نون ، دواتر باسی افعالی خمسة دەکەین إنشاالله.

[٤] بۆیە نونی علاماتی رفعەکە حذف دەکەین چونکە ئەگەر نونی توکید حذف بکەین ئەوە توکیدی فعلەکە نامێنێت.

[٥] تضربان : لێرەدا بەم شێوەیە إعرابی دەکەین / فعل مضارع مرفوع و علامة رفعە النون المحذوفة لتوالي الامثال . والالف الاثنین : ضمیر متصل مبني على السکون في

بكەوێتە نێوان فعلەكەو نونە توكیدەكە وەكو ( هَلْ تضرِبُنّ یا زیدون)[1] و ( هَلْ تضربِنّ یا هندُ )[2] جا ئەصلی ( تضرِبُنّ ) (تضربونَنّ)ـەیە لێرەدا سێ نون كۆبۆتەوە ونونی یەكەم كە عەلامەتی ڕەفعە حذف كراوە ولەبەر كۆبونەوە وهاتنی سێ نون بە دوای یەكدا وەكو پێشتر باسمان كرد بۆتە (تضربُونّ)دواتر واوی جماعەكەش حذف كراوە لەبەر ئەوەی دوو حەرفی ساكن كۆبۆنەتەوە بە دوای یەكدا[3]دواتر بۆتە(تَضربُنّ)هەروەها(تضرِبنّ ) ئەصلەكەی(تضربینَنّ) بووە وبەهەمان شێوەی (تضربُونَنّ )حذفی تیا كراوە.جا ئەمەیە مەبەستی ووتەی ابن مالك(واعربوا مضارعاً إن عریا من توكید مباشر )دەبینین بە مەرجی گرتوە بۆ معرب بوونی فعلی مضارع خالی بوونی لە نونی توكیدی ڕاستەوخۆ (مباشر)،جا ناوەڕۆكی قسەكەی ئەوەیە ئەگەر خالی نەبوو لە نونی توكیدی مباشر ئەوە مبنیە. هەروەها زانراوە كە بۆچوونی ابن مالك وایە فعلی مضارع مبنی نابێت مەگەر ڕاستەوخۆ نونی توكیدی پێوە لكابێت[3] وەكو ( هل تضرِبَنّ یا زیدُ ) جا ئەگەر ڕاستەوخۆ نونە توكیدەكە نەلكابوو بە فعلە مضارعەكەوە[4]

---

محل رفع فاعل . ونون التوكید لا محل لها من الاعراب . وكسرت النون هنا تشبیها لها بنون المثنى أي النون التي هي علامة الرفع.

[1] ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە إعراب دەكرێت : هل / حرف استفهام مبني على السكون لا محل لها من الإعراب . تضربُنّ / فعل مضارع مرفوع وعلامه رفعه النون المحذوفة لتوالي الامثال . وفاعله / الواو الجماعة المحذوفة لالتقاء الساكنین . یا / حرف نداء مبني على السكون لا محل لها من الاعراب..زیدون/ منادى مبني على الواو في محل النصب.

[2] ئەم ڕستەیەش وەكو ڕستەی پێش خۆی وایە لە ڕووی إعرابەوە ئەوەندە جیاوازی هەیە فاعلی تَضربنّ یائی محذوفة.

[3] چونكە هەركاتێك دوو حەرف بەدوای یەكدا هات و یەكەمیان (ساكن) بوو وە حەرفی علەش بوو ئەوە هەر حەرفە علەكە حذف دەكرێت ، بەلاًم ئەگەر ساكنەكە حەرفی علە نەبوو ئەوە حذف ناكرێت.

[3] بەوە دەزانین كە نوونی توكید ڕاستەوخۆ لكاوە بە فعلە مضارعەكەوە پێش نوونەكە دەبێت(فتحة) بێت وەكو ( تكتبَنّ ) بەلاًم ئەگەر پێش نونە توكیدەكە فتحە نەبێت ئەوە ڕاستەوخۆ پێوەی نەلكاوە.

[4] بەوەی پێش نونەكە ( ضمة ) یان ( كسرة )ی هەبوو یان ( الف الاثنین ) لە پێشێوە بوو.

ئەوە مبنی نابێت و معرب دەبێت ، ئەمە ڕاوبۆچوونی زۆرینەی زانایانە بەڵام ئەخفەش پێی وایە فعلی مضارع مبنی دەبێت لەگەڵ نوونی توکیدا ڕاستەوخۆ پێوەی لکابێت یان ناڕاستەوخۆ ، هەروەها گێڕدراوەتەوە لە هەندێ لە زانایان فعلی مضارع معربە ئەگەر نونی توکیدیشی پێوە لکابێت[1]، نمونەی فعلی مضارع کە نوونی نسوەی پێوە لکابێت[2] ( الهندابُ یضربْنَ)، لێرەدا فعلە مضارعەکە مبنیە لەسەر سکون ، جا ابن مالك – ڕەحمەتی خوای لێبێت – لە هەندێ لە کتێبەکانیدا باسی ئەوەی کردوە کە هیچ ڕاجیاییەك نیە لە مبنی بوونی فعلی مضارع کاتێك نونی نسوەی پێوە لکابێت ، بەڵام وانیە ، بەڵکو ڕای جیا هەیە، لەو زانایانەی باسی ئەم ڕا جیایەیان کردبێت مامۆستا ئەبو حەسەن کوڕی عصفور لە کتێبی شەرحی ئیضاحدا .

---

[1] کەواتە سێ ڕاهەیە دەربارەی حوکمی فعلی مضارع کاتێك نونی توکیدی پێوە بێت:

{ا} مبنیە بە مەرجێك نونەکە راستەوخۆ ( مباشر ) پێوەی لکابێت،ئەمەش ڕای زۆرینەی زانایانە

{ب} مبنیە بە هەموو شێوەیەك واتە ئەگەر نونە توکیدەکە ڕاستەوخۆ پێوەی لکابێت یان نا ، ئەمەش ڕای ئەخفەشە.

- {ج} معربەو مبنی نیە ، ئەمەش ڕای هەندێ لە زانایانە.

[2] ئەمە حاڵەتی دووەمی مبنی بوونی فعلی مضارعە ، ڕستەکەش بەم شێوەیە إعراب دەکرێت : الهندابُ / مبتدا مرفوع .. یضربْنَ / فعل مضارع مبني على السکون لاتصاله بنون النسوة ، ونون النسوة / ضمیر متصل مبني على الفتح في محل رفع فاعل . والجمله الفعلیة ( یضربن ) في محل رفع خبر .

*** باسی مبنی بوونی حەرف و جۆرەکانی مبنی :**

**٢١- وکلُ حرفٍ مستحِقٌ للبنــا والاصلُ في المبني أنْ يُسكنا**

**٢٢- ومِنهُ ذو فتحٍ و ذوكسرٍ وضَم كأينَ امسِ حيثُ والساكن كمْ[1]**

حەرف بەهەموو شێوەکانیەوە مبنیە ، چونکە نایاتە سەری شتێك کە وای لێبکات بۆ گەیاندنی ماناکەی پێویستی بە معرب بوون بێت[2] بۆ نمونە (اخذتُ من الدارهمِ ) لێرەدا مانای چەندێتی حەرفی (من) لە خودی ووشەی (من) وەرگیراوە نەك لە حاڵەتی إعرابیەوە.

ئەصل و بنچینە لە مبنی بوندا ئەوەیە مبنی بێت لەسەر سکون چونکە ساکن بوون لە دەربڕیندا سوك و ئاسانە لە حەرەکە ، جا مبنی حەرەکە وەرناگرێت مەگەر لەبەر هۆکارێك وەکو خۆ دەرباز کردن لە گەیشتنی دوو ساکن بە یەك ، جا حەرەکەی مبنی هەندێ جار فتحەیە وەکو (أینَ ، قامَ ، إنَّ)[3] وەهەندێ جار کسرە دەبێت وەکو (امسِ و جَیرِ) وە هەندێ جاریش ضمە دەبێت وەکو ( حیثُ )کە ناوە ، وە وەکو ( منذُ ) حەرفە کاتێك دوای خۆی مجرور بێت[4].

---

[1] مانی ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە ٢١: هەموو حەرفێك واجبە مبنی بێت ، بنچینەی مبنی بوونیش واتە علامەی اصلی مبنی ئەوەیە ساکن بێت ، ٢٢ – بەڵام هەندێ ناوی مبنی مبنێن لەسەر فتحە وە هەندێکیان لەسەر کسرە وە هەندێکیان لەسەر ضمة وەکو ( اینَ ، امسِ ، حیثُ ) وە نمونەی ساکنەکەش ( کمْ ).

[2] چونکە حەرف ماناکەی بە پێی شوێن لە ڕستەدا ( محل الاعراب ) ناگۆڕێت وەکو ناو ، واتا ناو بەپێی محلی إعرابی ماناکەی دەگۆڕێت، بەڵام حەرف وانیە.

[3] مبنی چوار جۆرە {أ}مبني لەسەر فتحە وەکو ، قام ، إنَّ {ب} مبني لەسەر کسرة وەکو : امسِ و جَیرِ – واتە بەڵێ – {ج}مبنی لەسەر ضمە وەکو : حیثُ ، منذُ {د} مبنی لەسەر سکون کە علامەتی ئەصلی مبنی بوونە وەك ابن مالك فەرمووی _ نمونەی کمْ ، اضربْ ، اجلْ .

[4] ووشەی ( منذُ ) هەروەها ( مُذْ ) حەرفی جرن ئەگەر لە دوایانەوە اسمێکی مجرور هات و ئەو اسمەش دەبێت کات ( زمان ) بێت ، وەکو : مارایتە منذ-مذ-یومِ الجمعة ، وە ( منذ ، مُذْ ) دەبنە اسم

- مبنی بوون لەسەر سکون وەکو ( كَمْ ، اضربْ ، أجَلْ ).
کەواتە زانرا لەو نمونانەی هێنرانەوە و باسکران کە مبنی بوون لەسەر کسرەو ضمە لە فعلدا نیە[1] بەڵکو لە اسم و حەرفدا هەن ، و مبنی بوون لەسەر فتحەو سکون ، لە اسم و فعل و حەرفدا دەبێت .

* جۆرەکانی إعراب و نیشانەکانی ( انواع الاعراب وعلاماتە )

٢٣- والرفعَ والنصبَ اجعلنْ إعــراباً — لاسمٍ وفعلٍ نحو لَنْ أهابا
٢٤- والاسم قد خُصِّصَ بالجرِّ ، كما — قد خُصِّصَ الفعلُ بأنْ يَنْجَزِما
٢٥- فارْفَعْ بضَمٍ وانصِبَنْ فتحاً وجُرّ — كسراً كذكرُ اللهِ عَبدَه يَسُرْ
٥٦- واجْزِم بتسكينٍ ، وغيرُ ما ذُكِر — ينوبُ ، نحو : جا أخو بني نَمِر [2]

---

ئەگەر لە دوایانەوە اسمێکی مرفوع هات وەکو : ما رایتهُ منذ یومانِ..لێرەدا منذ دەبێتە مبتدا وە دوای خۆی دەبێتە خبری،هەروەها ئەگەر لە دوایانەوە جملەی فعلی هات وەکو : جئتُ منذُ دعا.

[1] بەڵام فعلی ماضي کاتێك واوی جماعەی پێوە لکا بوو مبنی دەبێت لەسەر ضمة،بەڵام ئەم ضمە یە کاتیەو ئەصلی نیە ، وە هەندێ لە زانایان پێیان وایە کە فعلی ماضی هەمیشە مبنیە لەسەر فتحە ، وە کاتێکیش واوی جماعەی پێوەیە وەکو ( قامُوا) مبنیە لەسەر ( فتحة مقدرة منع من ظهورها اشتغال المحل بمحركة مناسبة للواو الجماعة) .

[2] لەم چوار دێڕەدا ابن مالك- رەحمەتی خوای لێبێت- باسی جۆرەکانی إعراب و نیشانە بنەڕەتیەکانی إعراب دەکات ، جا کورتەی مانای ئەم دێڕانە {٢٣} رفع و نصب بگێڕە بە حاڵەتی إعرابی بۆ اسم و فعل نمونەی فعلێکی منصوب ( لَنْ أهابَ ).
{٢٤} وە حاڵەتی جر تایبەتە بە اسمەوە - واتە فعل هیچ کاتێك مجرور نابێت - هەروەکو چۆن فعلیش ( مەبەست فعلی مضارعە ) تایبەتە بە جەزمەوە-واتە اسمی مجزوم نیە لە زمانی عەرەبی .
{٢٥} لەم دێڕەدا باسی علاماتی أصلی إعراب دەکات و دەفەرموێت : مرفوع بکە بە ضمە و منصوب بکە بە فتحە و مجروریش بکە بە کسرە ، نمونە ( ذكرُالله عَبْدَه كسُرّ) لێرەدا چوار ووشەی معربمان هەیە : ذکر/مبتدایەو مرفوعەو علاماتی رفعی ضمە یە.

جۆرەكانى إعراب چوارن : رفع ، نصب ، جر ، جزم ، جا رفع و نصب هاوبەشن تيايانداا ناو و كردار ( الاسما و الافعال )[١] وەكو ( زيدٌ يقومُ ، و إنّ زيداً لَنْ يقومَ )[٢] بەلاّم جر تايبەتە بەناو[٣] وەكو ( بزيدٍ ) هەروەها جەزميش تايبەتە بە فعلەوە[٤] وەكو ( لَمْ يَضْرِبْ )جا ئەصل و بنچينە لە رفع دا واتە علاماتى ئەصلى رفع بريتيە لە (ضمە) وە ( نصب )[٥] بريتيە لە فتحە ، وە جريش[٦] بريتيە لە كسرە و جزميش بريتيە لە سكون ، جگە لەم نيشانانە (علامات ) نيشانەكانى تر جێگر (نائب)ـن واتە لە جێى ئەم نيشانە

---

الله / مضاف اليه مجرور وە علامەى جرى كسرەيە . عَبْدَ / مفعول به منصوب وە علامەتى نصبى فتحەيە . كيسُرُ / فعلى مضارعە و مرفوعەو علاماتى رفعى ضمە يە .

{٢٦} وە مجزوم بكە بە سكون – واتە علامەتى ئەصلى جزم سكونە، جا غەيرى ئەوەى باسكرا لە عەلاماتى ئەصلى علاماتى تر هەن جێگرن – كە دواتر باسيان دەكات – وەكو : جاءَ اخوبني نمر /لەم ڕستەيەدا دوو ناوى معربى تێدان كە علامەتيان نا ئەصليە ووشەى أخو فاعلەو علامەتى رفعى واوە و لە جێى ضمە يە . وە ووشەى ( بني ) مضاف إليەو مجرورەو علاماتى جرى يايە و لە جێى كەسرەيە .

(١) واتە اسم مرفوع ومنصوب دەبێت هەروەها فعليش- مەبەست فعلى مضارعە چونكە دوو فعلەكەى تر مبنين و معرب نين.

(٢) لەم دوو ڕستەيەدا دوو ناوى معرب هاتووە ، يەكەميان مرفوعە ( زيدٌ ) دووەميشيان منصوبە ( زيداً ) هەروەها دوو فعلى مضارع هاتووە يەكەميان مرفوعە (يقومُ) دووەميان منصوبە(لَنْ يقومَ).

(٣) واتە حاڵەتى إعرابى جر تايبەتە بە ناو و هيچ كاتێك فعل مجرور نابێت.

(٤) مەبەست فعلى مضارعە كاتێك يەكێك لە ئەدەواتى جزمى لە پێشەوە هات ئەوە فعلە مضارعەكە مجزوم دەبێت.

(٥) واتە نيشانەى بنەڕەتى ( علامەى ئەصلى ) حاڵەتى نصب فتحەيە.

(٦) واتە نيشانەى بنەڕەتى جر كسرەيە.

ئەصلیانە نیشانەی غەیر ئەصلیش هەن - وەكو ئەوەی حەرفی واو لە جێی ضمە دەبێت لە ووشەی ( أخو )[١] ،وە حەرف ( یا ) لە جێی كسرە دایە لە ووشەی ( بني )[٢] لە ڕستەی ( جا أخو بني نمر )[٣] دواتر دانەر باسی ئەو شوێنانە دەكات كە نیشانەكانیان جێگر (نائب)ـن واتە ئەصلی نین .

*** إعرابی ئەسمای ستە**

٢٧- وارْفَعْ بواوٍ ، وانصبَنَّ بالألف          واجْرُرْ بياءٍ ما مِنَ الاسما أصِفُ[٤]

ابن مالك - ڕەحمەتی خوای لێبێت - دەستی كرد بە ڕوون كردنەوەی ئەوانەی معربن و نیشانەكانیان ئەصلی نین،لەوەی پێشتر باسكرا جا مەبەستی دانەر لەو ناوانەی كە لەمەو دوا باسیان دەكات بریتیە لە شەش

---

[١] ووشەی اخو یەكێكە لە شەش ناوەكەی كە ناسراون بە ( الاسماء الستة ) دواتر باسیان دەكەین . إنشاء الله .

[٢] ووشەی ( بنی ) یەكێكە لەو ناوانەی ناسراون بە ( ملحقات جمع مذكر سالم ) دواتر باسیان دەكەین إنشاء الله .

[٣] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : جاءَ / فعل ماضي مبني على الفتح . أخو / فاعل مرفوع وعلامة رفعه الواو نيابة عن الضمة لأنه من الاسماء الستة وهو مضاف، بني : مضاف اليه مجرور وعلامة جره الياء نيابة عن الكسرة لأنه ملحق بجمع مذكر سالم وحذف النون لأنه مضاف و أصله ( بنين ) . نمر : مضاف اليه مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة.

[٤] لەم دێڕەدا ابن مالك دێتە سەرباسی ئەو ناوە معربانەی كەعلامەتی إعرابیان ئەصلی نیە، دەڵێت مرفوع بكە بەواو لەجیاتی ضمە وە منصوب بكە بەئەلیف لە جێی فتحە ، وەمەجروریش بكە بە یا لەجێی كسرە ،ئەو ناوانەی لەمەودوا باسیان دەكەم .

ناوەکـــه ( الاسمـــاء الـــستة) ئـــەوانیش ( ابٌ ، اخٌ ، حَـــمٌ ، هَـــنٌ ، وفُـــوهُ ، وذو مالٍ )[1] ئەم شەش ناوە علاماتی رفعیان واوە وەکو ( جاء أبو زيدٍ )[2] وە عەلامەتی نصبیان ئەلیفە وەك ( رأيتُ اباه )[3] وە علامەتی جریشیان یایە وەکو ( مررتُ بأبيه)[4] جا ئەوەی باوە ئەوەیە ئەم شەش ناوە معربن بە حروف ، حەرفی واو لە جێی ضمەیە و ئەلف لە جێی فتحەیە و یا لە جێی کسرەیە بۆ ئەم بۆچوونە باوە ( الرأي المشهور) ئاماژەی کرد ابن مالك بە ووتەی ( وارفع بواو – تا کۆتایی دێڕەکە ) بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیـە ئـەم ناوانـە معـربن بـە حرکـاتی مقـدرة ، لەسـەر واو و ئـەلیف و یـا ، علامـەتی حاڵەتی رفعی ضمەی مقدرە لەسەر واوەکە ، وە علامەتی حاڵـەتی نصبی فتحـەی مقدرە لەسەر ئەلیفەکە ، وە علامەتی حاڵـەتی جری کسرەی مقدرە لەسـەر یایەکە ، جا لەسـەر ئەم بۆچوونە راستە هیچ شتێك لە جێی شتێکی تر دانەنیشتووە لەوەی باسکرا[5] .

---

[1] مانای ئەم شەش ناوە بەم شێوەیەیە : أب : باوك / أخ : برا / حم : خزمی مێردی ئافرەت – کەس و کاری پیاوەکەی . هن : ووشەیە بەکاردێت بۆ شتێکی ناشرین کە نەنگ بێت باسکردنی ، وەهەندێ دەڵێن ووشەی ( هن ) بەکاردێت بۆ عەورەتی مرۆڤ . فو : دەم / ذو : خاوەن . جا لەبەر ئەوەی ووشەی ( هن ) ماناکەی جوان نیە و بۆ شتی ناشرین بەکاردێت بۆیە لە هەندێ لە کتێبەکان دەڵێن پێنج ناوەکە ( الاسماء الخمسة).

[2] جاء أبو زيدٍ : بەم شێوەیە إعراب دەکرێت : جاءَ/ فعل ماضي مبني على الفتح . أبو / فاعل مرفوع وعلامة رفعه الواو لأنه من الاسماء الستة ، وهو مضاف . زيدٍ مضاف اليه مجرور علامة جره الكسرة الظاهرة.

[3] رأيتُ اباهُ ، رأيتُ/ فعل و فاعل . أبا/ مفعول به منصوب وعلامة نصبه الالف لأنه من الاسماء الستة وهو مضاف ، هـ/ ضمير متصل مبني على الضم في محل جر مضاف اليه.

[4] مررتُ بأبيه ، مررتُ/ فعل و فاعل . بأبيه:بـ/ حرف جر ،، ابيه / اسم مجرور علامة جره الياء لأنه في الاسماء الستة ، وهو مضاف . يهِ/ ضمير متصل مبني على الكسر في محل جر مضاف اليه.

[5] زانایانی نحو ڕایان جیایە دەربارەی إعرابی شەش ناوەکە و قسەی زۆریان هەیە دەربارەی ، ئیمامی سیوطی- ڕەحمەتی خوای لێبێت – دەفەرموێ : (١٢) ڕا هەیە

٢٨- مِنْ ذاك ذو إنْ صُحبةً أبانا والفم حيثُ الميمُ منه بانا[(١)]

واتە لەو ناوانەی[(٢)] مرفوع دەبن بە واو ، ومنصوب دەبن بە ئەلف ، مجرور دەبن بە یا- ناوی ( ذو ، فم ) بەلاّم مەرجە ( ذو )[(٣)] بە مانای خاوەن بێت

---

دەربارەی إعرابی شەش ناوەکە ، بەلاّم پوختەی ئەم رِایانە ئەمەیە : ئەم شەش ناوە (الاسماء الستة) سیّ بەشن :

{أ} بەشی یەکەمیان بە یەك جۆر إعراب دەکرێت ئەویش إعرابە بە حروف واتە بە( واو و ئەلف و یا ) ، ئەوانیش هەردوو ناوی ( ذو ) و ( فو )ن.

{ب} بەشی دووەمیان کە تەنها ( هن )ە بە دوو جۆر إعراب دەکرێت : یەکەم/إعراب کردنی بە حرکاتی ظاهرة کە پێی دەوترێت - لغة النقص- کە ئەمەش رِای بەهێزە . دووەم/ إعراب کردنی بەحروف کە پێی دەوترێت - الاتمام- ئەمەش کەمە.

{ج} بەشی سێیەم :- هەر سیّ ناوی ( اب و اخ و حم ) کە بە سیّ شێوە إعراب دەکرێت . یەکەم/ إعراب کردنیان بە حروف ئەمەش رِای بەهێزە . دووەم/ اعراب کردنیان بە حرکاتی مقدرە لەسەر الف وەکو ناوێکی ( مقصور ) ، ئەمەش پێی دەوترێت - لغة القصر - . سێیەم/ إعراب کردنیان بە حرکاتی ظاهرە ، ئەمەش پێی دەوترێت -نادر- چونکە زۆر کەمە.

(١) مانای ئەم دێرە بە کورتی : لەو ناوانەی کە باسکران - مەبەستی شەش ناوەکەیە - وإعرابیان بە حەرفە نەك حەرەکە ناوی ( ذو) بە مەرجێك مانای خاوەن بگەیەنێت ، هەروەها ناوی ( فم ) بە مەرجێك میمەکەی کە پیتی کۆتاییە لێکرێتەوە و نەمێنێت.

(٢) مەبەست شەش ناوەکەیە ( الاسماء الستة ) .

(٣) ذو : لە زمانی عەرەبیدا دوو مانا و بەکارهێنانی هەیە: {أ} بە مانای خاوەن دێت و یەکێکە لە شەش ناوەکەو هەمیشە معربەو إعرابی بە حروفە هەموو کاتێك مضافە بۆ لای ناوێکی رەگەز ( اسم جنس ). {ب} بە مانای ( ئەوەی) دێت و اسمێکی موصولە و مبنیە و بە یەك شێوە بەکاردێت و لە هەر سیّ حاڵەتەکا واتە لە حاڵەتی رفع و نصب و جر ، وە لە دوایەوە (جملە ) یان ( شبە جملە ) دێت کە دەبێتە صلەکەی ، ئەمەش بە کارهێنانی هۆزی طائیەکانە.

وەکو ( جاءني ذو مالٍ )[١] واتە : دەبێت ( ذو ) بە مانای خاوەن بێت واتە مانای خاوەن لە خۆگرێت ، بەمە خۆی پاراست لە ( ذو )ی طائیەکان[٢] کە بەمانای خاوەن نایات بەڵکو بە مانای ( الذي ) دێت ئەمەیان[٣] وەکو ( ذو)ی مانای خاوەن نیە[٤] بەڵکو مبنیەو کۆتاییەکەی واوە لە هەر سێ حاڵەتی رفع و نصب و جردا ، وەکو : (جاءني ذو قام ، ورايتُ ذو قامَ ، ومررْتُ بذوقام )[٥] ووتەی شاعیریش کە ذوی بەکارهێناوە لەم دێڕەدا – ئەم جۆرەیە واتە ذوی طائیەیە :

ش٤/ فإمّا كرامٌ موسرون لقيتُهم فحسبي مِنْ ذو عندهم ما كفانيا[٦]

هەروەها مەرجە بۆ إعراب کردنی ناوی ( فم ) بە حەرف[٧] لێکردنەوەی میمەکەی وەکو ( هذا فوهُ ، ورأيتُ فاهُ ، ونظرتُ

---

[١] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : جاءَ : فعل ماضي مبني على الفتح . ن/ نون الوقاية . ي/ ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به مقدم . ذو/ فاعل مرفوع وعلامة رفعه الواو لأنه من الاسماء الستة . وهو مضاف .. مالٍ/ مضاف اليه مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة .

[٢] طائية يان طَيئ : یەکێکە لە هۆزەکانی عەرەب کە خاوەن کەلەپوور و دەستوری خۆیانن و لە ڕێزمانی عەرەبیدا بۆچونەکانیان وەرگیراوە .

[٣] واتە / ذوی طائیە .

[٤] بەڵکو بە مانای ( ئەوەی ) دێت .

[٥] لێرەدا ( ذو )ی طائیە لە سێ ڕستەدا بەکار هاتووەو لە یەکەمیاندا فاعلەو لە دووەمدا مفعولەو لە سێیەمیشدا اسمی مجرورە ، بەڵام لەهەر سێ حاڵەتەکە مبنیە و کۆتاییەکەی نەگۆڕاوە و لە دوایەوە جملەی فعلی هاتوە کە دەبێتە جملەی صلەو مانای ذوە کە تەواو دەکات.

[٦] مانای ئەم دێڕە بەم شێوەیەیە : جا ئەو ئەکەسانەی من پێیان دەگەم یان کەسانی بەڕێز و هەبوون کە پێیان دەگەم بەسمە ئەوەی هەیانە و پێی ڕازیم . بەڵگە ( شاهد)ی ئەم دێڕە : ( ذو ) بە مانای ( الذي ) هاتوە و مبنیە ، ئەگەر بە مانای خاوەن بهاتبایە دەبو ووترابای ( من ذي ) چونکە لە دوای حەرفی جەرەوە هاتوە.

[٧] واتە : رفعی بە واو و نصبی بە ئەلف و جری بە یا.

إلى فيهِ )[١] بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد ابن مالك بە ووتەی ( والفم حيث الميمُ منه بانا ) واتە میمەکەی لێکرێتەوە ، جا ئەگەر میمەکەی لێنەکرایەوە ئەوە إعراب دەکرێت بە حرکە وەکو ( هذا فمٌ ، ورايتُ فماً ، و نظرتُ إلى فمٍ )[٢]

٢٩- ابُ، اخٌ، حَمٌ كذاك، وهَنُ — والنقص في هذا الأخيرِ أَحْسَنُ
٣٠- وفي أبٍ وتاليَيْه يَنْدُرُ — وقصرُها من نقصهنّ أشْهَرُ[٣]

واتە/ هەر سێ ناوی ( اب، اخ ،حم)[٤] وەکو (فم و ذو) وان لە ڕووی إعرابیەوە کە پێشتر باسکران مرفوع دەبن بە واو و منصوب دەبن بە ئەلف و مجروریش دەبن بە یا ، وەکو ( هذا أبوهُ وأخوهُ وحموها[٥]، ورايتُ

---

[١] لەم سێ ڕستەیەدا ووشەی ( فم ) بەکارهاتووەو میمەکەی لێکراوەتەوە و لە ڕستەی یەکەمدا مبتدایەو مرفوعەو علامەی رفعی واوە ، وە لە دووەمدا مفعول بە وعلامەی نصبی ئەلفە ، وە لە سێیەمدا اسمی مجرورەو و علامەی جری یایە.

[٢] لەم سێ ڕستەیاندا ووشەی فم بەکارهێنراوە و میمەکەی لێنەکراوەتەوە بۆیە إعرابی بە حەرف ناکرێت ، بە ضمە و فتحە و کسرە دەکرێت.

[٣] مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیەیە : {٢٩} هەر سێ ناوی اب و اخ و حم وەکو ئەوان _ واتە وەکو (ذو) و (فم) وان- هەروەها ناوی ( هن ) یش وایە ، بەلاَم نەقص – واتە إعراب کردن بە حەرەکاتی ظاهرە بۆ ( هن ) جوانتر و باشترە. {٣٠} بەلاَم إعراب کردن بە حرکاتی ظاهرە بۆ هەر سێ ناو ( أب و اخ و حم ) کەمەو نادرە ، وە إعراب کردنیان بە حرەکاتی مقدرە لەسەر ئەلیفی مقصورە زۆرتر و باوترە لە حەرەکاتی ظاهرە.

[٤] پێشتر ئەم ناوانە مانا کراون.

[٥] هذا / اسم إشارە مبنی في محل رفع مبتدا . ابو / خبر مرفوع وعلامة رفعه الواو لأنه من الاسماء الستة وهو مضاف (هُ) ضمير متصل مبني في محل جر مضاف اليه . واخوه / و : حرف عطف . اخو / اسم معطوف مرفوع وعلامه رفعه الواو لأنه من الأسماء الستة وهو مضاف . (ه) ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه .. حموها / مثل اخوه في الاعراب.

أباه وأخاهُ وحماها[١] ، ومررتُ بأبيه وأخيه و حميها[٢] ) ، ئەم إعرابەش[٣] ڕای باوە لەم سێ ناوەدا ، دواتر باسی دوو شێوە إعرابی تر بۆ ئەم سێ ناوە دەكات . بەڵام ناوی ( هن ) ڕای ڕەوان وایە معرب بێت بە حەرەكاتی ظاهرە لەسەر نونەكەی ، وە لە كۆتاییەوە حەرفی علە- واو و یا و ئەلف- نایات، وەكو ( هذا هنُ زيد ، ورأيتُ هنَ زيدٍ ، ومرَرتُ بهنِ زيدٍ )[٤] بۆ ئەمەش ئاماژەی كرد ابن مالك بە ووتەی ( والنقص في هذا الأخير أحسن ) واتە : لێكردنەوەی ( ئەلف و واو و یا ) لە (هن) وە إعراب كردنی بە حركات جوانتر و باشترە لە (إتمام ) واتە- لە إعراب كردن بە حروف-، خۆ إعراب كردنی ( هن ) بە حروف دروستە بەڵام زۆر كەمە وەكو ( هذا هنوه ، ورأيتُ هناهُ ، ونظرتُ إلى هنيه )[٥]، (شیخی فرّاء )[٦] نكۆڵی دەكات لە دروستی ئەم

---

[١] رأيتُ / فعل و فاعل . اباه / مفعول به منصوب وعلامة نصبه الالف لأنه من الأسماء الستة وهو مضاف (ه) في محل جر مضاف اليه .. واخاه وحموها / اسمان معطوف منصوبان مثل (اباه) .

[٢] مررتُ/ فعل و فاعله. بابيه/ ب/حرف جر . ابي/اسم مجرور وعلامة جره الياء لأنه من الاسماء الستة وهو مضاف. ـه/ضمير متصل مبني في محل جر مضاف اليه. واخيه وحميها / اسمان معطوفان مجروران مثل ( أبي ).

[٣] واتە ( إعراب كردنی ( اب و اخ و حم ) بە واو لە حاڵەتی رفع و بە ئەلف لە حاڵەتی نصب و بە يا لە حاڵەتی جر.

[٤] لەم سێ ڕستەیەدا ووشەی ( هن ) بەكارهاتوە،لە یەكەمدا مرفوعەو علامەی ڕەفعەكەی ضمە یەو ، وە لە دووەمدا منصوبەو علامەی نصبەكەی فتحەیە ، وە لە سێیەمیشد مجرورەو علامەی جرەكەی كسرەیە.

[٥] لەم سێ ڕستەیەدا ووشەی ( هن ) بەكارهێنراوە ، بەڵام إعراب كردنەكەی بە حرفە، لە یەكەمدا مرفوعەو علامەی ڕەفعەكەی واوە ، وە لە دووەمدا منصوبەو علامەی نصبەكەی ئەلفە ، وە لە سێیەمیشدا مجرورە و علامەی جرەكەی یایە.

[٦] فراء : یەكێكە لە پێشەوایانی زانستی نحو لە شاری كوفە لە دایك بوە ساڵی ٧٦١ز ، قوتابی پێشەوا ( كسائی ) بووە و ساڵی ٨٢٢ز لە ڕێگەی مەككەی پیرۆز وەفاتی كردوە.

إعرابە[1] بەڵام بەڵگەی بۆ هێنراوەتەوە و نکۆڵیەکەی ڕەت دراوەتەوە بە گێڕانەوەی سیبویە ئەم إعرابە لە دەستەیەك لە عەرەبەوە،جا ئەوەی بەڵگەی پێبێت و بەڵگەی لەبەر بێت زاڵە بەسەر ئەو کەسەی بەڵگەی پیێ نیەو لەبەری نیە، هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی ( وفي ابِ وتالييە ينـدر- تا كۆتايی دێڕەكە ) بە دوو شێوە إعرابەكەی تری هەر سێ ناوی ( أب و اخ و حم ) یەكێكیان بریتیە لە نەقص واتە لابردن و حذف كردنی واو و ئەلف و يا و إعراب كردنيان بە حەرەكاتی ظاهرە لەسەر پيتی (با و خا و ميم) كە پيتی كۆتايی ئەو سێ ناوەن، وەكو ( هذا أبُهُ و اخُهُ و حَمُها[2] ، و رايت ابَهُ واخَهُ وحَمَها[3] ، ومررْتُ بأبهِ واخِهِ وحمِها[4]) بەڵگەش بۆ ئەم جۆرە إعرابە قسەی شاعیرە كە دەڵێت :

ش٥/ بأبهِ اقْتدى عديٌ في الكرم        ومن يشابَه ابَهُ فما ظلَم[5]

ئەم جۆرە إعراب و خوێندنەوەیە بۆ هەر سێ ناوی ( اب و اخ و حم ) كەمە، بۆیە دانەر ووتی (وفي أبِ وتالييە ينـدرُ) واتە: كەم و نادرە إعراب كردنیان

---

[1] واتە إعراب كردنی وشەی ( هن ) بە حروف.

[2] إعرابی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : هذا/ اسم اشارة مبني في محل رفع مبتدا . أبُهُ/ خبر مرفوع وعلامة رفعه الضمه الظاهرة وهو مضاف . ـه/ ضمير متصل مبني على الضم في محل جر مضاف إليه . و اخه و حمَها / اسمان معطوفان على ( ابه ) مرفوعان مثل ما قبلها.

[3] لێرەدا ووشەی (ابهُ) مفعول به منصوب وعلامەی نصبەكەی فتحەی ظاهرەیە ، هەروەها (اخَهُ وحمها) هەردووكیان (اسم معطوف منصوب وعلامة نصبة الفتحة الظاهرة)ن .

[4] لەم سێ ڕستەیەشدا هەر سێ ناوەكە (ابه واخه وحمها) مجرورن و علامەی جریان كسرەیە.

[5] مانای ئەم شیعرە بەم شێوەیەیە: شوێن باوكی كەوتووە عەدی كوڕی حاتم لە سەخاوەتدا،هەر كەسێكیش وەكو باوكی بێت ستەمی نەكردوە،،،بەڵگەی ئەم شیعرە:لەم دێڕەدا دوو جار ووشەی (اب) بەكارهاتووە، یەكەمیان (بأبه) مجرورە بە كسرە و دوومیشیان (ابه) مفعول به منصوب وعلامەی نصبەكەی فتحەیە،ئەم جۆرە إعرابەش بە (لغەی قصر) ناو دەبرێت.

بە حرکاتی ظاهرە و لێکردنەوەی واو و ئەلف و یا ، خوێندنەوەو إعرابی سێیەم بۆ هەر سێ ناوی (أب وأخ وحم) ئەوەیە کۆتاییان بە ألف بێت : لە حاڵەتی رفع و نصب و جردا وەکو (هذا أباهُ وأخاهُ وحماها[١])، ورأیْتُ اباهُ واخاهُ وحماها[٢]، ومررْتُ بأباهُ وأخاه وحماها[٣] ، ووتەی شاعیریش بەڵگەیە بۆ ئەم ڕایە کە دەڵێت :

ش٦/ إنّ أباها وأبا أباها     قَدْ بلغا في المجد غايتاها[٤]

جا لەم حاڵەتەدا –واتە کە کۆتاییان ئەلفە– علامەتی رفع و نصب و جریان حەرەکەی مقدرە لەسەر ئەلیفەکە هەروەکو ناوێکی مقصور[٥]، ئەم جۆرە خوێندنەوەیە باوترو زۆرترە لە خوێندنەوەی إعرابی دووەم کە ( نقص ) بوو پوختەی ئەوەی دانەر باسی کرد ئەوەیە ناوەکانی (أب و أخ وحم) سێ

---

[١] لەم ڕستەیەدا ووشەی (أباه) خبر مرفوع وعلامه رفعه الضمه المقدره –على الالف منع من ظهورها التعذر ، هەروەها هەردوو ناوی (أخاه وحماها) بەم شێوەیەیە إعرابيان (اسم معطوف مرفوع وعلامه رفعه الضمة المقدره على الالف منع من ظهورها التعذر) .

[٢] لەم ڕستەیەدا ووشەی (أباهُ) مفعول به منصوب وعلامه نصبه الفتحة المقدرة على الالف منع من ظهورها التعذر) هەروەها إعرابی (أخاه وحماها) بەهەمان شێوەیە.

[٣] لەم ڕستەیەدا ناوی (أباه) إعراب دەکرێت بە (اسم مجرور علامة جره الكسرة المقدرة على الالف منع من ظهورها التعذر) هەروەها إعرابی (أخاه وحماها) بەهەمان شێوەیە.

[٤] مانای ئەم شیعرە بەم شێوەیەیە: بێگومان باوکی و باپیری لە ڕێزو حورمەتدا گەیشتنەتە چڵەپۆپەی ، بەڵگە (شاهدی)ی ئەم دێڕە: ووشەی (أباها) سێیەمە (مضاف إليه مجرور وعلامة جره الكسرة المقدرة على الالف منع من ظهورها التعذر) ئەم جۆرە إعرابەش بە (لغەی قصر) ناو دەبرێت.

[٥] اسمی مقصور: بریتیە لەو ناوەی کە معربەو کۆتاییەکەی ئەلیفێکی(ثابت)ە، وەکو ( موسى ، عصا ، فتى .....) ، بۆیە پێی دەوترێت مقصور چونکە الیفی کۆتایی درێژناکرێتەوە بە پێچەوانەی (ممدود) .

جۆر خوێندنەوە و إعرابیان هەیە : باوترینیان ئەوەیە بە حروف بن واتە رفعیان بە واو و نصبیان بە ئەلیف و جریان بە یا ، دووەم : ئەوەیە کە کۆتاییان بە ئەلیف بێت لەهەر سێ حاڵەتەکەدا – رفع و نصب و جر – ئەم ڕایەش پێی دەوترێت ( لغەی قصر ) ، سێ یەم / ئەوەیە حرفەکانیان – واتە واو و ئەلف و یا – لێکرێتەوە و بە حرکات إعراب کرێن ئەم بۆ چوونەش کەم و نادرە .

هەروەها ناوی (هن) دوو خوێندنەوە و إعرابی هەیە . یەکەمیان: إعراب کردنیان بە حرکاتی ظاهرە و لێکردنەوەی (واو و ئەلیف و یا)ـی کۆتاییەکەی ئەم ڕایەش باوتر و زۆرترە ، دووەمیان / إعراب کردنی بە حەرف واتە بە ( واو و ئەلیف و یا ) ئەمەش پێی دەوترێت ( إتمام) و زۆر کەمە.

* مەرجەکانی إعرابی شەش ناوەکە بە حرف (شروط إعراب الاسماء الستة بالحروف)

٣١– وشرطُ ذا الاعراب انْ يُضَفْنَ لا  للیا کجا اخو ابیك ذا اعتلا[1]

زانایانی نحو چوار مەرجیان باسکردووە بۆ إعرابی ئەسمای ستە بە حەرف:

( یەکەم ) دەبێت مضاف[2] بن، خۆمان پاراست لەوەی کە مضاف نیە ، جا ئەگەر مضاف نەبن ئەوە إعرابیان حرەکاتی ظاهرەیە وەکو ( هذا ابٌ ، ورایْتُ اباً ، ومررْتُ بابٍ )[3].

---

[1] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : مەرجی إعراب کردنی ئەسمای ستە بە حەرف ئەوەیە مضاف بن و إضافەکەشی بۆ لای یای متکلم نەبێت ، وەکو ( جاء اخو ابیك ذا اعتلا ) واتە : هات براکەی باوکت کە خاوەن پایەیە ، لەم ڕستەیەدا سێ ناو لە ناوەکانی ئەسمای ستەی تێدایە . {١} اخو : فاعل ومرفوعە ومضافە بۆ لای ابي وە{٢}ابي: مضاف الیە و مجرورە بۆ لای (ك)، {٣} ذا : حال منصوب ومضاف لای ( إعتلاء ) هەر سێ ناوەکە إعرابیان بە حروفە.

[2] مەبەست لە مضاف ئەوەیە ناوێك پاڵدرێ بۆ لای ناوێکی تر.

[3] لەم سێ ڕستەیەدا ناوی (اب) بەکارهاتووە لەهەر سێ حاڵەتی رفع و نصب و جر،بەڵام إعرابەکەی بە حرکاتە چونکە مضاف نیەو مفردە.

( دووەم ) دەبێت إضافە نەکرا بۆ لای یای کەسی یەکەمی تاك (یاء المتکلم) وەکو (هذا أبو زيدٍ و أخوه و حموه)[١] جا ئەگەر إضافە بکرێن بۆ لای یای متکلم ئەوە إعرابیان بە حەرەکاتی مقدرەیە وەکو (هذا أبي ، ورأيت أبي ، ومررْت بأبي) وە إعراب ناکرێن بە حەرف ، دواتر باسی ئەوە دەکرێ کە بە چی إعراب دەکرێن.

(سێیەم ) دەبێت ئەم شەش ناوە وەکو خۆیان بەکاربێن و بچووك (تصغیر) نەکرێنەوە[٢] جا ئەگەر تصغیر کران إعرابیان بە حرکاتی ظاهرەیە وەکو (هذا أُبَيُّ زيدٍ وذُوَيّ مالٍ[٣]، ورأيتُ أُبَيَّ زيدٍ و ذُوَيَّ مالٍ[٤]، ومررتُ بأبي زيدٍ و ذُوَيٍّ مالٍ[٥] ) .

(چـــــوارەم) دەبێت تاك (مفرد) بن ، خۆمان پاراست بەمە لەوەی کە کۆ (جمع) یان دووان (مثنی) بن، جا ئەگەر ئەسمای ستە (جمع)[٦] بوون ئەوە إعرابیان بە حرەکاتی ظاهرەیە وەکو ( هولاءِ آباءُ الزيدين [٧] ،

---

[١] لەم ڕستەیەدا هەرسێ ناوی (أبو، خو،حمو )مرفوعن وعلامەی رفعیان واوە چونکە مضافن وإضافەکەیان بۆلای غەیری یایە

[٢] مەبەست لە(تصغیر) بریتیە لە دەستکاری کردن و گۆڕینی بنچینەی ناوێك بە مەبەستی بچوك کردنەوەی قەبارەی یان ئەندازەی یان بە مەبەستی خۆشویستن یان بە مەبەستی سوك تەماشاکردن (تحقیر)ی ئەو ناوە، لە باسەکانی کۆتاییدا دەخوێنرێن إنشاالله.

[٣] لەم ڕستەیەدا ووشەی (أبيُّ)خبر مرفوعە وعلامەی رفعی ضمەی ظاهرە یە چونکە تصغیرکراوە ، هەروەها (ذوي) تصغیری (ذو)ە .

[٤] لەم ڕستەیەدا ووشەی (أُبَيَّ) مفعول بە منصوب وعلامەی نصبی فتحەی ظاهرەیە ، هەروەها ( ذُويّ ) بەهەمان شێوە.

[٥] لێرەدا ناوی (ابيٍّ) اسمی مجرورە وعلامەی جری کسرەی ظاهرەیە،(ذوي) بەهەمان شێوە.

[٦] لێرەدا مەبەست جمعی تکسیرە، بەڵام هەندێ لەم شەش ناوە بە شاذی دەکرێنە جمعی مذکری سالم،ئەو کاتە إعرابیان وەك جمع مذکری سالم دەبێت ، دیارە تەنها (اب) و ( ذو ) دەکرێنە جمعی مذکری سالم بە شاذی.

[٧] لەم ڕستەیەدا (اباءُ) (خبر مرفوع علامة رفعه الضمة الظاهرة)یە .

ورأيتُ آباءهم[١] ، ومـــررْت بآبائهم[٢] ) وه ئەگەر كراو بە دووان (مثنى) بن ئەوه إعرابيـان وەكو إعرابى (مثنى)يە واتە : مرفوع دەبن بە أليف و منـــصوب و مجرور دەبن بە يا ، وەكـــو ( هذان ابوا زيدٍ[٣] ، ورأيتُ ابويه[٤] ، ومررْتُ بأبويه[٥] ) جا دانەر – ڕەحمەتى خواى لێبێت – لەم چوار مرجەدا تەنها باسى دووانيانى كرد – يەكەم و دووەميان – كە ئاماژەى پێيـان كرد بە ووتەى (وشرط ذا الاعراب انْ يـضفن لا لليا) واتە مەرجى إعراب كردنى ئەسماى ستە بە حەرف ئەوەيە مضاف بێت و إضافەكەشى بۆ لاى غەيرى ياى متكلم بێت ، كەواتە لەم قسەيەوە زانرا كە پێويستە ئەم ناوانە مضاف بن،وە پێويستيشە إضافەكەيان بۆ لاى غەيرى ياى متكلم بێت هەروەها دەتوانرێت دوو مەرجەكەى تريش بناسرێتەوە لە ناوەڕۆكى قسەكەى دانەر ئەوەش بەوە دەزانرێت كە جێناوى ڕستەى(يُضَفْنَ)[٦] ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ناوانەى[٧] باسكران ، ديارە دانەر كە باسى ئەو ناوانەى كـرد بـە (مفـرد) و (مكـبر)ى باسـيانى كـــرد ، وەكـو ئـــەوەى فەرمووييـــەتى (مەرجى إعـــراب كردنى ئەو ناوانە بە حرف ئەوەيە كە مضاف بن بۆ لاى غەيرى ياى متكلم.

---

[١] لە مەياندا (آباءُ) مفعول به منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة،لأنه جمع تكسير.

[٢] بآبائهم: اسم مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة لأنه جمع تكسير.

[٣] (هذانِ ابوا زيدٍ) بەم شێوەيە إعراب دەكرێت : هذانِ: مبتدأ مرفوع وعلامة رفعه الالف لأنه ملحق بالمثنى . ابوا : خبر مرفوع وعلامة رفعه الالف لأنه مثنى وهو مضاف . زيدٍ: مضاف اليه مجرور علامة جره الكسرة.

[٤] رأيتُ: فعل و فاعل. ابويه : مفعول به منصوب وعلامة نصبه الياء لأنه مثنى وهو مضاف. ( ـه ) ضمير متصل، مبني على الكسر في محل جر مضاف اليه.

[٥] بأبويه : ابويْ : اسم مجرور وعلامة جره الياء لأنه مثنى ، وهو مضاف.

[٦] مەبەست لەو جێناوە نونى نسوەى (يُضَفْنَ)يە ، چونكە يُضَف : فعل مضارع مبني على السكون لاتصاله بنون النسوة. ن : ضمير متصل مبني في محل رفع نائب فاعل.

[٧] مەبەست پێى ئەسماى ستەيە

هەروەها بـــزانه (ذو) بەکارنایـــات مەگـــەر بە مضافی،و إضافەش نـــاکرێت بـــۆ لای(ضـــمیر)(١)، بەڵـــکو إضـــافە دەکرێـــت بـــۆ لای ناوێـــکی ئاشـــکرا(ظـاهـر)ی(٢)

ڕەگـــەز (جنـس)(٣) کە صـفە نەبێت وەکو (جاءَني ذو مالٍ)(٤) دروست نیە بڵێین (جاءنی ذو قائمٍ)(٥) .

---

(١) واتا ناتوانین بڵێین : ذوه یان ذوها.

(٢) مەبەست لە ناوی (ظاهر)غەیری ضمیرە، واتا ووشەی ظاهر لە بەرانبەر ضمیردا بە کاردێت.

(٣) مەبەست لە اسمی جنس ئەو ناوەیە دەلالەت لە ڕەگەزی شتێك بکات و بۆ زۆر و کەم بەکاربێت وەکو{علم، مال ، تراب....}وە زۆرتر وایە اسمی جنس لەبەرامبەر(صفە)دا بەکاربێت،مەبەستیش لە صفە اسمی فاعل و اسمی مفعول و صفەی مشبەو صیغەی مبالغەیە.

(٤) لەم ڕستەیەدا (ذو) إضافەکراوە بۆ (مالٍ) ناوێکی ظاهرە و اسمی جنسیشە.

(٥) ئەم ڕستەیە بۆیە دروست نیە چونکە (ذو) إضافەکراوە بۆ لای (قائم) اسمی فاعلەو واتە صفەیە.

***باسی (مثنی)[1] و پاشکۆکانی (ملحقاته)[2]**

**٣٢- بالألِفِ ارفعِ المثنى و كِـــلا إذا بمضمرٍ مضافاً وُصِلا**

**٣٣- كلتا كذاك، اثنان واثنتـــانِ كابْنَيْنِ وابنتَيْنِ يجريـــانِ**

**٣٤- وتخلف اليا في جميعها الالفُ جرًا و نصباً بَعْدَ فتحٍ قد أُلِف[3]**

دانەر-ڕەحمەتی خوای لێبێت- لە باسی ئەو ناوانەی کە إعرابیان بە حروفە و بە حرکات نیە باسی ئەسمای ستەی کرد،پاشان دەستی کرد بە باسکردنی (مثنی) ئەمیش یەکێکی ترە لەو ناوانەی کە إعرابیان بە حروف دەبێت،پێناسەی مثنی بریتیە لە (وشەیەك بەڵگەیە لەسەر دووان، بە زیاد کردنی پاشکۆیەك[4] بۆ کۆتاییەکەی ، گونجاو بێت لێکردنەوەی ئەو پاشکۆیەی[5] و عطف کردنی هاو وێنەی

(١) وشەی (مثنی) بە بە کوردی واتا: کراو بە دووان، کەواتە دەبێت لە بنچینەدا تاك (مفرد) بێت و کرابێت بە دووان بە هۆی زیادکردنی پاشکۆیەك.

(٢) مەبەست لە ملحقی مثنی ئەو ناوانەن کە مانای دووان لە خۆ دەگرن بەڵام گونجاو نین بۆ لێکردنەوەی پاشکۆی کۆتاییان ئەوانیش بریتین لە (کلا وکلتا واثنان واثنتان،هذان،هاتان،اللتان،اللذان).

(٣) لەم سێ دێڕەدا ابن مالك-ڕەحمەتی خوای لێبێت-باسی مثنی و ملحقاتی دەکات {٣٢} بە ئەلیف مرفوع بکە مثنی هەروەها کلا بە مەرجێك کلا إضافە کرابێت بۆ لای ضمیرێکی لکاو {٣٣} کلتا وەکو کلا وایە،هەروەها اثنان و اثنتانیش وەکو ( ابنین و ابنتین) وان -واتە مرفوع دەبن بە ئەلف هەرچەند (مثنی)ش نین. {٣٤} دادەنیشێت (یا) لە جێگەی ئەلیف لەهەموو ئەو ناوانەی کە باسکران لە حاڵەتی جر و نصب دا ، واتە حاڵەتی جر و نصبی مثنی بە (یاء) دەبێت و ئەو یایە لە دوای فتحەوە دێت واتە یای مثنی پێشی مفتوحە.

(٤) مەبەست لەو پاشکۆیە :ئەلف ونون (انِ) یان یاء و نون (ینِ) بۆ ناوە مفردەکە.

(٥) مەبەست لەو پاشکۆیە ئەلیف و نونە بۆ حاڵەتی رفع و یاء و نونە بۆ حاڵەتی نصب و جر.

بۆ سەری[١]، جا کە دەڵێین[٢]( وشەیەك بەڵگە بێت لە سەر دووان) مثنی دەگرێتەوە وەکو (الزیدانِ) هەروەها ئەو وێژانەی دانراوە بۆ دووان وەکو جووت (شفع) وە کە ووتمان[٣] ( بە زیاد کردنی پاشکۆیەك) دەردەچێت وێنەی جووت (شفع)[٤]، وە دەردەچێت بەووتەمان (گونجاو بێت لێکردنەوەی پاشکۆکەی) ووێنەی دووان (اثنان) چونکە گونجاو نیە لێکردنەوەی پاشکۆکەی کۆتایی دروست نیە بڵێی ( اثن )[٥] ، وە دەردەچێت بە ووتەمان (عطف کردنی هاو وێنەی خۆی بۆ سەری) ئەو ناوانەی گونجاون بۆ لێکردنەوەی پاشکۆکەی بەڵام هاو وێنەی خۆی عطف ناکرێتەوە بۆ سەری وەکو (قمرین)[٦] گونجاوە بۆ لێکردنەوەی پاشکۆکەی و دەڵێین (قمر) بەڵام هاو وێنەی خۆی عطف ناکرێتەوە سەری بەڵکو غەیری خۆی عطف دەکرێتەوە سەری وەکو: قمر و شمس،ئەمەیە مەبەست بە (القمرین) چونکە دوو مانگ نیەو یەك مانگ هەیە.

هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی ( بالالف ارفع المثنی ) بۆ ئەوەی کە مثنی مرفوع دەبێت بە ئەلیف،هەروەها پاشکۆکانی (مثنی)ش مرفوعن بە ئەلیف،مەبەست لە پاشکۆی مثنی: ئەو ناوانەن بەکاردێن بۆ دووان بەڵام پێناسەی

---

[١] مەبەست ئەوەیە ئەم دوو ناوە هاو وێنەیە بۆ دوو کەس و دووشتی جیاواز بەکاربێن.

[٢] لێرەوە ابن عقیل-ڕەحمەتی خوای لێبێت- شەرح و ڕاڤەی پێناسەی مثنی دەکات،پێشتر پێناسەی (مثنی) کرد و لێرەوە دەست دەکات بە ڕاڤەی پێناسەکە.

[٣] مەبەست لەو ووتنە پێناسەکەی پێشووە.

[٤] ووشەی (شفع) بە مانای جوت دێت واتا دووان بەڵام ناتوانین بڵێین مثنی یە چونکە پێناسەی (مثنی) نایگرێتەوە.

[٥] واتە:ووشەی(اثنان)ئەگەر پاشکۆکەی لێکرێتەوە مانای مفردەکەی ناگەیەنێت.

[٦] مەبەست لە (قمران) مانگ و خۆرە ، نەك دوو مانگ چونکە یەك مانگ هەیە.

مثنی بەسەریاندا نا چەسپێت، ئاماژەی بۆی کرد دانەر بە ووتەی (وکلا) جا ئەو ناوەی پێناسەی مثنی نەیگرێتەوە و مانای دووان لە خۆ بگرێت ئەوە پاشکۆ (ملحق)ی (مثنی)یە، کەواتە ( کلا و کلتا و اثنان و اثنتان) پاشکۆی مثنایە ، چونکە ئەمانە پێناسەی (مثنی) نایانگرێتەوە،بەلاّم ( کلا و کلتا ) نابنە پاشکۆ مەگەر إضافە کراین بۆلای جێناو(ضمیر) وەکو (جاءنی کلاهما ، ورایتُ کلیْهما ، ومررتُ بکلیْهما[١] وجاءتنی کلتاهما ، ورایتُ کلتَیهما ، ومررْتُ بکلتیهما[٢]، بەلاّم ئەگەر کلا و کلتا إضافەکران بۆ لای ناوێکی ئاشکرا (ظاهر)[٣] ئەوە کۆتاییەکەیان ئەلیف دەبێت لە حالەتی رفع و نصب و جردا وەکو ( جاءنی کلا الرجلین و کلتا المراتین[٤]، ورایتُ کلا الرجلینِ وکلتا المراتینِ[٥]، ومررْتُ بکلا الرجلین وکلتا المراتین[٦] لەبەر ئەمە دانەر فەرمووی (کلا إذا بمضمرٍ مضافاً وصلا)[٧]

---

[١] لێرەدا ووشەی (کلا) لە سێ ڕستەدا بەکار هاتووە لە یەکەمیاندا (فاعل مرفوع وعلامة رفعة الالف لأنه ملحق بالمثنی) وە لە دووەمدا ( مفعول به منصوب وعلامة نصبه الیاء لأنه ملحق بالمثنی . وە لە سێ یەمدا ( اسم مجرور وعلامه جره الیاء لانه ملحق بالمثنی).

[٢] لەم ڕستەیەدا (کلتا) بەکارهاتووە بۆ حالەتی نصب و لە هەردووکیاندا علامەتی نصب و جری یائە.

[٣] مەبەست لە ناوی ئاشکرا (ظاهر) غەیری جێناو (ضمیر)ە.

[٤] لێرەدا (کلا و کلتا) مرفوعن و علامەی رفعیان(الضمة المقدرة علی الالف منع من ظهورها التعذر)

[٥] لەم ڕستەیەشدا (کلا و کلتا) منصوبن و علامەی نصبیان(الفتحة المقدرة علی الالف منع من ظهورها التعذر) .

[٦] لێرەشدا ( کلا و کلتا ) مجرورن و علامەی جریان(الکسرة المقدرة علی الالف منع من ظهورها التعذر).

[٧] واتە(کلا)ئەگەر جێناوی پێوە لکا بوو ئەو کات وەکو مثنی وایە.

دواتر دانەر ئەوەی ڕوونکردەوە کە ( اثنین و اثنتین) وەکو (ابنین و ابنتین) وان کەواتە اثنین و اثنتان پاشکۆی (مثنی)ن وەکو پێشتر باسکرا ، بەڵام ابنان و ابنتان (مثنی)ـی تەواون و پاشکۆ نین.

پاشان دانەر-ڕەحمەتی خوای لێبێت- باسی ئەوەی کرد کە ( یاء ) لە جێی ئەلیف دادەنیشێت لە (مثنی)و پاشکۆکانی لە هەردوو حاڵەتی نصب و جردا ،وە ئەم یائە پێشی مفتوحە هەموو کاتێك وەکو (رایْتُ الزیَدیْنِ کلیْهما[1]، ومررْتُ بالزیَدیْنِ کِلَیْهما[2] جا دانەر خۆی پاراست- بەوەی فەرمووی یای مثنی پێشی مفتوحە – لە یای جمع کە هەمیشە پێشی دەبێت مکسور بێت وەکو (مررتُ بالزیدِیْنَ)[3] دواتر باسی ئەمەش دێت،پوختەی ئەوەی دانەر باسی کرد ئەوەیە کە(مثنی) و پاشکۆکانی مرفوع دەبن بە ئەلیف و منصوب و مجروریش دەبن بە یاء، ئەمەش ڕاو و بۆچوونی باو و بیستراوە ، بەڵام ڕای ڕاست و دروست ئەوەیە کە إعرابی مثنی و پاشکۆکانی بە حەرەکەی مقدرە دەبێت لەسەر ئەلیفەکە لە حاڵەتی رفع ونصب و جردا، جا ئەوەی دانەر باسی کرد لەوەی کە مثنی و پاشکۆکانی مرفوعن بە ئەلیف و منصوب و مجرورن بە یاء ئەوە ڕای باو و بیستراوە لە عەرەبەوە، بەڵام هەندێ لە لە عەرەب پێیان وایە مثنی و پاشکۆکانی مرفوع و منصوب و مجرور دەبن بە ئەلیف، دەڵێن (جاء الزیدانِ کلاهما ، ورایْتُ الزیدانِ کلاهما ، ومررْت بالزیدانِ کلاهما)[4]

---

[1] لەم ڕستەیەدا (الزیَدیْنِ) مثنایە و (کِلَیْهما) پاشکۆیەتی و هەردووکیان منصوبن و علامەی نصبیان (یایە) پێش یائەکە مفتوحە.

[2] لەم ڕستەیەشدا (الزیَدْینِ) مثنایە و (کلیْهما) پاشکۆیەتی و هەردووکیان مجرورن و علامەی جریان یائەو پێش یائەکەش مفتوحە.

[3] لەم ڕستەیەدا (الزیدِینَ) جمعی مذکری سالمە چونکە پێش یائەکە مکسورە.

[4] لێرەدا هەردوو ناوی (الزیدانِ) و (کلاهما) إعرابیان وەکو اسمی مقصور وایە بە حەرەکاتی مقدرە.

* باسی (جمعی مذكر سالم)

٣٥- وارْفَعْ بواوٍ وبيا اجْرُرْ وانْصِبِ سالمَ جمعِ (عامرٍ ، ومُذنِب)[1]

پێشتر دانەر باسی دوو جۆر لەو جۆرانەی کرد کە معرب دەبن بە حروف : یەکێکیان ئەسمای ستە بوو ، دووەمیشیان مثنی بوو ، باسی ئەم دووانە کرا پاشان لەم دێڕەدا باسی جۆری سێ یەم دەکات کە بریتیە لە جمعی مذکری سالم و پاشکۆکانی ، إعرابیشی بە واوە لە حاڵەتی رفع و بە یائە لە حاڵەتی نصب و جردا.

ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی خۆی (عامر و مذنب) بۆ ئەو ناوانەی دروستە بکرێنە جمعی مذکری سالم ، ئەوانیش دوو جۆرن : جامد و صفة[2]، مەرجە بۆ ئەو ناوەی کە جامدە : ناوی (عَلَم)[3] بێت ، بۆ نێرینە(مذکر) بێت خالی بێت لە تای تأنیث ، وە خالی بێت لە لێکدراوی (ترکیب)[4] ، جا ئەگەر ئەو ناوە (عَلَم) نەبوو ئەوە بە واو و نون جمع ناکرێت -واتە ناکرێتە جمع

---

[1] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : مرفوع بکە بە واو و منصوب و مجروریش بکە بە یاء جمعی مذکری سالم بە مەرجێك ئەو ناوەی جمع مذکر سالمی دەکەیت وەکو(عامر) وابێت یان وەکو (مُذنِبٌ). جا (عامر) ناوێکی جامدو بۆ عاقڵ بەکاردێت و مذکرە تای پێوە نیە لێکدراویش نیە ، وە (مُذنب) صفەیە (اسمی فاعله) و بۆ مذکر بەکاردێت و عاقڵەو تای پێوە نیەو لە بابی (أفعل-فعلاء) و (فعلان-فعلی) نیە.

[2] مەبەست لە ناوی (جامد) ئەو ناوانەیە کە وەرنەگیراوە لە(فعل)و(مصدر)ەوە، واتە (مشتق) نیە، وە مەبەست لە صفە ئەو ناوانەن وەرگیراون لە فعل یان لە مصدر واتە ( مشتق )ن ، وەکو اسمی فاعل و اسم مفعول و ... هتد .

[3] مەبەست لە ناوی (عَلَم)) ئەو ناوانەن کە دانراون بۆ کەسێك یان شتێك یان شارێك یان شوێنێك.

[4] مەبەست لە (ترکیب)ئەو ناوانەن کە لە دوو ووشە پێکهاتوون وەکو : عبدالله ، حضرموت ، حمە کریم ....الخ.

مذكر سالم- بۆیه دروست نیه له ناوی (رجل)دا بڵێین (رجلون)[1] ، بەڵێ ئەگەر (رجل) تصغیر كرێت دروسته بكرێته جمع مذكر سالم وەكو (رُجَیْلٌ ، رجیلون) چونكه دەبێته وەصف[2]، هەروەها ئەگەر ناوەكه عەلەم بوو بەڵام بۆ نێرینه بەكار نەدەهات ئەویش جمعی مذكر ناكرێت ، كەواته دروست نیه بۆ ناوی ( زینب ) بڵێین ( زینبون )[3] ، هەروەها ئەگەر ناوەكه عەلەم بوو وه بۆ نێرینەش بوو بەڵام عاقڵ نەبوو ئەویش دروست نیه جمعی مذكر سالم بكرێت ، كەواته درووست نیه بۆ ناوی (لاحق)-كه ناوی ئەسپە- بڵێین لاحقون ، هەروەها ئەگەر ناوەكه تائی تأنیثی پێوه بوو ئەویش درووست نیه جمعی مذكر بكرێت بۆیه درووست نیه بڵێین طلحون بۆ ناوی (طلحة) بەڵام كوفیەكان ئەمه به دروست دەزانن[4]، هەروەها ناوی لێكدراویش ناكرێته جمعی مذكر سالم كەواته دروست نیه بۆ ناوی (سیبویه)[5] بڵێین (سیبویهون) ، هەرچەنده هەندێ له زانایان ئەمه به دروست دەزانن.

---

[1] رجل : اسمی جنسەو ناو نیه بۆ كەسێكی دیاری كراو بۆیه جمعی مذكری سالم ناكرێت .

[2] واته ناوی ( رُجیل ) دەبێته صفەو له اسمی جنس دەكەوێت ، ئەو كاته دروسته جمعی مذكر بكرێت.

[3] زینب : اسمی علمه واتا ناوێكی دیاری كراوه بۆ ئافرەت بەڵام ناكرێته جمعی مذكری سالم.

[4] واته لای كوفیەكان دروسته ئەو ناوانەی كۆتاییەكەیان تای خڕه وەكو (حمزة ، طلحة)-مادام بۆ مذكر بەكاربێت-جمعی مذكری سالم بكرێت.

[5] سیبویه: ناوێكی فارسیەو لێكدراوه له دوو ناو(سیب) و (ویه) به واتای بۆنی سێو دێت ، له زانستی نحو كه دەوترێت سیبویه : مەبەست پێی زاناو پێشەوای نحوه كه

هەروەها بە مەرج گیراوە-بۆ ئەو ناوەی صفەتیە بۆ جمع مذکر سالم : دەبێت ئەو صفەیە بۆ نێرینەی (مذکر) بێت، خالی بێت لە تائی تأنیثی ساکنە، وە لەسەر وەزنی (أفعل ، فعلاء)[1] نەبێت ، هەروەها لەسەر وەزنی (فعلان-فعلی)[2] نەبێت وە لەو صیفەتانە نەبێت کە بەیەکسانی بەکاردێت بۆ نێر و مێ[3]، کەواتە دەردەچێت بە وتەمان (صفە نەبێت بۆ مێینە) ئەو شتەی صفەبێت بۆ مێینە ، بۆیە ووشەی حائض ناکرێتە ئەم جمعەو ناتوانین بڵێین حائضون ، هەروەها دەردەچێت بە وتەمان (عاقل) بێت ئەو ناوانەی صفەتی نێرینەن بۆ غەیری عاقل کەواتە ناوترێت بۆ وشەی سابق -کە صیفەتی ئەسپە- سابقون ، هەروەها دەردەچێت بە وتەمان (خالی بێت لە تائی تأنیثی ساکنە) ئەو سیفەتەی بۆ نێرینەی عاقلە بەڵام تائی تأنیثی

---

ناوی (عمروی کوڕی عثمان) بووە و قوتابی خلیلی کوڕی احمدی فراهیدی بووە، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ.

(١) ئەم وەزنە (افعل-فعلاء) لە زمانی عەرەبیدا صفەی مشبهەیەو یەکەمیان بۆ نێر(مذکر) بەکاردێت و دووەمیان بۆ مێ(مؤنث) بەکاردێت ، بۆ سێ ماناش بەکاردێن کە بریتین لە ڕەنگ (لون)و عەیب و جوانی و ڕازاوەیی لە بابەتەکانی داهاتوودا باسدەکرێت .

(٢) ئەم وەزنە (فعلان-فعلی) بۆ صفەی مشبهە بەکاردێت ، یەکەمیان (فعلان) بۆ مذکرەو و دووەمیان (فعلی) بۆ مؤنثە ، لە ڕووی ماناوە بۆ خالی بوون (خلو) بەکاردێن وەکو : صَدْیان- صَدْیي ، وە بۆ پڕ بوون (امتلاء) بەکاردێت وەکو ( شبعان-شبعی)(ريّان-ريّی)، وە بۆ هەڵچوون وەکو(غضبان-غضبی) دواتر بە تفصیل باسدەکرێت إنشاالله.

(٣) وە لە زمانی عەرەبیدا هەندێ صفە هەن بۆ نێر و مێ بەیەکسانی بەکاردێن وەکو ( جریح ، صبور ، غیور ) واتە بۆ مؤنث تای پێوە ناکرێت و ناوترێت امراةٌ جریحةٌ بەڵکو دەوترێت إمراةٌ جريحٌ.

ساکنەی پێوەیە وەکو (علاَمة)[1] ناتوانین بڵێین (علاّمون). هەروەها دەردەچێت بە ووتەمان (لەسەر وەزنی أفعل فعلاء نەبێت) ئەو صیفەتانەی لەسەر ئەو وەزنەن وەکو (أحمر) کە سیفەتە بۆ پیاوی سوور وە بۆ مێینە (حمراء) بەکاردێت ، جا دروست نیە بڵێین :أحمرون ، هەروەها ئەوەش لەسەر وەزنی فَعْلان فَعْلی بێت دروست نیە جمعی مذکری سالم بکرێت وەکو(سَكْران-سَكْرَى) ناوترێت :سکرانون ، هەروەها ئەگەر صفەکە بەیەکسانی بەکاردەهات بۆ نێر و مێ وەکو(صبور،جريح) دەوترێت : رجلٌ صبورٌ ، وامراةٌ صبورٌ ، ورجلٌ جريحٌ ، وامراةٌ جريحٌ[2]، ناوترێت بۆ جمعی مذکر سالم :صبورون ، جريحون.

جا دانەر-ڕحمەتی خوای لێبێت- ئاماژەی کرد بۆ مەرجەکانی ناوێکی جامد کە پێشتر باسکرا بە ووتەی (عامر)[3] ناوی (عامر) عەلەمە بۆ نێرینەی عاقل و خالیە لە تائی تأنیث و خالیە لە لێکدراوی(التركيب) جمع دەکرێت بە جمعی مذکری سالم و دەوترێت : عامرون . هەروەها ئاماژەی کرد بۆ صفە کە باسکرا بە ووتەی(مذنب)[4] ئەمە صفەیەبۆ نێرینەی عاقل و خالیە لە تائی تأنیث و لەسەر وەزنی (افعل فعلاء) و (فعلان فعلى) نیەو لەو صفەتانەش نیە کە بەیەکسانی بەکاردێن بۆ نێر و مێ ، کەواتە جمعی مذکری سالم دەکرێت و دەوترێت : مذنبون .

---

[1] (علاَمة) واتا زۆر زاناو تائەکەشی تائی مؤنث نیە بەڵکو تائی مبالغەیە.

[2] جريح صفەتەو بە واتای بریندار دێت ، بۆ مؤنث ناڵێین جريحة.

[3] (عامر) لێرەدا اسمی فاعل نیە بەڵکو ناوێکی جامدە وە عەلەمە بۆ کەسێکی نێرینە.

[4] (مذنب) صفەیە چونکە اسمی فاعلەو لەسەر وەزنی(مُفْعِل)ە سیفەتە بۆ کەسێکی نێر نیە، بە واتای تاوانبار دێت .

## *باسى پاشكۆكان (ملحقات)ى جمعى مذكرى سالم

٣٦- وشِبْهِ ذينِ ، وبهِ عشرونا وبابهُ أُلحقَ ، والاهلونا

٣٧- اولوا ، وعالمونَ ، عليّونا وأرَضُون شَذّ ، والسنونا

٣٨- وبابه ، ومثلَ حينٍ قد يردْ ذا الباب وهو عند قومٍ يَطّرِد[1]

ئاماژەی كرد دانەر-ڕەحمەتی خوای لێبێت- بە ووتەی (وشبه ذين) بۆ هاوشێوەی عامر كە بریتیە لە هەموو ناوێكی عَلَم كە مەرجەكانی پێشتر باسكران تێدا بێت وەكو محمد و ابراهيم ، دەڵێت محمدون و إبراهيون ، هەروەها هاوشێوەی مذنب كە بریتیە لە هەموو صفەتێك ئەو مەرجانەی باسكران تێدا بێت وەكو الأفضل و الضُراب[2]، جمعی مذكری سالم دەكرێن

---

[1] لەم سێ دێڕەدا جگە لە ڕستەی یەكەمی دێڕی یەكەم ابن مالك باسی پاشكۆكانی جمعی مذكری سالم دەكات ، جا كورتەی مانای دێڕەكان بەم شێوەیە :

{٣٦} هاو وێنەی(عامر و مذنب) هەمان شێوەی ئەوانن واتە هەر ناوێك وەكو عامر يان مذنب وابێت ئەوە دەبێتە جمعی مذكری سالم ، وە عشرون تا تسعون دەبنە پاشكۆی جمعی مذكری سالم واتە إعرابیان وەكو جمعی مذكری سالم وایە ، هەروەها (الاهلون)ش دەبێتە پاشكۆ(ملحق) چونكە ناوی عَلَمَ نیەو صفەش نیە بەڵكو ناوی جنسە.

{٣٧} هەروەها اولوا كە بەواتای(خاوەنەكان دێت)ئەمیش پاشكۆیە چونكە مفردی نیە ، هەروەها عالمون و عليون و أرضون ئەمانەش پاشكۆن چونكە اسم جنسن واتە : اسمی عەلەم نین و صفەش نین ، هەروەها (سنون).

{٣٨} وە ئەو ناوانەشی وەكو سنونە وان كە بریتین لە ناوێكی سێ حەرفی و لامەكەی واتە حەرفی سێ یەمی حذف كراوە و تایەكی خڕی لەبری دانراوە ، ئەم ناوانە هەندێ جار وەكو (سنين) إعراب دەكرێت واتە بە حەرەكاتی ظاهرة إعراب دەكرێت ئەم إعرابەش لای كۆمەڵێك لە عەرەب زۆرە.

[2] الأفضل : صفەیە چونكە اسمی تفضيلە ، هەروەها (الضرّاب)یش صیغەی مبالغەیە ، كەواتە هەردووكیان مشتقن.

و دەڵێن : الأفضلون و الضرابون ، هەروەها ئاماژەی کرد بە ووتەی( و بە عشرون ) بۆ پاشکۆکانی جمعی مذکری سالم ئەوانەی إعرابیان وەك جمعی مذکری سالم وایە : حاڵەتی رفعیان بە واوە و نصب و جریان بە یائە.
جا پێناسەی جمعی مذکری سالم بریتیە لەو ناوەی تاکەکە(مفرد)ی بە ساغی مابێتەوە و دەستکاری نەکرابێت[1]، وە ئەو مەرجانەی پێشتر باسکران تێدا بێت ، کەواتە هەر ناوێك تاك ( مفرد ) نەبێت واتە تەنها بە جمعی بەکاربێت[2]، یان مفردی هەبێت بەڵام مەرجەکانی جمعی مذکری سالمی تێدا نەبێت ئەوە نابنە جمعی مذکری سالم بەڵکو دەبنە پاشکۆ (ملحق)ی ، کە واتە بیست ( عشرون ) و هاوشێوەکانی کە بریتین لە سی تا نەوەد–هەموویان دەبنە پاشکۆ چونکە مفردیان نیەو ناتوانی بڵێی عِشْرٌ مفردی عشرون ، هەروەها (أهلون ) پاشکۆیە چونکە مفردەکەی (أهل)ـە و ئەو مەرجانەی باسکران بۆ جمعی مذکری سالم تێیدا نیە چونکە أهل ناوی رەگەز (جنس)ـەو جامدیشە وەکو رجل وایە ، هەروەها (أهلون) پاشکۆیە چونکە مفردەکەی(أهل)ەو ئەو مەرجانەی باسکران بۆ جمعی مذکر سالم تێیدا نیە چونکە أهل ناوی رەگەز(جنس)ە و جامدیشە وەکو رجل وایە، هەروەها (اولو) پاشکۆیە لەبەر ئەوەی مفردی نیە ، هەروەها(عالمون) جمعی عَالَم ەو وەکو رجل وایە ناوی جنسەو جامدە هەروەها (علّیون) کە ناوی شوێنی بەرزە لە بەهەشتدا ، پاشکۆیە چونکە مەرجەکانی تێدا نیە و

---

[1] لە زمانی عەرەبیدا دوو جۆر(جمع) هەیە{أ}سالم: ئەوەیە مفردەکە بە ساغی وەك خۆی دەمێنێتەوە ئەویش دوو جۆرە {١}مذکر {٢}مؤنث. {ب} تکسیر:ئەوەیە مفرەدەکە وەکو خۆی نامێنێتەوەو دەستکاری دەکرێت بۆیە پێی دەوترێت(تکسیر).

[2] چەند ناوێك هەیە تەنها بە جمعی بەکاردێت و مفردی نیە، وەکو (قوم، نفر، رهوا...).

لەبەر ئەوەی ناوە بۆ شتێکی نا عاقڵ ، هەروەها أرضُونَ کۆ(جمع)ی (أرض)ە وە أرضیش ناوێکی جنسەو جامدەو مؤنثە ، ئەم ناوانە هەموویان پاشکۆی جمعی مذکری سالمن لەبەر ئەوەی ئەو مەرجانەیان لە خۆ نەگرتووە کە باسکران.

هەروەها دانەر ئاماژەی کرد بە ووتەی (و بابُه) بۆ هاوشێوەکانی (سَنة) کە بریتین لە هەموو ناوێکی سێ حەرفی سێیەم حەرفی[1] حذف کرابێت و لەبری دا هائی تأنیث[2] دانرابێت و جمعی تکسیریش نەکرابێت وەکو : مائة ومئین و ثُبَة وثُبین ،ئەم بەکارهێنانەش [3] زۆرە بۆ ئەم جۆرە ناوانە ، بەڵام ئەگەر کرابووە جمعی تکسیر وەکو شفة وشِفاه[4] ئەو کاتە بەکار نایات وەکو جمعی مذکر سالم مەگەر بە شازی ، وەکو (ظُبة)[5]جمعی تکسیر کراوە کە (ظباة)ە ، هەروەها جمعیش کراوە بە واو بۆحاڵەتی رفع و نصب وجر ووتراوە(ظبون ، ظبین ).

هەروەها ئاماژەی کرد بە ووتەی (ومثل حینٍ قد یرد ذا الباب) بۆ ئەوەی کەسنین و هاوشێوەکانی هەندێ جار کۆتاییان تەنها بە یائو نونە و إعرابەکەی لەسەر نونی کۆتایی دەبێت -بەحەرەکاتی ظاهرە- دەڵێت : هذه سنینٌ[6]، ورأیتُ سنیناً[7]، ومررْت بسنینٍ[8]، وە دەتوانی تنوینەکەی

---

[1] مەبەست لامی کلمەیە چونکە سێ حەرفی پێکهاتووە لە (فاء و عین و لام) .

[2] مەبەست بەها لێرەدا تائی تأنیثی خرە.

[3] واتە بەکارهێنانی وەکو پاشکۆی جمعی مذکری سالم.

[4] لێرەدا شفە هاوشێوەی سنەیە بەڵام کراوەتە جمعی تکسیر چونکە(شِفاه)جمعی تکسیرە.

[5] ظبة : واتا / تیژی شمشێر.

[6] هذه سنین:بەم شێوەیە إعراب دەکرێت: هذه : اسم إشارة مبني علی الکسر في محل رفع مبتدا،،سنینٌ : خبر مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة .

[7] سنیناً: مفعول به منصوب وعلامة نصبة الفتحة الظاهرة.

حذف کەیت ، ئەم حذفی تنوینە کەمترە لە نوسینی ، جا زانایان خیلافیان هەیە دەربارەی زۆر بەکارهێنانی[١] سنین و هاوشێوەکانی بەم شێوەیە[٢]،وە ڕای ڕاست ئەوەیە ئەم بەکارهێنانە زۆر نیەو یاسا دارنیە(قیاس) نیە بەڵکو تەنها بیستراو(سماعی)ـە[٣]، لەم شێوە بەکارهێنانەیە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) : (اللهم اجعلها عليهم سنيناً كسنينِ يوسُفَ )[٤] لە یەکێك لە دوو گێڕانەوەکانیدا[٥] ، هەروەها وتەی شاعیریش وێنەی ئەمەیە کە دەڵێت :

---

[٨] سنينِ : اسم مجرور علامه جره الكسرة الظاهرة.

[١] ووشەی (يَطّرِد) دوو مانای هەیە : یەکەمیان : (قیاسی) یاسادارە ، دووەمیان : (يستعمل كثيراً ) بە کاردێت بە زۆری .

[٢] واتا بەکارهێنانی وەك ناوێکی مفرد لەڕووی إعرابەوە واتە إعراب کردنیان بەحرکاتی ظاهرە.

[٣] ووشەی (سماعی) مەبەست پێی ئەویە یاسای دیاری کراوی نیە و چۆن بیستراوە لە عەرەبەوە بەو شێوەیە بەکاردێت.

[٤] ئەم فەرموودەیە ئیمامی (البخاري) ڕوایەتی کردوە، یەکێکە لە دوعاکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە بێباوەڕانی قوڕەیش، پوختەی ماناکەی (ئەی خودایە تووشی گرانە ساڵیان بکەی وەکو گرانە ساڵی سەردەمی یوسف) إعرابی فەرموودەکە بەم شێوەیە : اللهم : منادى حذف منه حرف النداء وعوض عنه الميم مبني على الضم في محل نصب ، اجعَلها: اجعلْ : فعل امر (للدعاء)مبني على السكون ، وفاعله ضمير مستتر تقديره انت./ها/ ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب مفعول به ، عليهم : جارو مجرور متعلقان بالفعل اجعلها ، سنيناً : مفعول به ثانٍ منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة ، كسنين : ك/ حرف جر للتشبيه. سنين / اسم مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة وهو مضاف، يوسف : مضاف اليه مجرور وعلامة جره الفتحة بدل الكسرة لأنه ممنوع من الصرف.

<u>الشاهد فيه</u> : قوله (ﷺ) (سنيناً) جعل إعرابه على النون ، فجاء منصوباً بالفتحة ، وهذا مقصور على السماع.

ش٧/ دعانيَ من نجدٍ ، فإنّ سنينهُ  لعبْنَ بنا شيباً وشيبننا مُرْدا[1]

بەڵگەی ئەمەیە سنین وەکو حین إعراب کراوە بە حرکاتی ظاهرە و نونەکەی ماوەتەوە لەگەڵ ئەوەی إضافەش کراوە[2] .

* باسی حەرەکەی نونی جمع و نونی مثنی

٣٩- ونُونَ مجموعٍ وما به التحق  فافْتح ، وقَلّ مَن بكسره نطق

٤٠- ونُونَ ما ثُنّيَ والملحق بـه  بعكس ذاك استعملوه فانْتبه[3]

نونی جمعی مذکری سالم و پاشکۆکانی مفتوحە ، بەڵام هەندێ جار بە شاذی کسرە دار دەکرێت ، ووتەی شاعیریش بەڵگەی ئەمەیە کە دەڵێت :

ش٨/ عرفنا جعفراً وبني ابيه  وانكرنا زعانفَ اخرينِ[4]

---

[5] مەبەست ئەوەیە فەرموودەکە بە دوو شێوە گێڕدراوەتەوە، یەکێکیان ئەوەبوو کە باسکرا ، دووەمیشیان بەبێ تنوینە (اجعلها سنينَ كسني يوسف).

[1] واتای ئەم دێڕە بە کورتی : بەجێیان هێشتم لە ناوچەی نجد-کە ڕۆژگارەکانی زۆر ناڕەحەت بوون-ساڵەکانی ژیانم لە ناوچەی نجد پیریان کردم و لاوێتیان نەهێشتم.

بەڵگە(شاهد)ی: ووشەی(سنينه) منصوبەو علامەی نصبی فتحەی ظاهرەیە و نونەکەی ماوەتەوە لەگەڵ ئەوەی إضافەکراوە.

[2] نونی جمعی مذکری سالم و نونی مثنی لە کاتی إضافەدا حذف دەکرێن ،دواتر لە باسی إضافەدا دەخوێنرێت.

[3] لەم دوو دێڕەدا ابن مالك باسی حەرەکەی نونی جمع و نونی مثنی دەکات :

{٣٩} نونی جمعی مذکری سالم و پاشکۆکانی مفتوح بکە و کەمن ئەوانەی بە مکسوری خوێندویانەتەوە، {٤٠} بەڵام نونی مثنی و پاشکۆکانی بە پێچەوانەوە بەکارهاتووە ئاگادار بە ، واتە نونی مثنی مکسورەو هەندێ لە عەرەبیش بە مفتوحی بەکاریان هێناوە.

[4] کورتەی مانای ئەم دێڕە شیعرە : ئێمە جعفر و براکانی ئەناسین و کەسانی پاشکۆ و دواکەوتو ناناسین، بەڵگە (شاهد)ی ئەم دێڕە: بەکارهێنانی نونی کۆتایی (اخرينِ)

هەروەها ووتەی شاعیریش كە دەڵێت:

ش٩/ اكلَّ الدهرِ حِلٌ وارتحالٌ          أما يبقي علي ولايقيـــني
وماذا تبتغي الشعراءُ مـــني          وقد جاوزتُ حَدّ الأربعينِ[1]

جا مكسور كردنی نونی جمعی مذكری سالم شازە و لغە و خوێندنەوەیەكی تەواوە نیە[2] ، ووتەی شاعیریش بەڵگەی ئەمەیە كە دەڵێت:

ش١٠/ على احوذيّينَ استقلَتْ عشيةً          فما هي إلاّ لمحةٌ وتغيبُ[3]

بەپێی قسەی ئاشكرای دانەر بێت-ڕەحمەتی خوای لێبێت-مفتوح بوونی نوونی مثنی وەكو مكسور بوونی نون لە (جمعی مذكری سالم)دا شاذە، بەڵام وانیە بەڵكو مفتوح بوونی نوون لە مثنی دا لغەو خوێندنەوەیەكی تەواوە[4]، وەكو باسمان كرد جا ئایا مفتوح بوونی نونی مثنی تایبەتە بە

---

بە مكسوری كە جمعی مذكری سالمە و لە بنچینەدا دەبێت نونەكەی مفتوح بێت ، بەڵام لێرەدا بە شاذی بە مكسوری بەكارهاتووە.

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕە : شاعیر مەدحی خۆی دەكات و دەڵێت چۆن شاعیران دەتوانن فریوم دەن و فێڵم لێبكەن لە كاتێكدا من خاوەن ئەزمون و ئاگاداری فڕوفێڵ و دوژمنانم و تەمەنی چل ساڵیم تێپەڕاندوە.

بەڵگە(شاهد)ی ئەم شیعرە:وشەی(الأربعین) پاشكۆی جمعی مذكری سالمەو نونەكەی بەمكسوری بەكارهێناوە وئەمەش شاذە

[2] بەپێچەوانەی ئەوانەی پێیان وایە ، هەروەها نونی مثنی و پاشكۆكانی مكسورە ، بەڵام ـ مفتوح كردنی لغەو خوێندنەوەیەكی تەواوە ، ووتەی شاعیریش....

[3] كورتەی مانای ئەم شیعرە: ئەو قەتێیە لەسەر دوو باڵە چكۆلەكەی بەرزبویەوە بە خێرای و لە چاو تروكاندنێكدا دەڕوات و دەفڕێت ، بەڵگە(شاهد)ی ئەم شیعرە:وشەی (احوذ یینَ) مثنایەو نونەكەی بە مفتوحی بەكارهێناوە.

[4] شاذ : ئەوەیە پێچەوانەی یاسا بێت ، بەڵام (لغة) پێچەوانەی یاسا نیە بۆ خۆی دەبێتە ڕای وەرگیراو و ئیش پێكراو.

یاء و نون یان بە ئەلیف و نوونیش[٥]، بەپێی قسەی ئاشکرای دانەر ڕای دووەم تەواوترە ، ووتەی شاعیریش بەڵگەیە بۆ ئەمە کە دەڵێت :

ش١١/ اعرف منها الجِيد والعينانا ومنخرينِ أشبها ظبيانا[١]

جا ووتراوە ئەم دێڕە شیعرە – واتە شاهیدی ژمارە ١١–هەڵبەستراوە و نابێتە بەڵگە.

* باسی جمعی مؤنثی سالم :

٤١– وما بتا والفٍ قَدْ جُمِعا يُكْسرُ في الجر وفي النصب معاً[٢]

کاتێك دانەر لێبوویەوە لە قسەکردن لەسەر ئەو شتانەی إعرابیان بە حروفە لە جیاتی حرکات ، دەستی کرد بەباسی ئەو شتانەی کە حەرەکە لە جێی حەرەکەی تر دادەنیشێت ، ئەویش دوو جۆرە : جمعی مؤنث سالم وەکو: مسلمات ، جا بە کۆت(قید)ـی (سالم) خۆمان پاراست لە جمعی تکسیر ، جمعی تکسیریش : بریتیە لەو ناوەی کە کۆ کرابێت و مفردەکەی بە ساغی نەما بێتەوە وەکو : هنود ، جا دانەر –رەحمەتی خوای لێبێت– ئاماژەی کرد بۆ جمعی مؤنثی سالم بە ووتەی (وما بتا والفٍ قد جمعا) واتا ئەو ناوانەی جمع کرابن بە ئەلیف و تای زیاد کراو ، کەواتە دەردەچێت وێنەی قضاة[٣] چونکە ئەلیفەکەی زیاد کراو نیە ، بەڵکو وەرگێڕاو (منقلب)ـی یایە ، چونکە ئەصلی قضاة ( قُضَيَةٌ )ە ، یا ئەکەی ئەصلیە ، جا مەبەستی ئێمە ئەوەیە ئەو ئەلیف و تائە ببێتە هۆی جمع کردنی ئەو ناوە

---

[٥] یاء و نون بۆ حاڵەتی نصب و جرە و ئەلیف و نونیش بۆ حاڵەتی رفعە.

[١] واتای ئەم دێڕە بەم شێوەیەیە : من دەناسم چاوی و گەردنی و لووتی وەك ئاسك وایە، بەڵگە(شاهد)ـی ئەم دێڕە: ووشەی (العينانا)مثنایەو نونەکەی مفتوحە .

[٢] لەم دێڕەی ئەلفیەدا ابن مالك باسی جمعی مؤنثی سالم دەکات و دەڵێت : ئەو ناوانەی بە ئەلیف و تای زیاد کراو کرابێتن بە کۆ (جمع) مکسور دەبێت لە حاڵەتی جر و نصب دا.

[٣] قضاة : جمعی کسیرە و مفردەکەی (قاضی)ە.

وەكو(هندات) كەواتە خۆ پارێزرا بەوە لە وێنەی (قضاة وأبيات) بێگومان هەر یەك لەم دوو ناوە كۆتاييیەكەيان ئەليف و تايە ، بەلاّم نابنە جمعی مؤنثی سالم، چونكە بوون بە جمعی ئەو دوو ناوە بە هۆی ئەليف و تای زیاد كراوەوە نيە بەڵكو بەهۆی وەزن و صيغەكەوەيە[1] ، كەواتە بەم ڕوونكردنەوەيە لا دەچێت ئەو ڕەخنەی هاتۆتە سەر دانەر بە وێنەی ( قضاة ، وأبيات )[2] ، وە زانرا كە پێويستی نەكرد دانەر بڵێت (بألف و تاءٍ مزيدتين) چونكە بائی حرفی جری (بِتا) پەيوەست (متعلق)ـە بە ووتەی (جُمِعَ)ـەوە[3].

جا حوكمی مؤنثی سالم ئەوەيە مرفوع دەبێت بە ضمە و ،منصوب دەبێت بە كسرە ، وەكو : (جاءنی هنداتُ ، ورأيت هنداتِ ، ومررتُ بهنداتٍ) كەواتە كسرە دانيشتوە لە جێی فتحە ، وە هەندێ لە زانايان ووتويانە جمعی مؤنثی سالم لە حاڵەتی نصبدا مبنيە ، بەلاّم ئەم بۆ چوونە هەڵەيە چونكە هيچ هۆكارێك نيە بۆ مبنی بوونی[4].

---

[1] چونكە جمعی سالم بەهۆی زیاد كردنی پاشكۆيەك بۆ مفردەكەی دەبێت ، بەلاّم جمعی تكسير بە هۆی وەزن و شێوازی ووشەكەوە دەبێت.

[2] لەبەر ئەوەی ابن مالك فەرمووی ئەوەی بە هۆی ئەليف و تاوە جمع كرێت ، جا هەر دوو ناوی ( قضاة وأبيات) كۆتاييیەكەيان ئەليف و تايە ، بەلاّم ئەم ئەليف و تايە زیاد كراو نين ، لە قضاة دا ئەليفەكە ئەصليەو لە ابيات دا تايەكە ئەصليە چونكە مفردەكەی (بيت)ـە.

[3] لە زمانی عەرەبيدا حەرفی جر ئەگەر ئەصلی بێت –واتە زائدە نەبێت– دەبێت پەيوەست (متعلق) بێت بە فعلێك يان مصدرێك يان اسمێكی مشتق وەكو اسمی فاعل و مفعول و صيغەی مبالغە و هتد ، جا بەهۆی ئەو پەيوەست بوونەوە ئەم حرفی جرو اسمە مجرورەكەی مانا پەيدا دەكەن ، وە ابن مالك فەرمووی (وما بتا والفٍ قد جُمِع) (بتا) جارو مجرور ومتعلقە بە فعلی (جمع)ـەوە ، كەواتە ماناكەی وای لێدێت ( هەر ناوێك بە هۆی ئەليف و تای زیاد كراوەوە جمع كرێت ... ).

[4] پێشتر لە باسی مبنی دا ووتمان هەر ناوێك مبنی بێت دەبێت هۆكارێك هەبێت بۆ مبنی بوونی هۆكارەكەش بريتی بوو لە (لێكچوون لە حەرف).

* باسی پاشکۆ (ملحق)ـی جمعی مؤنثی سالم

٣٥- كذا اولاتُ والذي اسماً قد جُعِل كأذرعاتٍ فيه ذا ايضاً قُبِل[١]

ئاماژە دەکات بە ووتەی ( كذا اولات ) بۆ ئەوەی کە ( أولات )[٢] وەکو جمعی مؤنثی سالم وایە حاڵەتی نصبی بە کسرە دەبێت[٣] ، بەڵام جمعی مؤنثی سالم نیە بەڵکو پاشکۆیەتی ، چونکە ووشەی (أولات) مفردی نیە لە لفظی خۆی[٤].

پاشان ئاماژەی کرد بە ووتەی (والذي اسماً قَدْ جُعِل) بۆ ئەوەی کراوەتە ناو لە جمعی مؤنثی سالم و پاشکۆکەی[٥]، وەکو (أذرعات) منصوب دەبێت بە کسرە هەروەکو چۆن پێش ئەوەش بکرێتە ناوی شوێنێك منصوب بووە بە کسرە وە تنوینەکەشی لێناکرێتەوە ، نمونە (هذه اذرعاتٌ ، ورأيتُ اذرعاتٍ ، ومررْتُ بأذرعاتِ)[٦]، ئەمەش ڕای تەواوە بۆ ئەم جۆرە ناوانە[٧] ، وە دوو

---

[١] لەم دێڕەی ئەلفیەدا باسی پاشکۆکانی جمعی مؤنثی سالم کراوە کە دوانن (أ) ووشەی اولات کە بە مانای خاوەنەکان بۆ مێینە (صاحبات) دێت بۆیە پاشکۆیە چونکە مفردی نیە ، (ب) هەر ناوی شتێك کە کۆتاییەکەی (ئەلیف و تا) بێت وەکو (أذرعات ، عرفات) جا کورتەی مانای دێڕەکە : هەروەها (اولات) وەکو جمعی مؤنثی سالم وایە لە إعرابدا – وە ئەوەش کراوەتە ناو وەکو –اذرعات– ئەم إعرابە قبول دەکات.

[٢] ووشەی (اولات) واتە (صاحبات) خاوەنەکان بۆ مێینە بە کاردێت.

[٣] دیار و ئاشکرایە کە رفعیان بە ضمەیە وجریشیان بە کسرەیە.

[٤] بەڵام لە مانادا مفردی هەیە کە بریتیە لە (صاحبة) بەڵام لە لفظی خۆی مفردی نیە.

[٥] هەندێ جار لە زمانی عەرەبیدا فعلێك یان مصدرێك یان هەر ناوێکی وەرگیراو(مشتق) دەکرێتە ناوی عەلەم واتە ناوی کەسێك یان شوێنێك یان هەر شتێك.

[٦] لێرەدا (أذرعات) کە ناوی شارێکە لە وولاتی شام ، لە سێ ڕستەدا بەکار هاتوە لەیەکەمیاندا (خبر مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة) وە لە دووەمدا (مفعول به منصوب وعلامة نصبه الكسرة بدل الفتحة) وە لە سێیەمیشدا (اسم مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة).

ڕای تریش هەن : یەکێکیان : ئەوەیە کە مرفوع بن بە ضمە و منصوب و مجروریش بن بە کسرە بەلاّم تنوینەکەی لێدەکرێتەوە ، وەکو (هذه اذرعاتُ ، ورایتُ اذرعاتِ ، ومررْتُ باذرعاتِ) ، دووەمیان : ئەوەیە مرفوع دەبێت بە ضمە و منصوب و مجروریش دەبێت بە فتحەو تنوینەکەشی حذف دەکرێت[1] ، وەکو ( هذه اذرعاتُ ، ورایت اذرعاتَ ، ومررْت باذرعاتَ)، ئەم دێڕە شیعرەش گێڕدراوەتەوە – بە هەرسێ ڕایەکە :

ش١٢ / تَنَوَّرْتُها من اذرعاتٍ ، واهلُها     بیثربَ ، ادنی دارها نَظَر عالي[2]

لێرەدا ووشەی (اذرعات) بە کسرە و تنوین کۆتاییەکەی خوێندراوەتەوە ئەمە ڕای یەکەمە ، وە بەکسرە و بێ تنوین ئەمەش رای دووەمە ، هەروەها بە فتحەی بێ تەنوین ئەمیش ڕای سێ یەمە[3] .

---

[7] مەبەست ئەو ناوانەیە کە کۆتاییەکەیان ئەلیف و تایە و بوون بە عەلەم.

[1] واتە دەکرێتە ممنوع من الصرف کە دواتر باسی دەکەین إن شاءالله.

[2] مانای ئەم دێڕە شیعرە بە کورتی : ئاگرێکم بینی- مەبەستی ماڵی خۆشەویستەکەیەتی- لە شاری اذرعاتەوە ، لە کاتێکدا ئەوان لەشاری یثرب (مەدینەی منەوەرە) بوون ماڵە نزمەکانیش بەرز بوون ، ئەمە جۆرێکە لە درۆی خۆشەویستی.

بەڵگە (شاهد)ی ئەم دێڕە : ووشەی (اذرعاتِ) لەم شیعرەدا بە سێ شێوە گێڕدراوەتەوە ، بۆ هەر سێ ڕایەکە بەڵگەیە.

[3] کەواتە ئەو ناوانەی کۆتاییان ئەلف و تای زیاد کراوە و کراوەنەتە (عَلَم) سێ ڕا لە إعرابیاندا هەیە:

( أ ) إعراب کردنیان وەکو جمعی مؤنثی سالم بە تنوینەوە ، ئەمەش ڕای تەواوە.

( ب ) إعراب کردنیان وەکو جمعی مؤنثی سالم بەبێ تنوین.

( ج ) إعراب کردنیان وەکو ممنوع من الصرف لەبەر ئەوەی عەلەمن و مؤنثن ( للعَلَمیّة والتأنیث).

* باسی ناوی ممنوع من الصرف

٤٢- وَجُرّ بالفتحة مالا يَنْصَرِفُ          مالمْ يُضَفْ أو يكُ بَعْدَ (الْ) رَدِفْ[1]

ئاماژە دەکات بەم دێڕە بۆ جۆری دووەم لەو ناوانەی کە حەرەکە لە جێی حەرەکەی ئەصلی دادەنیشێت لە إعرابدا ، ئەویش بریتیە لە ناوی (ممنوع من الصرف) حوکمی ئەم ناوەش ئەوەیە مرفوعە بە ضمە وەکو (جاءَ أحمدُ) وە منصوبە بە فتحە وەکو (رأيتُ أحمدَ) وە مجروریشە بە فتحە وەکو (مررتُ بأحمدَ) کەواتە فتحە لە جێی کسرە دەبێت لە حاڵەتی جردا ، بە مەرجێك ئەم ناوە إضافە نەکرابێت هەروەها ئەلیف و لامیشی پێوە نەبێت ، جا ئەگەر إضافە کرا ئەوە مجرور دەبێت بە کسرە وەکو (مررْت بأحْمَدِكُم)[2] ، هەروەها ئەگەر ئەلیف و لامیشی لەسەر بوو وەکو (مَرَرْتُ بالأحمدِ) لەم کاتەدا مجرور دەبێت بە کسرە.

* باسی ئەفعالی خمسە :

٤٤- واجْعَلْ لنحو (يَفْعلانِ) النُّونا          رَفْعاً ، وَتَدْعِينَ و تَسْألونا

٤٥- وحَذفُها للجزم والنّصب سِمَة          كَلَمْ تكوني لتَرومي مَظْلمَة[3]

---

[1] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: مجرور کراوە بە فتحە ئەو ناوانەی (ممنوع من الصرف)ن بە مەرجێك مضاف نەبن و ئەلیف و لامیان پێوە نەبێت ، کەواتە ئەگەر إضافە بکرێن یان ئەلیف و لامیان پێوە بوو ئەوە مجرور دەبنەوە بە کسرە، هەروەکو لە شەرحەکەدا باس دەکرێت .

[2] مررْت / فعل و فاعل، بأحمد / ب/ حرف جر ، أحمدِ / اسم مجرور وعلامه جره الكسرة وهو مضاف ، كم/ في محل جر مضاف إليه.

[3] لەم دوو دێڕەدا ابن مالك باسی ئەفعالی خمسە و حوکمەکەیان دەکات ، ماناکەی (٤٤): بگێڕە بۆ وێنەی (يفعلان) نون بۆ حاڵەتی رفع و ، وە بۆ وێنەی (تدعين

كاتێك لێبوويەوە لە قسەو باسی ئەو ناوانەی لە إعرابی ئەصلی دەردەچن و لە جێگەيان شتێكی تر دادەنيشێت لە إعرابياندا دەستی كردە باسی ئەو فعلانەی لە إعرابی ئەصلی دەردەچن[1] ، ئەوانيش بريتين لە پێنج فعلەكە (الأفعال الخمسة) يان (الأمثلة الخمسة)، جا ئاماژەی كرد بە (يفعلان) بۆ هەموو فعلێكی مضارع كە ئەليفی اثنين لە خۆ بگرێت جا ئەگەر سەرەتايی فعلە مضارعەكە ياء بێت وەكو(يضربان) يان تاء بێت وەكو (تضربانِ) ، هەروەها ئاماژەی كرد بە ووتەی (تدعينَ)[2] بۆ هەموو فعلێكی مضارع كە يائی مخاطبە ی پێوە لكابێت وەكو (أنتِ تضربينَ)[3] ، هەروەها ئاماژەی كرد بە ووتەی (وتسألون) بۆ هەموو فعلێكی مضارع كە واوی جماعەی پێوە لكا بێت ، (انتم تضربون)[4] ، جا ئەگەر سەرەتاكەی تاء بيت وەكو نمونەی بۆ هێنرايەوە ، يان ياء بێت وەكو (الزيدون يضربون).

---

وتسألون)ش ، (٤٥) وە حذف كردنی نون نيشانەی حاڵەتی جزم و نصبە وەكو= =نمونەی (لم تكوني لترومي مظلمة)، واتە تۆ مەبەستت ستەم كردن نەبوو . إعرابی ئەم نمونەيە لە كتێبەكە كراوە.

[1] إعرابی ئەصلی فعلی مضارع ئەوەيە مرفوعە بە ضمةو منصوب بە فتحە و مجزومە بە سكون.

[2] (تدعين) مضارعی (دعا)يە بۆ ئافرەت بە كاردێت و لەسەر وەزنی (تفعلين)ـەيە.

[3] اعرابی تەواوی ئەم ڕستەيە (انت تضربين) بەم شێوەيەيە : انتِ / ضمير منفصل مبني فی محل رفع مبتدا، تضربين/ فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الأفعال الخمسة ، والياء أي ياء المخاطبة / ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل ، والجملة الفعلية ( تضربين ) في محل رفع خبر.

[4] انتم تضربون : بەم شێوەيە إعراب دەكرێت : انْتُم / ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدا. تضربون / فعل مضارع مرفوع وعلامه رفعه ثبوت النون لأنه من الافعال الخمسة، واو الجماعة / ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل، والجملة والفعلية في محل رفع خبر.

کەواتە پێنج فعلەکە بریتین لە (يَفْعَلانِ ، تَفْعلانِ ، ويَفْعَلُونَ ، وتَفْعَلُونَ ، تَفْعَلِيْنَ)[1] ئەم پێنجە هەموو کات مرفوع دەبن بە نون (ثبوت النون) وە منصوب و مجزوم دەبن بە حذفی نون ، کەواتە نون دانراوە لە جێی ضمە ، وەکو (الزيدانِ يَفْعلانِ) يفعلان لێرەدا : فعل مضارع وعلامة رفعه ثبون النون، وە منصوب و مجروریش دەبێت بە حذف کردنی نون وەکو (الزيدانِ لَنَ يقوما ، ولَمْ يَخْرجا) لەم دوو فعلەدا (يقوما ، يخرجا) علامه نصبی يقوما وجزمی يخرجا حذفی نونە ، ئەم ئایەتەش نمونەیە ﴿فإنْ لم تَفْعَلُوا ولَنْ تَفْعَلُوا فاتَّقوا النَّارَ﴾[2].

* باسی إعرابی ناوە بزوێنەکان ( الاسماء المعتلة )

٤٦- وسَمِّ مُعتلاً مِنَ الاسماء ما كالمَصْطَفى والمُرْتَقِي مَكارما

٤٧- فالأولُ الاعرابُ فيه قُدِّرا جميعُهُ ، وهو الذي قد قُصِرا

---

[1] واتە ئەم پێنجە وەزنن ، هەر فعلێك لەسەر یەكێك لەم پێنجە بێت دەبێتە ئەفعالی خمسە.

[2] ئایەتی ٢٤ ی سورەتی بقرە. کورتەی ماناکەی جا ئەگەر ئەمەتان نەکرد-مەبەستی هێنانی هاوشێوەی قورئانە- وە هەرگیز نایشیکەن دە خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی... إعرابی ئەم ئایەتە بەم شێوەیەیە : فإن / ف / حسب ما قبلها. إنْ/ شرطية جازمة. لم/حرف نفي وجزم وقلب . . تفعلوا / فعل مضارع مجزوم بـ( لم ) وعلامة جزمه حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة وهو فعل الشرط، والواو / في محل رفع فاعل، ولن/ و:حرف عطف / لن / حرف نصب وتوكيد، /تفعلوا/ فعل مضارع منصوب بـ(لن) وعلامة نصبه حذف النون لأنه من الافعال الخمسة، والواو/فاعل...فاتقوا/ف/ واقعة في جواب الشرط... اتقوا / فعل أمر مبني على حذف النون لأنه من الافعال الخمسة وهو (جواب الشرط)، والواو / في محل رفع فاعل ، النار/مفعول به منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة.

٤١- والثانی مَنْقُوصٌ ، ونصبُهُ ظَهَرْ        ورفعُهُ يُنْوى ، كذا أيضاً يُجَر[١]

دەستی کرد بەباس کردنی ناو و فعلە بزوێنەکان ، باسی ئەوەی کرد کە وێنەی ( المصطفی والمرتقِي ) پێیان دەوترێت معتل ، جا ئامازەی کرد بە (المصطفی) بۆ ئەو ناوانەی کۆتاییەکەیان ئەلیفێکی ئەصلیە و پێشی فتحەیە وەکو ( عَصَا ، رَحَى ) هەروەها ئامازەی کرد بە ( المرتقي ) بۆ ئەو ناوانەی کۆتاییەکەیان یایەکی ئەصلیەو پێشی کسرەیە وەکو ( القاضي ، الداعي ) ، پاشان ئامازەی کرد بۆ ئەو ناوەی کۆتاییەکەی ئەلیفە و پێشی فتحەیە بەوەی کە هەموو حەرەکەکانی تێدا مقدرە واتە لە حاڵەتی رفع و نصب و جردا -فتحە و ضمە و کسرەکان دەرناکەون ، جا بەم جۆرە ناوانە دەوترێت (مقصور) کەواتە مقصور: بریتیە لەو ناوەی کە معربەو کۆتاییەکەی ئەلیفێکی ئەصلیە ، کەواتە خۆ پارێزرا بە (الاسم)[٢] لە فعل وەکو (يَرضَى)[٣] ، وە بە (المعرب) لە المبنی وەکو : (إذا)[٤]، وە بە وتەمان (الالف) لە (المنقوص) وەکو (القاضي) ، هەروەها بە (لازمة) خۆپارێزرا لە (المثنی) لە حاڵەتی رفع ، وەکو (الزيدان)[٥]

---

[١] کورتەی مانای ئەم سێ دێرە ئەلفیە بەم شێوەیە : (٤٦) ناو بنە معتل ئەو ناوانەی وەکو مصطفی و مرتقی وان. (٤٧) جا یەکەمیان واتە -مصطفی- إعراب تێیدا مقدرە لە هەموو حاڵەتێکدا - واتە لە حاڵەتی رفع و نصب و جردا- وە ناوی (مقصورە) چونکە ئەلفی کۆتایی بە کورتی دەخوێنرێتەوە. (٤٨) دووەمیش -واتە مرتقی- پێی دەوترێت منقوص ، بەڵام حاڵەتی نصبی بە فتحەی ظاهرە یە، وە حاڵەتی رفع و جری بە ضمە و کسرە ی مقدەرەیە.

[٢] لێرەوە ابن عقیل - ڕەحمەتی خوای لێبێت - شەرحی پێناسەی مقصور دەکات.

[٣] یرضی : کۆتایەکەی ئەلیفە بەڵام نابێتە مقصور چونکە فعلە واسم نیە.

[٤] إذا : کۆتاییەکەی ئەلیفی ئەصلیە بەڵام نابێتە مقصور چونکە مبنیە و معرب نیە.

[٥] الزيدانِ : کۆتاییەکی ئەلیفە بەڵام ئەلیفەکەی زیاد کراوە و ئەصلی نیە بۆیە مقصور نیە.

بێگومـان ئـەم ئـەلیفی (الزیـدان)ـە ئەصـلی نیـەو کاتیـە ئـەوەتا دەبێتـە یـاء لـە حاڵەتی جرو نصبدا وەکو : رأیْتُ الزیدینِ.

هەروەها ئاماژەی کرد بە ووتەی (والثانی منقوص) بۆ ناوی (المرتقـي) کە ناوێکی منقوصـە ، کەواتە ناوی منقوص بریتیـە : لەو ناوە معرەبەی کە کۆتاییەکـەی یایـەکی ئەصـلی و جیانـەبووەوە (لازم)ـەو پێـشی کـسرەیە، وەکو (المُرْتَقِي) ، کەواتە خۆ پارێزرا[1] بە ناو لە فعل وەکو یَرْمِـي[2] ، وە بە (المعرب) لە مبنی وەکو الـذي[3]، وە بە ووتـەمان ( پێـشی کسرە بێت) لەو ناوەی پێشی سکونە وەکو (ظبْيٌ ورميٌ) ئەم دوو ناوە معتلن بەڵام إعرابیان وەکو ناوێکی صحیح وایە لەوەی مرفوع دەبن بە ضمەی ظاهرە و منصوب دەبن بە فتحەی ظاهرە و مجروریش دەبن بە کسرەی ظاهرە.

جا حوکمی ناوی منقوص ئەوەیە لـە حاڵـەتی نصبدا فتحەکـەی ظـاهرە و وەکو (رأیْتُ القاضِيَ) ، خـوای گـەورە دەفەرمـوێت ﴿ یـاقَوْمَـنا أجیبـوا داعـيَ الله ﴾[4] ، بـەڵام حاڵـەتی رفـع و جـری مقـدرە چـونکە ضـمةو کـسرە

---

[1] لێرەوە ابن عقیل –رحمه الله تعالی– شەرحی پێناسەی منقوص دەکات.

[2] یرمی : کۆتاییەکەی یای ئەصلیە بەڵام منقوص نیە چونکە فعلەو اسم نیە.

[3] الذي : کۆتاییەکەی یای ئەصلیە بەڵام منقوص نیە چونکە مبنیەو معرب نیە.

[4] ئایەتی (٣١) ی سورەتی الاحقاف، کورتەی ماناکەی : جنۆکەکان کە گوێیان لە پێغەمبەری خوا بوو مسوڵمان بوون و گەڕانەوە ناو قەومەکەیان و ووتیان– ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگخوازی خوای گەورە بدەنەوە.

إعرابی ئەم ئایەتە بەم شێوەیەیە : یا / حرف نداء مبني علی السکون لا محل لها من الاعراب ، قومَ/ منادی منصوب وعلامة نصبه الفتحه الظاهرة وهو مضاف ، نا/ضمیر متصل مبني علی السکون فی محل جر مضاف الیه ، اجیبوا / فعل أمر مبني علی حذف النون لأنه من الافعال الخمسة، واو الجماعة/ فی محل رفع فاعل، داعيَ / مفعول به منصوب علامه نصبه الفتحة الظاهرة وهو مضاف ، اللهِ / مضاف الیه مجرور

لەسەر یاء قورسن وەکو ( جاء القاضي ، ومررْتُ بالقاضي ) لەم دوو ڕستەیەدا لە یەکەمیاندا علامەتی رفعی ضمةی مقدرە لە سەر یاء ، وە لە دووەمدا علامەی جری کسرەی مقدرە لەسەر یاء.

کەواتە زانرا لەوەی باسکرا ناو نیە کۆتاییەکەی واو بێت و پێشی ضمە بێت ، بەڵێ مەگەر مبنی بێت وەکو هُوَ ، بەڵام ناوی معرب نیە کۆتاییەکەی واو بێت و پێشی ضمە بێت مەگەر شەش ناوەکە (الاسماء الستة) لە حاڵەتی رفعیان دا وەکو (جاء أبوه) بەڵام کوفییەکان بە دروستی دەزانن- ناوێکی معرب کۆتاییەکەی واو بێت و پێشی ضمە بێت لە دوو جێگەی تردا :- یەکەمیان : ئەو فعلانەی کراونەتە ناو وەکو یغزُو ، یدعُو[1] ، دووەم: ئەو ناوانەی عەرەبی نین ( أعجمی )ن وەکو (سَمَنْدُو ، قَمَنْدُو)[2] .

* باسی فعـــلی معتل :

٤٩- وايُّ فـعـلٍ آخـر مـنه الـف      أو واوٌ ، أو ياءٌ فمعتلا عُرف[3]

ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە فعلی معتل ئەوانەن حرفی کۆتاییان واو بێت و پێشی ضمە بێت وەکو : یغزُو ، یان حەرفی کۆتایی یاء بێت و پێشی کسرە بێت وەکو : یرمِي ، یان حەرفی کۆتاییان ئەلیف بێت و پێشی فتحە بێت وەکو : یخشَی.

---

وعلامة جره الكسرة الظاهرة . الشاهد في هذه الآية/ ظهور علامة النصب (الفتحة) على الاسم المنقوص (داعيَ).

[1] واتە ئەگەر ناو نرا کاك یغزو یان کاك یدعو.

[2] سمندو و قمندو ناوی شارن.

[3] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : هەر فعلێك کۆتاییەکەی ئەلیف بێت یان کۆتاییەکەی واو بێت یان یاء بێت ئەوە بە فعلی معتل ناسراوە.

* حـــوكمی فعلی معتل :

٥٠– فالألفَ انوِ فيـه غــير الجــــزمِ وأبدِ نصبَ ما كيدعو يرمي

٥١– والرفع فيهما انوِ ، واحذف جازما ثلاثهنّ تقضي حكـما لازما[1]

لەم دوو دێڕەدا باسی چۆنیەتی إعرابی فعلی معتل دەكات ، باسی ئەوەی كرد ئەو فعلەی كۆتاییەكەی ئەلیف بێت حاڵەتی رفع و نصبی مقدرە وەكو ( زيدٌ يخشَى ) مرفوعە و علامەی رفعی ضمەی مقدەرەیە لەسەر ئەلیفەكە ، و ( لَن يخشَى ) لێرەشدا يخشى : منصوبەو علامەی نصبی فتحەی مقدەرەیە لەسەر ئەلیفەكە ، بەڵام حاڵەتی جزم حەرەكەكەی ئاشكرایە چونكە لە حاڵەتی جزمدا حەرفی كۆتایی ئەلیفەكە حذف دەكرێت وەكو ( لَمْ يَخْشَ ).

هەروەها ئاماژەی كرد بە ووتەی ( وأبدِ نصبَ ما كيدعو يرمي ) بۆ ئەوەی لە حاڵەتی نصبدا حەرەكەی ( فتحە ) دەردەكەوێت لەو فعلەی كۆتاییەكەی واو و ياء بێت وەكو (لن يدعوَ ، ولن يرميَ )[2] ، هەروەها ئاماژەی كرد بە ووتەی ( والرفع فيهما انْوِ ) بۆ ئەوەی كە لە حاڵەتی رفعدا ضمە مقدرەیە لەسەر واو و ياء ، هەروەها ئاماژەی كرد بە ووتەی ( واحذف جازماً ثلاثهنّ) بۆ ئەوەی حەرفی كۆتایی هەر سێ جۆرە معتلەكە كە بریتیە لە – ئەلیف و واو و ياء – لە حاڵەتی جزمدا حذف دەكرێن وەكو ( لم يَخْشَ ، ولم يغزُ ، ولم يَرمِ ) كەواتە علامەتی جزم لێرەدا حذفی ئەلیف و واو و يايە.

---

[1] مانای ئەم دوو دێڕە (٥٠) جا ئەو فعلەی كۆتاییەكەی ئەلیفە لە غەیری حاڵەتی جزم حەرەكاتی مقدر بكە ، هەروەها ئاشكرا بكە حەرەكەی نصبی ئەو فعلانەی وەكو يدعو و يرمی وان، (٥١) بەڵام حاڵەتی رفع مقدر بكە لە وێنەی يدعو و يرمی دا ، علامەتی جزمی هەر سێكیان حذفی حرفی كۆتاییە، وابكە بڕیارێكی دامەزراوت داوە.

[2] يدعو و يرمي / هەردوو كیان فعلی مضارعن و(لن) لە پێشیانەوە هاتووە و منصوبی كردوون وعلامەی نصبیان فتحەی ظاهرەیە.

پوختەی ئەوەی باسی کرد : علامەی حاڵەتی رفع –ضمە– مقدرە لەسەر ئەلیف و واو و یاء، وە علامەتی جزم دەردەکەوێت لە کۆتایی هەر سێکیانەوە بەوەی حەرفی علەکە حذف دەبێت ، هەروەها علامەتی نصب (فتحە) دەردەکەوێت لەسەر یاء و واو ، بەڵام لەسەر ئەلیف مقدر دەبێت.

## ( النكرة و المعرفة )

## ( ناوی نەناسراو و ناوی ناسراو )

٥٢– نكرةٌ : قابلُ ال ، مؤثرا     او واقعٌ موقع ما قَدْ ذُكِرا[(١)]

ناوی نەناسراو (النکرة) : بریتییە لەو ناوەی ئەلیف و لام ( ال ) وەردەگرێت و ماناکەشی دەگۆڕێت و دەیکاتە ناسراو ، یان ناوێکە دادەنیشێت لە جێی ئەو ناوەی ( ال ) وەردەگرێت ، جا نمونەی ئەو ناوەی ئەلیف و لام وەردەگرێت و بەهۆیەوە دەبێتە ناسراو (رجل) دەڵێیت : الرجل[(٢)] ، جا خۆ پارێزرا بە ووتەی ( ماناکەی بگۆڕێت لە نەناسراوییەوە بۆ ناسراوی ) لەو ناوەی ئەلیف و لام وەردەگرێت بەڵام بەهۆی ئەلیف و لامەکەوە نابێتە ناسراو وەکو (عبّاس) کە ناوی کەسێك بێت دەڵێیت ( العباس ) ئەلیف و لام دەچێتە سەری و بەڵام نایکاتە ناسراو ، چونکە (عباس) بۆ خۆی ناوێکی ناسراوە[(٣)] پێش ئەوەی ئەلیف و لام بچێتە سەری ،

---

[(١)] مانای ئەم دێرە : ناوی نەناسراو ئەوەیە کە ئەلیف و لام وەردەگرێت و ماناکەی دەگۆڕێت بۆ ناسراوی ، یان ناوێکە بۆ خۆی ئەلیف و لام وەرناگرێت بەڵام لە جێی ناوێکی ترە کە ئەلیف و لام وەردەگرێت.

جا ناوی نەناسراو لە زمانی کوردیدا بە پاشگری (ەکە) دەکرێتە ناسراو، وەکو: پیاو – پیاوەکە .

[(٢)] الرجل : ناسراوە واتە پیاوەکە . بەڵام رجل: نەناسراوە واتە پیاو.

[(٣)] عباس : ئەگەر علم بێت بۆ کەسێك ئەوە ناسراوە ، بەڵام ئەگەر صفە بێت ئەوە صیغەی مبالغەیەو نەناسراوە.

وەنمونەی ئەو ناوەی کە بۆ خۆی ئەلیف و لام وەرناگرێت بەڵام لە جێی ناوێکە ئەلیف ولام وەردەگرێت ( ذُو ) کە بە مانای خاوەن ( صاحب ) بێت ، وەکو (جاءني ذو مالٍ ) واتا خاوەن ماڵ ، جا ذو نەناسراو ( نكرة )ـەیە بۆ خۆی ئەلیف و لام وەرناگرێت بەڵام لە جێی (صاحب) دادەنرێت ، وە (صاحب) ئەلیف و لام وەردەگرێت وەکو الصاحب[1] .

٥٣- وغَيرُهُ معرفةٌ : كَهُمْ ، وذي وهند ، وابني ، والغلام والذي[2]

واتە جگە لە ناوی نەناسراو ناوی ناسراو( معرفة )ـەیە ، معرفەش شەش جۆرە (١) جێناو ( المضمر ) وەکو : هُمْ ، (٢) اسمی إشارە وەکو : ذي، (٣) ناوی عەلەم (العلم ) وەکو : هند ، (٤) ئەو ناوانەی ئەلیف و لامیان پێوەیە وەکو : الغلام ، (٥) اسمی موصول وەکو : الذي ، (٦) هەر ناوێك إضافە کرابیت بۆ لای یەکێك لەو پێنجە وەکو ابنی[3] جا لەمەو دوا باسی هەر یەك لەم شەش جۆرە دەکەین.

---

[1] یان وەکو ناوی ( مَنْ ) ناوێکی نەناسراوە و ئەلیف و لام وەرناگرێت بەڵام لە جێی ناوێکی تر دادەنیشێت کە ئەلیف و لام وەردەگرێت.

[2] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە : غەیری نکرە معرفەیە ، کە ئەویش شەش جۆرە وەکو : هُمْ نمونەیە بۆ ضمیر ، وذي نمونەیە بۆ اسمی اشارە ، وهند نمونەیە بۆ علم ، وە ابني نمونەیە بۆ مُعَرَّفْ بالاضافة ، الغلام نمونەیە بۆ معرف بـ(ال) ، والذي نمونەیە بۆ اسمی موصول.

[3] ئەمەش پێی دەوترێت ( المعرّف بالإضافة ) واتە کراوە بە ناسراو بەهۆی إضافەوە، ابن بۆ خۆی ناوێکی نەناسراوە بەڵام کە إضافە کراوە بۆ لای جێناوی لکاوی کەسی یەکەم ( ی ) بوە بە ناسراو.

*** باسی جۆری یەکەمی معرفة کە بریتیە لە جێناو( الضمیر ) یان (المضمر)[١]**

**٥٤- فما لذي غَيبةٍ او حُضورِ كأنْتَ ، وهو- سمٌّ بالضمير[٢]**

ئاماژە دەکات بەوەی کە جێناو : یان بۆ کەسی سێیەم-نائامادە- ( غيبة ) وەکو : هُو، یان بۆ ئامادەیە ئەمیش دوو جۆرە : یەکەمیان : جێناوی کەسی دووەمی تاك -دووێندراو- (مخاطب) وەکو : أنت ، دووەمیش بۆ کەسی یەکەمی تاك -قسەکەرە- (متكلم) وەکو انا.

*** باسی جێناوی لکاو :**

**٥٥- وذو اتصالٍ منْـهُ مالا يُبتدا ولايلي إلاّ اختياراً أبداً**

**٥٦- كالياء والكافِ مِنْ (ابني أكرمك) والياء والهاء مِن (سَلِيه ما مَلَكَ)[٣]**

---

[١] ضمير یان مضمر بە کوردی پێی دەوترێت : ڕاناو یان جێناو ، جا لە زمانی عەرەبیدا ضمير دوو جۆرە (أ) ئاشکرا (بارز) ئەوەیە کە دەنوسرێت و دەخوێنرێتەوە ئەمیش دەبێت بە دوو جۆرەوە(١) لکاو (٢)سەربەخۆ ، (ب) نادیار (مستتر) ئەوەیە ناخوێنرێتەوە ئەمیش دوو جۆرە (١) واجب الاستتار (٢)جائز الاستتار ، دواتر باسیان دەکەین، إنشاء الله.

[٢] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: جا ئەو ناوە ناسراوەی بەکار بێت بۆ نائامادە یان بۆ ئامادە وەکو انت وهو، ئەوە ناونە جێناو.

[٣] ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە باسی جێناوی لکاو دەکات : (٥٥) جێناوی لکاو ئەوەیە لەسەرەتای قسەوە نایات و هەروەها ناکەوێتە دوای ( إلاّ )ـوە لە قسەی هەڵبژێراوی زانایاندا. (٥٦) وەکو یاء و کاف لە رستەی ( ابني اكرمك ) کوڕی من ڕێزی گرتی، هەروەها وەکو هاء ویاء لە ڕستەی ( سليه ما ملَكَ ) واتە : تۆ داوای لێبکە ئەوەی هەیەتی ، إعرابی ئەم دوو ڕستەیە لە پەراوێزی کتێبەکەدا کراوە.

جێناوی ئاشكرا ( الضمير البارز ) دابەش دەبێت بۆ لكاو (متصل)[1] ، سەربەخۆ (منفصل) جا جێناوی لكاو بریتیە لەو جێناوەی لەسەرەتای ڕستەوە نایات وەكو كافی ( اكرمكَ ) و هاووێنەی ، هەروەها نابێت لە دوای ( إلاّ)ـوە بێت لەسەر قسەی هەڵبـژێراوی زانایان ، كە واتە دروست نیە بوترێت : ما اكرمْتُ إلاكَ ، بەلاّم بە شاذی[2] هاتووە لە شیعردا ، وەكو وتەی شاعیر دەڵێت :

ش١٣ / اعوذُ بربّ العرش مِنْ فئة بغَتْ     عليّ فمالي عَوْضُ إلاّهُ ناصِرُ[3]

هەروەها وتەی شاعیریش كە دەڵێت :

ش١٤ / وما علينا –إذا ما كُنْتِ جارتنا–     انْ لا يُجاورنا إلاّكِ ديّارُ[4]

---

[1] جێناوی لكاو لە زمانی عەرەبیدا سێ جۆرە : (ا) جێناوی لكاوی حاڵەتی رفع : ئەم جۆرە تەنها دەلكێتە فعلەوە وە ژمارەیان دە یەكە بریتین لە {تُ ، تَ ، تِ ، نا ، تُمْ،تما، تُنّ ، الف الاثنين ، واو الجماعة ، ن (نون النسوة) } هەموو كاتێك إعرابیان بەم شێوەیەیە (ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل) . (ب) جێناوی لكاوی حاڵەتی نصب : ئەم جۆرەش دەلكێتە فعلەوە و ژمارەیان دوانزەیە {ي ، نا ، ها ، كَ ، كِ ، كما، كُنّ ، ه ، ها ، هما ، هُمْ ، هُنّ} هەموو كاتێكیش بەم شێوەیە إعراب دەكرێت (ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به)

(ج) جێناوی لكاوی حاڵەتی جر: ئەم جۆرەش یان دەلكێتە اسمەوە یان حرفی جرەوە ژمارەشیان دوانزەیە بریتین لە ( ي ، نا ، كَ ، كِ ، كما ، كمْ ، كُنّ ، ه ، ها ، هما ، هُم ، هُنّ ) جا ئەگەر لكابوون بە اسمەوە ئەوە إعرابیان (ضمير متصل مبني في محل جر مضاف اليه) وە ئەگەر لكابوون بە حەرفی جرەوە (ضمير متصل مبني في محل جر اسم مجرور) .

[2] شاذ / واتە پێچەوانەی یاسا ( قاعدة ).

[3] مانای ئەم دێرە : پەنا دەگرم بە پەروەردگاری عەرش لە تاقمێك ستەم و دەست درێژیم لێدەكەن ، هیچ پەنایەكم نیە تەنها ئەو نەبێت ، بەڵگە (شاهد)ی : ووشەی (الاّهُ) جێناوی لكاو بە (إلاّ)ـوە هاتووە بە شاذی.

[4] مانای ئەم دێرە بە كورتی : ئەگەر تۆ هاوسێمان بیت گوێ نادەین كەسی تر هاوسێمان نەبێت ، بەڵگە (شاهد)ی ئەم دێرە : ووشەی (إلاّكِ) بەكارهێنانی جێناوی لكاو بە (إلاّ)ـوە بە شاذی.

*** حوکمی جێناوەکان لە ڕووی معرب و مبنی بوونەوە :**

**٥٧- وكُلّ مضمرٍ له البنا يجب    ولفظ ما جُرّ كلفظِ ما نُصِب[١]**

جێناوەکان هەموویان مەبنین لەبەر ئەوەی لە حەرف دەچن لە ڕووی نەگۆڕییانەوە[٢]، بۆیە نەبچووك (تصغیر) دەکرێن و وە نە دەکرێنە دووان وە نە دەکرێنە کۆ ، کەواتە کە زانراو دڵنیا بووین لەوەی مبنین ، جا هەیانە هاوبەشە بۆ حاڵەتی جرو نصب بەیەك (لفظ) ئەویش بریتیە لە هەموو جێناوێکی لکاوی حاڵەتی نصب و جر وەکو : اکرمتكَ[٣] ، ومررتُ بكَ[٤] ، وإنّهُ ولَهُ[٥] ، جا لێرەدا کافی (اکرمتُكَ) لە جێی ناوێکی منصوبە کە (مفعول بە)یە ، هەروەها لە (بكَ)دا لە جێی ناوێکی مجرور ، هەروەها جێناوی هاء لە (إنّه) لە جێی ناوێکی منصوبە کە اسمی (انّ)یە ، وە لە (لَهُ)دا لە جێی ناوێکی مجرورە.

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : هەموو جێناوێك واجبە مبنی بێت ، ئەو جێناوەی بۆ حاڵەتی جر بەکاردێت بەهەمان شێوەش بەکاردێت بۆ حاڵەتی نصب.

[٢] نەگۆڕ واتە (جامد) بوون وەکو چۆن حەرف هەموویان نەگۆڕن و دەست کاری ناکرێن بەوەی بکرێنە دووان یان کۆ یان هەر شتێکی تر جێناوەکانیش وان ، هەروەها لە ڕووی دانانیشەوە (الوضع) وەکو پێشتر باسمان کرد.

[٣] إعرابی تەواوی ڕستەیە بەم شێوەیە (اکرمتُكَ) بەم شێوەیە *-بەباشی لەبەری بکە-*: اکرمْ : فعل ماضی مبنی علی السکون لاتصاله بضمیر رفع متحرك ، تُ: ضمیر متصل مبنی علی الضم فی محل رفع فاعل ، كَ : ضمیر متصل مبنی علی الفتح فی محل نصب مفعول به.

[٤] مررتَ بك : مررْتُ : فعل و فاعل. بكَ/ ب:حرف جر. كَ/ ضمیر متصل مبنی علی الفتح فی محل جر اسم مجرور.

کەواتە جێناوی لکاوی (ك) بەیەك شێوە بەکارهاتووە بۆ حاڵەتی نصب لە (اکرمتك) وە بۆ حاڵەتی جریش لە (بكَ).

[٥] (إنّه ، له) جێناوی لکاوی (ه) بەکارهاتوە بۆ حاڵەتی نصب لە (إنه)و بۆ حاڵەتی جریش لە (لَهُ).

هەروەها جێناوی لکاو هەیە بەکاردێت بۆ حاڵەتی رفع و نصب و جر بەیەك شێوە ، کە ابن مالك ئاماژەی بۆ دەکات بە ووتەی :

٥٨- للرَّفْعِ والنَّصبِ وجرٍّ (نا) صَلَحْ          كاعْرِفْ بِنا فإنَّنا نِلْنا المنح[١]

واتە گونجاوە ووشەی (نا) بۆ حاڵەتی رفع وەکو (نِلْنا) [٢] وە بۆ حاڵەتی نصب وەکو (فإنَّنا)[٣]، بۆ حاڵەتی جر وەکو (بِنا).

یەکێکی تر لەو جێناوانەی بەکاردێت بۆ حاڵەتی رفع و نصب و جر بریتیە لە (یاء)[٤]، نمونەی حاڵەتی رفع وەکو : اضربي[٥] ، نمونەی حاڵەتی نصب وەکو (اكرَمَني)[٦] ، نمونەی حاڵەتی جر وەکو (مرّ بي)[٧] .

هەروەها جێناوی (هُمْ) بەکاردێت بۆ هەر سێ حاڵەتی رفع و نصب و جر ،

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : بۆ حاڵەتی رفع و نصب و جر جێناوی لکاوی (نا) گونجاوە وەکو ڕستەی (اعرف بنا فإننا نلنا المنح) ، واتە بمانناسە بێگومان ئێمە بە دەستمان هێناوە بەخشندەیی.

[٢] نلْنا / پێکهاتووە لە فعلی ( نِلْ ) کە لە (نالَ ، یَنالُ)ـەوە وەرگێڕاوە لەگەڵ فاعلێك کە جێناوی لکاوی (نا)یە.

[٣] إننا / إعرابی تەواوی بەم شێوەیە : إنّ : حرف مشبه بالفعل -یان- حرف نصب وتوكيد، /نا/ ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب اسم إنّ.

[٤] مەبەست جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکە کە (ي)ـە.

[٥] لێرەدا (اضربي) فعلی امرەو مبنیە لەسەر حذفی نون ، جێناوی (یاء) دەبێتە (ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل).

[٦] اكرمني: اكرمَ : فعل ماضي مبني على الفتح وفاعله : ضمير مستتر تقديره (هو)، و النون : نون الوقاية ، والياء : ضمير متصل مبني في نصب مفعول به.

[٧] مَرّبي: مَرَّ : فعل ماضي مبني على الفتح وفاعله ضمير مستتر تقديره (هو)، بي / ب: حرف جر ، ي :ضمير متصل مبني في محل جر اسم مجرور.

نمونـەی حالـەتی رفـع وەکـو (هُـمْ قـائمُون)[1] نمونـەی حالـەتی نـصب وەکـو (اکرَمتُهم)[2] ، نمونەی حالەتی جریش (لهم).

جا دانەر بۆیە باسی جێناوی (یاء) و (هم)ـی نەکرد چونکە ئەو دووانە لە هەموو ڕوویەکەوە لە جێنـاوی (نـا) ناچـن لەبەر ئەوەی (نا) بەکاردێت بـۆ حالـەتی رفـع و نـصب و جـر بەیـەك مانـا[3] و لەهـەر سـێ حالەتەکەشـدا جێنـاوی لکـاوە بـە پێـچەوانەی جێنـاوی (یـاء) هەرچـەندە بـەکاردێت بـۆ حالەتی رفع و نصب وجر لەهەر سێ حالەتەکەشدا جێناوی لکاوە بەلاّم بەیەك مانا نایات ، چونکە لە حالەتی رفع دا بۆ دوێندراو (خطاب)ـە واتا بـۆ کەسی دووەم بەکاردێت ، وە لـە حالـەتی نـصب و جـردا بـۆ کەسـی یەکـەم (مـتکلم) بـەکاردێت[4] ، هـەروەها جێنـاوی (هُـمْ) هـەر چـەندە لەهـەر سـێ حالەتەکەدا بەیەك مانا بەکاردێت – بەلاّم وەکو جێنـاوی (نـا) نیـە چونکە (هُم) لە حالەتی رفعدا جێناوی سەربەخۆ (منفصل)ـە و لـە حالـەتی نـصب و جردا لکاوە[5].

---

[1] ئەم جملەیە جملەیەکی تەواوەو پێکهاتوە لە (هُمْ) کە (ضمیر منفصل مبني في محل رفع مبتدا) قائمون : خبر مرفوع وعلامة رفعه الواو لأنه جمع مذکر سالم.

[2] اکرمتهم : جملەیەکی فعلیه : اکرمْ: فعل ماضي مبني علی السکون، تُ: ضمیر متصل مبني في محل رفع فاعل. هُمْ : ضمیر متصل مبني فی محل نصب مفعول به.

[3] کە بریتیە لەکەسی یەکەمی کـۆ (جمع متکلم).

[4] واتا جێناوی (یاء) بۆ دوو مانای بەکاردێت بە پێچەوانەی جێناوی (نا) کە یەك مانای هەیە.

[5] واتا: جێناوی (هُمْ) جیاوازی لەگەڵ جێناوی (نا) دا لەوەدایە کە (نا) هەموو کاتێك جێناوی لکاوە ، بەلاّم جێناوی (هُمْ) لە حالەتی رفع دا سەربەخۆ (منفصل)ـە.

* باسی جێناوی ( ئەلـــف و واو و نــــــون )

٥٩- والفٌ والواو والنونُ لما غابَ وغيرِهِ كقاما و اعْلَما[1]

جێناوی ئەلیف و واو و نون جێناوی لکاون بۆ حاڵەتی رفع بەکاردێن[2] ، بۆ کەسی سێهەم و بۆ کەسی دووەم ، جا نمونەی کەسی سێهەم (غائب) وەکو (الزیدانِ قاما ، والزیدونَ قاموا ، والهنداتُ قُمنَ) ئەم قسەیەی دانەر کە فەرمووی و (غیره) دەگرێتەوە ( مخاطب و متکلم)یش بەڵام ئەم قسەیە بەم شێوەیە جوان نیە[3]، چونکە ئەم سێ جێناوە هیچ کاتێك بۆ (متکلم) بەکار نایات ، بەڵکو تەنها بۆ غائب و مخاطب بەکاردێن وەکو نمونەمان هێنایەوە.

* باسی جێناوی نادیار ( الضمیر المستتر )

٦٠- ومِنْ ضمیرِ الرفعِ ما یستَتِرُ کافعلْ أُوافقْ نغتبطْ إذْ تَشْكُرُ[4]

---

[1] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : جێناوی ئەلیف مەبەست پێی (الف الاثنین)ە ، وە جێناوی واو مەبەست پێی (واو الجماعة)ەیە و جێناوی نون مەبەست پێی (نون النسوه)یە ، بەکاردێت ئەم سێ جێناوە بۆ کەسی سێهەم -غیبة-و کەسی دووەم -خطاب- نمونەی کەسی سێیەم وەکو قاما ، وە نمونەی کەسی دووەم وەکو (اعلما).

[2] هەر سێ ناوەکە بەم شێوەیە إعراب دەکرێت (ضمیر متصل مبنی فی محل رفع فاعل) .

[3] بەڵام ئیمامی سیوطي -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەفەرموێت دانەر بە هێنانەوەی نمونەی (قاما و اعلما) جێناوی کەسی یەکەم (متکلم)ی جیاکردۆتەوە کە وابوو هیچ ڕەخنەیەك نایەتە سەر قسەی دانەر.

[4] واتای ئەم دێڕەی ئەلفیە : هەندێ جێناوی حاڵەتی رفع نادیار دەبن و هیچ کات ئاشکرا نابن وەکو جێناوی فعلی (إفعل) کە (أنتَ)یەو جێناوی فعلی (أُوافق) و کە (أنا)یەو جێناوی فعلی (نغتبط) کە (نحن)ەوەو جێناوی فعلی (تشکر) کە (أنت)یە ، جا مانای ئەم ڕستەیە (افعل اوافق نغتبط إذ تشکر) بەم شێوەیەیە : ئەنجام بدەو منیش هاو ڕاتم و دڵخۆش دەبین کاتێك سوپاسی دەکەیت).

جێناو دابەش دەبێت بۆ نادیار (مستتر)[1] ، وە بۆ دیار (بارز)[2] ، هەروەها جێناوی نادیاریش دابەش دەبێت بۆ نادیاری واجب و نادیاری جائز ، جا مەبەست لە جێناوی نادیاری جائز ئەوەیە کە دەکرێت ناوێك جێگەی بگرێتەوە[3] ، مەبەست لە جێناوی نادیاری واجب ئەوەیە کە ناکرێت ناوێك لە جێی ئەو ناوە دابنیشێت ، جا دانەر لەم دێڕەدا باسی ئەو شوێنانە دەکات کە جێناوی نادیار تیایاندا واجبە چوارن :

یەکەم / فعلی امر بۆ کەسی دووەمی تاك بێت نێریش بێت (المخاطب) وەکو افْعَل واتا –انت– ئەم جێناوە نادیارە دروست نیە ئاشکرا بکرێت چونکە ناکرێت ناو لە جێی دانرێت و ناوترێت : افعلْ زیدُ ، بەڵام ڕستەی (افعَلْ انت) جێناوی (انت) لێرەدا دەبێتە توکید بۆ جێناوە نادیارەکەی ( افعل ) و نابێتە فاعلی افعل[4] ، چونکە دروستە (افعل) بەبێ (انت)و ماناشی هەیە ، بەڵام فعلی امر ئەگەر بۆ کەسی دووەمی تاکی مێ (مخاطبة) بێت یان بۆ دووان بێت یان بۆ کۆ بێت ئەوە جێناوەکەی ئاشکرا دەبێت و نادیار نابێت وەکو : اضربا ، اضربوا ، اضْرِبْنَ.

دووەم / هەموو فعلێکی مضارع بە همزە دەست پێ بکات وەکو (أُوافقُ)[5] واتا : أُوافقُ انا ، جا ئەگەر لە ڕستەکەدا لە دوای فعلەکەوە هات وەکو (اوافق انا) ئەو کاتە (انا) دەبێتە توکیدی جێناوە شاراوەکە.

---

[1] مەبەست لە نادیار ئەوەیە کە نانوسرێت و بەچاو نابینرێت بەڵکو بە عقڵ و علم دەبینرێت.

[2] مەبەست لە دیار (بارز) ئەوەیە کە دەنوسرێت و دەخوێنرێتەوە.

[3] واتا : دەکرێت بڵێین (قام) و فاعلەکەی (هو) بێت وە دەکرێت بڵێین(قام زیدٌ)، فاعلەکەی (زیدٌ) بێت .

[4] چونکە هەموو فعلێکی امر بۆ کەسی دووەمی تاکی نێر (مخاطب) بێت فاعلەکەی نادیار (مستتر) دەبێت بە هیچ شێوەیەك فاعلەکەی ئاشکرا نابێت.

[5] إعرابی تەواوی (اوافق) و هاوشێوەکانی بەم شێوەیەیە : فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة ، وفاعله ضمير مستتر تقديره انا.

سێیەم / هەموو فعلێکی مضارع کە بە (نون) دەست پێبکات وەکو (نغتبطُ)[١] واتا ئێمە دڵ خۆش دەبین.

چوارەم / هەموو فعلێکی مضارع کە بە تائی دوێندراوی کەسی دووەمی تاکی نێر دەست پێبکات وەکو (تشکرُ)[٢] واتا تۆ سوپاس دەکەیت بەڵام ئەگەر دوواندنەکە بۆ کەسی دووەمی تاکی مێ یان بۆ دووان یان بۆ کۆ بوو ئەو کات جێناوەکە ئاشکرا دەبێت و نادیار نابێت وەکو : انتِ تَفعلينَ[٣] ، وانتما تفعلانِ[٤] ، وانتم تفعلون[٥] ، وانتُنَّ تَفْعَلْنَ[٦].

ئەم چوارە ئەو شوێنانە بوون کە جێناو تیاندا نادیار دەبێت کە دانەر باسی کرد[٧].

نمونەی جێناوی نادیاری جائز : زيدٌ يقوم ، واتە ئەو (هو) ئەم جێناوە نادیاریەکەی جائزە و واجب نیە چونکە دەتوانرێت لە جێی جێناوەکە

---

[١] إعرابی تەواوی (نغتبط)و هەموو فعلێکی تری مضارعی هاوشێوەی بەم شێوەیەیە : فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة ، وفاعله ضمير مستتر تقديره (نحن).

[٢] إعرابی تەواوی (تشکر) هەموو فعلێکی تری مضارع کە بە تائی مخاطب دەست پێبکات بەم شێوەیەیە : فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة وفاعله ضمير مستتر تقديره (أنت) .. هەوڵ بدە ئەم إعرابانە دیسپلین – ضبط– بکە، چونکە گرنگن.

[٣] لە فعلی (تفعلين) و هاوشێوەکانی : فاعل : يائی مخاطبةکەیە کە ئاشکراو دیارە.

[٤] لە فعلی (تفعلان) و هاوشێوەکانی : فاعل (ألف الاثنين) کە ئاشکراو دیارە.

[٥] لە فعلی (تفعلون) و هاوشێوەکانی : فاعل (واو الجماعة)یە کە ئاشکراو دیارە.

[٦] هەروەها لە فعلی (تَفْعَلْنَ) و هاوشێوەکانی : فاعل (نون النسوة)یە کە ئاشکراو دیارە.

[٧] دیارە شوێنی تریش هەن کە جێناو تیاندا نادیارە لەوانە : فاعلی اسمی فعلی أمر وەکو : (صَه ، نزالِ ....) هەروەها فاعلی فعلی (التعجب) وەکو : ما أحسنَ محمداً.

ناوێك دانرێت و بوترێت زیدٌ یقومُ ابوه ، هەروەها هەموو فعلێك پاڵدرێت بۆ لای کەسی سێهەم (غائب ، غائبة) وەکو : هندٌ تقومُ ، هەروەها ئەو ناوەش وەك فعل[1] وایە . وەکو : زیدٌ قائمٌ[2] ، واتە ئەو (هو).

....................................

* باسی جێناوی سەربەخۆی حاڵەتی رفع ( ضمائر الرفع المنفصلة )

٦١- وذو ارتفاعٍ وانفصالٍ : انا ، هو وانت ، والفروعُ لا تَشْتَبِهُ[3]

پێشتر باسکرا کە جێناو دابەش دەبێت بۆ نادیار و دیار ، وە باسی جێناوی نادیار کرا ، جا جێناوی دیار و ئاشکراش دابەش دەبێت بۆ : لکاو (متصل) و سەربەخۆ (منفصل) ، وە جێناوی لکاویش حاڵەتی رفع و نصب و جری هەیە کە پێشتر باسکرا ، هەروەها جێناوی سەربەخۆش تەنها بۆ حاڵەتی رفع و نصب و هەیە و حاڵەتی جری نیە.

دانەر لەم دێڕەدا باسی جێناوی سەربەخۆی حاڵەتی رفع دەکات کە دوانزەن: (١) من (انا) بۆ کەسی یەکەمی تاك (للمتکلم وحده) ، (٢) ئێمە (نحن) بۆ کەسی یەکەمی کۆ (للمتکلم المشارك) یان بۆ کەسی گەورە (المعظم لنفسه). (٣) تۆ (انتَ) بۆ کەسی دووەمی تاکی نێر (للمخاطب). (٤) تۆ (انتِ) بۆ کەسی دووەمی تاکی مێ (للمخاطبة) ، (٥) ئێوە ( انتما) بۆ

---

[1] مەبەست پێی اسمی فاعل و اسمی مفعوله و هاوشێوەکانیانە.

[2] (قائمٌ) لەم ڕستەیەدا بۆ خۆی خبره و پێوستی بە فاعلیشە چونکە اسمی فاعلەو هەموو اسمە فاعلێك پێویستی بە فاعلە، بۆیە دەڵێین فاعله ضمیر مستتر تقدیره (هو).

[3] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : جێناوی سەربەخۆی حاڵەتی رفع وەکو : انا بۆ کەسی یەکەم (متکلم) وە (هو) بۆ کەسی سێیەم (غائب) ، هەروەها (انت) بۆ کەسی دووەم (مخاطب) وە هاو شێوەکانیان ئاشکرا و دیارە مەبەست لە هاوشێوەکانیان (نحن و انتما وانتن و هي و هما و هم وهُنّ ) ... هتد.

دووانـی دوێنـدراو نێـر بـن یان مـێ (للمخـاطبین أو المخـاطبتین)، (٦) ئێـوە (أنتم) بۆ کەسی دووەمی کۆی نێر (للمخاطبین)، (٧) ئێوە (انتُن) بۆ کەسی دووەمی کۆی مێ (للمخاطبات)، (٨) ئەو (هو) بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێر(للغائب)، (٩) ئەو (هي) بۆ کەسی سێ یەمی تاکی من (الغائبة) ، (١٠) ئەوان (هما) بۆ کەسی سێیەمی دووانی نێر یان مێ (للغائبین أو الغائبتین) ، (١١) ئەوان (هُمْ) بۆ کەسی سێیەمی کۆی نێـر (للغائبین) ، (١٢) ئەوان (هُنّ) بۆ کەسی سێیەمی کۆی مێ (للغائبات).

*** باسی جێناوی سەربەخۆی حاڵەتی نصب ( ضمائر النصب المنفصلة )**

**٦٢– وذوا انتصاب في انفصالٍ جُعِلا إيّاي والتفريعُ ليس مشكلا[١]**

دانەر لەم دێڕەدا ئاماژە دەکات بۆ جێناوی سەربەخۆ لە حاڵەتی نصبدا ، کە دوانزەن: (١) من ( إيّای )[٢] بۆ کەسی یەکەمی تاك ، (٢) ئێمە ( إيّانا ) بۆ کەسی یەکەمی کۆ یان بۆ کەسی گەورە و خۆ بەگەورە زان، (٣) تۆ (إيّاك) بۆ کەسی دووەمی تاکی نێر ، (٤) تۆ ( إيّاكِ ) بۆ کەسی دووەمی تاکی مێ ، (٥) ئێوە ( إيّاكما ) بۆ دووانی دوێندراو نێر بن یان مێ ، (٦) ئێوە ( إيّاكم ) بۆ کەسی دووەمی کۆی نێر ، (٧) ئێوە ( إيّاكنّ ) بۆ کەسی دووەمی کۆی مێ ، (٨) ئەو ( إيّاه ) بۆ کەسی سێ یەمی تاکی نێر ، (٩)

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : جێناوە سەربەخۆکانی حاڵەتی نصب بریتین لە ( إياك ) و بەشەکانی کە زانینی ڕوون و ئاشکرایە ، مەبەست لەبەشەکانی بریتین لە ( إياكما و إياكم و إياه ، هتد ... )

[٢] واتا جێناوی ( انا ) و ( ایای ) لە ڕووی ماناوە یەکن ، بەڵام لە حاڵەتی إعرابیدا جیاوازن ( انا ) بۆ حاڵەتی رفع بەکاردێت و ( إيای ) بۆ حاڵەتی نصب ، هەروەها هەموو جێناوەکانی تر.

ئەو ( إيّاها ) بۆ کەسی سێیەمی تاکی مێ ، (١٠) ئەوان ( إيّاهما ) بۆ کەسی سێیەمی دووانی نێر یان مێ ، (١١) ئەوان ( إيّاهم ) بۆ کەسی سێیەمی کۆی نێر ، (١٢) ئەوان ( إيّاهنّ ) بۆ کەسی سێیەمی کۆی مێ.

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

٦٣- وفي اختيارٍ لايجئ المنفصل إذا تأتّى أنْ يجئَ المتصل[1]

هەر شوێن و ڕستەیەك بگونجێت بۆی جێناوی لکاو جێناوی سەربەخۆی بۆ دانانرێت ، مەگەر لە چەن حاڵەت و کاتێکدا نەبێت کە دواتر دانەر باسیان دەکات ، بۆ نمونە دروست نیە لە ڕستەی ( اكرمْتكَ )[2] بڵێیت ( اكرمتُ إيّاك) چونکە جێناوی ( ك ) بە لکاوی دروست و گونجاوە ، بۆیە دەڵێت : اكرمْتكَ ). جا ئەگەر نەگونجا هێنانی جێناوی لکاو ئەو کات جێناوی سەربەخۆ بەکاردێنین : إيّاك اكرمتُ[3] بەلاّم لە شیعردا جێناوی سەربەخۆ هاتووە لە کاتێکدا دەگونجێت بەکارهێنانی جێناوی لکاو ، وەکو ووتەی شاعیر :

ش ١٥- بالباعث الوارثِ الاموات قد ضَمِنَتْ

إيّاهُمُ الأرضُ في دهرِ الدهارير[4]

---

[1] مانای ئەم دێڕە : لەسەر قسەی هەڵبژێردراوی زانایان دروست نیە جێناوی سەربەخۆ بێت مادام بگونجێت جێناوی لکاو دانرێت.

[2] اكرمتك : پێکهاتووە لە فعل و فاعل و مفعول بە : اكرمْ / فعل ماضي. تُ/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. كَ/ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به.

[3] إيّاك اكرمْتُ : إياك جێناوی سەربەخۆیە ( ضمير منفصل ) چونکە پێشکەوتووە دروست نیە بە لکاوی ( متصل )ی بەکاری بهێنین چونکە جێناوی لکاو نابێت لەسەرەتاوە بێت.

[4] کورتەی مانای ئەم دێڕە شیعرە : سوێند بەخوای زیندو کەرەوەی مردووان ، بێگومان زەوی هەموو مردووانی لە خۆ گرتوە.

٦٤- وصِلْ أو افصِلْ هاء سلنيه ، وما أشْبَهَهُ ، فِي كُنْتُهُ الخلفُ انتمى
٦٥- كـذاك خلـتنيـه ، واتّـصالا اختار ، غيري اختار الانفصالا[1]

لـەم دوو دێـڕەدا ئامـاژە دەکـات بـۆ ئـەو شـوێنانەی کـە دروسـتە تیایانـدا جێناوی سەربەخۆ بێت لەگەڵ ئەوەی کە دروستە جێناوی لکاوی بۆ بەکار بهێنرێت، جا ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی ( سلنيه ) بۆ ئەو فعلانەی تێپەڕ (متعـدی)ـن بـۆ لای دوو مفعـول[2] و مفعـولی دووەمیـان لـە ئەصـلدا خـبر نیە،هەردوو مفعولەکەش جێناون وەکو ( الدرهمُ سَلْنِيهِ )[3] جا دروستە لە جێناوی (هائی ) ( سلنيه ) بە لـکاوی بێـت واتـە بڵێـین : ( سَلْنيه ) ،

---

بەڵگەی ئەم دێڕە شیعرە : ڕستەی ( ضمنت إياهم ) لێرەدا جێناوی ( إياهم )ی سەربەخۆ بەکارهێناوە و دەیتوانی بە لکاوی بەکاری بێنێت و بڵێت ( ضمنتهم ) ئەمەش تایبەتە بە شیعرەوە.

(1) مانای ئەم دوو دێڕە بە کورتی : (٦٤) بە لکاوی یان سەربەخۆی جێناوی ( ها ) لە ڕستەی ( سلنيه ) وهاوشێوەکانی بەکار بهێنە ، هەروەها خیلاف هەیە لە لکاو بوون و سەربەخۆ بوونی جێناوی ( ها ) کاتێك خبری کان بێت.

(٦٥) هەروەها هەمان خیلاف هەیە لە مفعولی دووەمی ( خلتنيه ) کە جێناوی ( ها )یە، من–واتە دانەر– لکاو بوون هەڵئەبژێرم و غەیری منیش – مەبەستی پێی شێخی سيبويه–ە سەربەخۆ بوونی هەڵبژاردوە.

(2) فعلی متعدي ( فرمانی تێپەڕ ) لە زمانی عەرەبیدا سێ جۆرە : ( أ ) تێپەڕ بۆ لای یەك مفعول ( متعدي إلى مفعول واحد ) وەکو : كَتَبَ محمدٌ الدرسَ. ( ب ) تێپەڕ بۆ لای دوو مفعول ئەمیش دوو جۆرە (١) جۆرێکیان لە ئەصلدا دوو مفعولەکە مبتدأ و خبرن وەکو ( ظَنّ وأخَواتها ) نموونە : ظننتُ الدرسَ سهلاً. (٢) جۆرێکیشیان دوو مفعولەکە لە ئەصلدا مبتدا و خبر نین وەکو ( سَلْ ، اعطى ، كسى ... ).

(ج) تێپەڕ بۆ لای سێ مفعول ( متعدى إلى ثلاثة مفاعيل ) ئەمیش ( ارى و أعلم ... ) کە دواتر باسیان دەکەین إنشاء الله.

(3) إعربی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە : الدرهم : مبتدا مرفوع . سَلْ/فعل أمر

هـەروەها دروسـتە بـە سـەربەخۆیی بێـت و بڵـێین : سـلنی إیّاهُ ، هـەروەها هەموو فعلێکی تری هاوشێوەی وەکو : الدرهمُ اعطیتکَهُ ، واعطیْتُكَ إیّاه[1].

جا بەقسەی دانەربێت دروستە لەم بابەتەدا[2] لکاو بوونی جێناوەکەو سەربەخۆ بوونی وەکو یەك ، ئەمەش قسەی زۆرێك لە زانایانی نحوە ، بەڵام بەپێی قسەی زۆرێك لـە زنایانی نحو ، وە بە پێی دیاری قسەی سیبویه لکاو بوون ( الاتصال ) واجبە بۆ ئەم حاڵەتە وە سەربەخۆ بوون تایبەتە بۆ شیعر.

هەروەها دانەر ئاماژەی کرد بە ووتەی ( فی کُنته انتمی ) ، بـۆ ئەوەی ئەگەر خەبەری کانَ و هاوشێوەکانی ( أخواتها ) جێنـاو بـوو دروسـتە ئـەو جێنـاوە بە لکاوی بێـت هـەروەها دروستیشە بەسـەر بـەخۆی ، بەڵام زانایـان ڕایـان جیاوازە لە ڕای هەڵبژێراو و پەسەند ، دانەر –واتە ابن مالك– لکاو بوونی هەڵبـژاردوە[3] ، بـەڵام سـیبویە سـەربەخۆ بـوونی جێناوەکەی هەڵبـژاردووە وەکـو : کنـتُ إیـاه[4] ، هـەروەها ڕای هەڵبـژێراو لای دانـەر لکـاو بوونـە لـە

---

مبني على السكون وفاعله ضمير مستتر تقديره انت. ن/ نون الوقاية. ی/ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به أول . ـه / ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به ثاني. والجملة الفعلية في محل رفع خبر.

[1] اعطیتکه : پێکهاتووە لە فعلێك ( اعطی ) و فاعلێك کە جێناوی لکاوی (ت)ە و لە دوو مفعول کە هەردووکیان جێناوی لکاون ( ك ) مفعولی یەکەمەو ( ه ) مفعولی دووەمە، بەڵام ( اعطیتُك ایّاه ) هەمان مانای ( أعطیتکه ) ی هەیە بەڵام جیاوازیان لەوەدایە مفعولی دووەم لە ( أعطیتك ایاه ) سەربەخۆیە.

[2] واتە : لە بابەتی کۆبوونەوەی دوو جێناوی لکاو کە هەردووکیان مفعولن.

[3] واتا : لکاو بوونی هەردوو جێناوەکە و دەڵێت : کُنْتُهُ.

[4] ڕستەی کنت إیاه: بەم شێوەیە إعراب دەکرێت : کُن / فعل ماضي ناقص مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك. تُ / ضمير متصل مبني على الضم في محل رفع اسم كان. ـهُ / ضمير متصل مبني على الضم في محل نصب خبر كان.

وێنەی ( خلتنیە ) ئەویش بریتیە لە هەموو ئەو فعلانەی تێپەڕن بۆ لای دوو مفعـول دوو مفعولەکـەش لـە ئەصـلدا مبتـدأ و خـبرن و هـەردوو کیـانیش جێنـاون بـەڵام بۆچـوونی سیبویە ئەوەیـە کـە ڕای هەڵبـژێردراو لەمەشـدا[1] سـەربەخۆ بوونـە وەکـو : خلـتنی إیـاه ، ڕاوبۆچـوونی سـیبویە بـەهێزترە چـونکە سەربەخـۆ بـوون زۆرتـرە لـە زمـانی عەرەبیـدا لەسـەر گێڕانـەوەی سیبویە لە عەرەبەوە کە بۆ خۆی لە ناویاندا بووەو قسەکانیانی نەقڵ کردوە ، شاعیریش فەرمووی :

ش١٦ / إذا قالتْ حذامِ فصدقوها فإنّ القول ما قالت حذام[2]

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

* ٦٦ – وقدِّمِ الأخصّ في اتصالِ وقدّمَنْ ما شئْتَ في انفصال[3]

جێناوی کەسی یەکەم ( ضمیر المتکلم ) تایبەتترە لە جێناوی کەسی دووەم ( ضـمیر المخاطـب ) ، هـەروەها جێنـاوی کەسـی دووەم تایبـەت تـرە لـە جێناوی کەسی سێهەم ( ضمیر الغائب ) ، جا ئەگەر دوو جێناوی منصوب کۆبونەوە لە ڕستەیەکدا و یەکێکیان تایبـەت تـر بـوو ، ئەگـەر هـەردوو کیـان لکاو بوون ئەوە پێویـستە تایبـەت تـرە کـە پێشخرێت و دەڵێیـت : الـدرهم أعطیتُکَهُ وأعطیتَنیه لێرەدا جێنـاوی کـاف و جێنـاوی (یا) پێش جێنـاوی (هـا) یەکـە کـەوتوون ، چـونکە هـەردووکیان تایبـەتترن لـە جێنـاوی ( هـا )،

---

[1] واتا : لەو فعلانەی کە دوو مفعولیان هەیە و لە ئەصلدا مبتدا و خبرن.

[2] مانای ئەم دێڕە شیعرە بە کورتی : ئەگەر خوشکە حذام – ناوی ئافرەتێکی ڕاستگۆو بەناوبانگە – شتێکی ووت ئەوە ڕاست دەکات چونکە قسە قسەی حذامیە. تێبینی : ئەم شیعرە لێرەدا بۆ نمونە ( مثال ) هێنراوە نەوەك وەکو بەڵگە ( شاهد ) مەبەست ئەوەیە قسە قسەی سیبویە.

[3] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : پێش بخە جێناوی تایبەتتر لەکاتی کۆبوونەوەی دوو جێناوی لکاو پێکەوە ، بەڵام بۆ جێناوی سەربەخۆ کامیانت بوێ ئەوە پێش دەخەیت.

چونکە جێناوی کاف بۆ کەسی دووەمە ، جێناوی ( یاء )ـەکەش بۆ کەسی یەکەمـە ، وە جێنـاوی ( هـاء ) بـۆ کەسـی سـێیەمە ، جـا دروسـت نیـە پێشخستنی جێناوی کەسی سێیەم لەکاتی لکاو بوونی جێناوەکاندا ، بۆیە دروست نیە بڵێیت : أعْطَیتَهوكَ وە دروست نیە بڵێت : أعْطَیتَهوني ، بەڵام کۆمەڵێك بە دروستیان زانیوە ، ئیمامی ( ابن الاثیر ) لە کتێبی لێکدانەوەی ڕاڤەکردنی ووشە نامۆکانی فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)[1] ، گێڕاوەتەوە لـە ووتـەی ئیمـامی ( عثمـان بـن عفـان )ەوە– ڕەزای خـوا لێـی بێـت– کـە فەرموویـەتی ( أراهُمُـني الباطـلُ شـيطاناً )[2] ،بـەڵام ئەگـەر یەکێـك لـە دوو جێناوەکە سەبەخۆ بوو ئەوە بە ویستی خۆتە پێش خستنی هەر کامیان ، ئەگەر وویستت تایبەت تر پێشخە و بڵێ : الدرهمُ أعطیتُكَ إیّاه ، واعطَیتَني إیّاه ، وە ئەگەر ویستت غەیری تایبەت تر پێشبخەو بڵێ : الدرهمُ أعطیتُهُ إیّاك ، واعطیتُهُ إیّاي ، بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی ( وقدّمن ما شئت في انفصال ) ئەمـەش کـە باسـی کـرد بـە ڕەهـایی نیە بـەڵکو کاتێك دروسـتە غـەیری تایبـەت تـر پێشبخرێت ئەگـەر لـێ تێکـچوون ڕوو نـەدات ، بەڵام ئەگـەر لێ تێکچوون ڕوویـدا ئەوە دروسـت نیـە ، کەواتـە ئەگـەر بڵێـی :

---

[1] کتێبەکەی ( ابن الاثیر ) ناوی ( النهایة في غریب الحدیث والأثر)ە فەرهەنگێکی نایابە دەربارەی لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ووشە نامۆکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾. کتێبخانەو خوێنەوار لێی بێنیاز نیە.

[2] واتا:ناحەق منی لێکردون بە شەیتان.جا ئەم وتەیە پێچەوانەی یاسایە و شاذە، إعرابی ئەم وتەیە بەم شێوەیەیە : أرا : فعل ماض مبني على الفتحة المقدرة ، هم : ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به أول مقدم ، ن : نون الوقاية ، ي : ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به ثان ، الباطل : فاعل مرفوع علامة رفعه الضمة الظاهرة ، شيطاناً : حال منصوب أو هو مفعول به ثالث لأرى . الشاهد في هذا القول : جواز تقديم ضمير الغائب مع الإتصال وهذا شاذٌ .

زیدٌ اعطیتكَ إیاه دروست نیه جێناوی کەسی سێهەم ( غائب ) پێشبخەیت و ناڵێیت : زیدٌ اعطیُتهُ إیاك ، چونکه نازانرێت ئایه زید وەرگیراوه یان وەرگره[1].

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

٦٧- وفي اتحاد الرتبةِ الزمْ فصلا          وقد يُبيح الغيبُ فيه وصلا[2]

ئەگەر دوو جێناو کۆبونەوه و هەردووکیان منصوب بوون و یەك پلەیان هەبوو – وکو ئەوەی هەردووکیان بۆ کەسی یەکەم بن یان بۆ کەسی دووەم بن یان کەسی سێهەم – ئەوه پێویسته یەکێکیان بەسەربەخۆی بێت[3] ، دەڵێیت :

أعطيتني إيّاي[4] ، واعطیتُكَ إیّاكَ[5] ، واعطیتُه إیّاه[6] ، دروست نیه هەردوو جێناوەکه لکاو بن بۆیه ناڵێیت : اعطیتنیني ، واعطیتکك ، واعطیتیهوه بەڵێ ئەگەر هەردوو جێناوەکه بۆ کەسی سێهەم بن و لفظیان جیاواز بێت[7] ، دەکرێت هەردووکیان لکاو بن وەکو :

---

[1] چونکه هەردوو ناوی ( زید )و جێناوی کەسی دووەمی ( ك ) هەردووکیان گونجاون بۆ ئەوەی ببنه فاعل و ببنه مفعولیش.

[2] واتای ئەم دێڕەی ئەلفیه : ئەگەر دوو جێناو پلەیان وەك یەك بوو و پێکەوه هاتن پێویسته یەکێکیان سەربەخۆ بێت ناکرێت هەردوو کیان لکاو بن ، بەڵام هەندێ جار بۆ کەسی سێهەم دروسته پێکەوه لکاوبوونیان..

[3] واتا : منفصل بێت.

[4] واتا : تۆ بەخشیت به من.

[5] وتا : من بەخشیم به تۆ.

[6] واتا : من بەخشیم بەئەو.

[7] واتا : یەکێکیان بۆ تاك ( مفرد ) بێت و ئەوی تریان بۆ دووان ( مثنى ) یان کۆ (جمع ) بێت ، یان یەکێکیان بۆ نێر ( مذکر ) بێت ئەوی تر بۆ ( مؤنث ) بێت.

الزیـدان الـدّرهمُ أعطیتُهُمـاهُ[١] ، بـۆ ئەمـەش ئاماژە دەکـات دانـەر لـە کتێبی ( الکافیة )[٢] دا بە ووتەی :

مع اختلافٍ ما ، ونحو ( ضمنت إیاهم الأرض ) الضرورة اقتضت[٣]

هەنـدێ جـار ئـەم دێـڕە شـیعرە[٤] لـە هەنـدێ کـۆپی ( نـسخة )ـی ئەلفیـەدا هاتووە ، بەڵام ئەم دێـڕە شیعری ئەلفیـە نیە ، جا ئاماژەی کرد بە ووتەی (ونحو ضمنت – تا کۆتـای ) بۆ ئەوەی کە هێنـانی جێنـاوی سـەربەخۆ لـە شوێنێکدا کە پێویستە بە لکاوی بێت ضرورتە[٥] ، وەکو ووتەی شاعیر :

بالباعث الوارث الأموات قد ضمنت إیّاهم الأرض في دهر الدهاریر

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

[١] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : الزیدان : مبتدأ أول مرفوع وعلامة رفعه الالف لأنه مثنی. الدرهمُ : مبتدأ ثانٍ مرفوع وعلامة رفعه الضمة. اعطیْه : فعل ماضي مبنی علی السکون. تُ : ضمیر متصل مبني فی محل رفع فاعل . هما : ضمیر متصل مبني فی محل نصب مفعول به أول. ه: ضمیر متصل مبني فی محل نصب مفعول به ثاني ، والجملة الاسمیة ( الدرهم اعطیتهماه ) في محل رفع خبر للمبتدأ الاول.

[٢] کتێبی ( الکافیة الشافیة ) کتێبێکی زانستی نحو و صرفە، دانراوی ( ابن مالك )ـە –ڕەحمەتی خوای لێبێت– لە نزیکەی سێ هەزار دێڕە شیعر پێکهاتووە بۆ خۆشی شەرحی کردوە ، کتێبی ئەلفیەش پوختەکراوی کتێبی (الکافیة الشافیة)ـەیە.

[٣] واتای ئەم دێڕەی کافیة بەم شێوەیەیە : لەگەڵ جیاواز بوونی هەردوو جێناوەکەوە وەو وێنەی ( ضمنت إیّاهم الأرض ) کە پێشتر باسکرا بە پێی ضرورة دروستە، واتە : دروستە سەربەخۆ بوونی یەکێك لە دوو جێناوەکە.

[٤] واتا دێڕی ( مع اختلاف ما ونحو ضمنت إیاهم ...... هتد )

[٥] مەبەست لە ضرورة ئەوەیە کە پێچەوانەی یاسا بێت و لەبەر تێکنەچوونی وەزنی شیعرەکە ئەنجام دەدرێت.

* باسی ( نوونی وقایە )

٦٨- وقبل یا النفس مع الفعل التُزِمْ نون وقایةٍ ولیسي قد نُظِمْ[١]

ئەگەر لکا بە فعلەوە جێناوی یای کەسی یەکەمی تاك پێویستە نونێك بلکێت بە فعلەکەوە کە پێی دەوترێت نونی وقایە[٢] بۆیە ناونراوە نونی وقایە چونکە فعلەکە دەپارێزێت لە کسرە[٣] ، وەکو ( أکرَمَنی ، ویُکرِمُني ، وأکْرِمْني )[٤] ، هەندێ جاریش ئەم ( نونی وقایە )یە لەگەڵ فعلی (لیس)ـەدا بە شاذی حذف دەکرێت[٥] ، هەروەکو شاعیر دەڵێت :

ش١٧- عددتُ قومي کعدید الطیس إذ ذهب القوم الکرام لیسي[٦]

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : پێویستە کاتێك جێناوی ( یا )ی کەسی یەکەم لکا بە فعلەوە نونی وقایە بلکێت بە فعلەکەوە پاشان جێناوی ( یا )ـی پێوە بلکێت ، بەڵام فعلی لیس بەبێ نونی وقایە- لە شیعردا بەکار هاتووە- لەگەڵ جێناوی (یا) دا.

[٢] وقایە : واتا پاراستن، مەبەست ئەوەیە ئەو نونە فعلەکە دەپارێزێت ، چونکە جێناوی یا کاتێك بلکێت بە ووشەیەکەوە دەبێت پێشی کسرە بێت فعلیش ناکرێت مبنی بێت لەسەر کسرە یان مرفوع بێت و علامەی رفعی کسرە بێت بۆیە ئەم نونە دەهێنرێتە نێوان فعلەکەو جێناوی یای کەسی یەکەمی تاك.

[٣] بۆ نمونە فعلی ( ضَرَبَ ) ئەگەر جێناوی یای پێوە بکرێت بەبێ نوونی وقایە دەبێتە ( ضَرَبِي ) هەم لە ڕووی ماناوە لە فعل دەردەچێت و هەم لە ڕووی مبنی بونیشەوە لەسەر کسرە.

[٤] ئەم سێ فعلە نمونەی بۆ هەر سێ جۆرەکانی فعل ( ماضي و مضارع و أمر ).

[٥] چونکە ( لیس ) لای زۆربەی زانایان فعلە بۆیە ئەگەر جێناوی یای کەسی یەکەمی پێوە لکاو دەبێت نونی وقایەی بۆ بێنین وەکو سەرجەم فعلەکانی تر.

[٦] واتای ئەم دێڕە : خزم و کەس و کارەکانم زۆر بوون و ژماردیانم وەکو ژمارەی لمی زۆر هەموویان مردن تەنها من نەبم.

هەروەها زانایان ڕایان جیایە دەربارەی فعلی تعجب[1] : ئایە نونی وقایـەی پێوە دەلکێت یان نا ؟ دەڵێیت : مـا افقرنـی إلی عفـو الله ، یـان ما افقری إلی عفـو الله لای ئەوانـەی دەڵـێن پێویـستی بـە نـونی وقایـە نیـە ، ڕای ڕاسـت ئەوەیە کە فعلی تعجبیش نونی وقایەی پێوە دەلکێت.

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

٦٩- ولیتَني فشا ، ولیــتي ندرا ومَعْ لعلّ اعکس ، وكُنْ مخیرا

في الباقیات ، واظطراراً خففا مني وعني بعضُ من قد سلَفا[2]

لەم دوو دێڕەدا دانەر باسی حوکمی وقایە دەکات لەگەڵ حەرفدا ، باسی ئەوە دەکات کە حەرفی ( لیت )[3] هەموو کات نونی وقایەی پێوە دەلکێت[4] و لێی حذف ناکرێت مەگەر بە شاذی وەکو ووتەی شاعیر :

---

بەڵگە ( شاهد )ی ئەم دێڕە : حذف کردنی نونی وقایە یە لەگەڵ فعلی ( لیس ) دا ئەمەش لای زۆربەی زانایان شاذە.

(1) واتا : فرمانی سەرسوڕمان ، جا لە زمانی عەرەبیدا دوو جۆر تعجب هەیە : یەکەمیان پێی دەوترێت تعجب سماعی واتا کۆمەڵێ ووشەن بەکاردێن بۆ سەرسوڕمان و یاسای تایبەتیان نیە وەکو ( لله دَرُّهُ ، کیف ... )، دووەمیان پێی دەوترێت تعجب قیاسی ئەم جۆرەشیان فعلەو دوو وەزنی هەیە ( ما أفعلَ ، أفعِلْ به ) ئەمەش مەبەستە لێرەدا.

(2) پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە : (٦٩) لەحەرفی لیت دا زۆرە پێوەلکانی نونی وقایە ، وکەمە پێوە نەبونی ، بەڵام حەرفی ( لعلّ ) بە پێچەوانەوەیە واتا بە زۆری نونی وقایەی پێوە نیە و کەمیشە پێوە بوونی ، (٧٠) وە لەسەرجەم حەرفەکانی تر واتا هاوشێوەکانی لیت و لعل کەبە ( الحروف المشبهة ) ناسراون- سەرپشکی لەوەی نونی وقایەی پێوە لکێنیت یان نا ، لە حاڵەتی ناچاری دا هەندێ لە زانایانی پێشوو نونی وقایەیان لە هەردوو حەرفی ( من و عن ) حذف کردوە بە شاذی

(3) ( لیت ) یەکێکە لەو شەش حەرفەی کە پێیان دەوترێت ( الأحرف المشبهة بالفعل ) کە لە بابەتەکانی دواتردا باسیان دەکەین، إن شاء الله .

(4) مەبەست ئەوەیە کاتێك جێناوی یای کەسی یەکەمی پێوە لکا بێت ( یاء المتکلم ) .

ش١٨- كمنية جابرٍ إذ قال : ليتي          أُصادِفُهُ واتلف جُلّ مالي[1]

زۆرتـر لـە زمـانـی عەرەبیدا ئەوەیـە کـە ( لیـت ) کاتێك جێناوی یـای کەسـی یەکەمی پێوە دەلکێت- نوونـی وقایـەی پێـوە بێـت و بـەم شێوەیـەش لە قورئانـدا هاتـووە ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿يَا لَيتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ﴾[2]، بـەڵام حـەرفی ( لعلّ )[3] بە پێچەوانەی ( لیـت )ەوەیە ، ڕەوانتر وایە نـونی وقایـەی پێـوە نـەبێت وەکـو خـوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ﴾[4] ، وە کەمە پێوە لکانی نونی وقایە بۆی ، وەکو شاعیر دەڵێت :

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە بەم شێوەیەیە : خۆزگەم خواست وەکو خۆزگەکەی جابر کە ووتی : خۆزگە گەیشتبام پێی ( مەبەست کەسێکە ) وە زۆربەی ماڵەکەم خەرج بکردایە. بەڵگە ( شاهد )ی ئەم دێڕە : ووشەی ( لیتي ) کە بەبێ نوونی وقایە بەکاری هێناوە لە کاتێکدا جێناوی یای کەسی یەکەمی پێوە لکاوە، ئەمەش کەمە.

[2] ئایەتی (٧٣)ی سورەتی (النساء) کورتەی ماناکەی {خۆزگە لەگەڵ ئەواندا بوومایە – ئەمە قسەی کەسی دوو ڕوو (منافق)ە کاتێك کە لە جەنگدا دوا دەکەوێت و وە دەبینێت مسوڵمانان سەرکەوتو دەبن }.

إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە بەم شێوەیەیە : یا / حرف تنبيه. ليت / حرف مشبه بالفعل للتمنی. ن / نون الوقاية. ي / ضمير متصل مبني في محل نصب اسم ليت. كنْتُ : كُن / فعل ماضي ناقص. تُ / ضمير متصل مبني على الضم في محل رفع اسم كان. معهم/- -ظرف مبني على الفتح متعلق . محذوف خبر كان وهو مضاف . هم / ضمير متصل مبني على السكون في محل جر مضاف اليه. ثبوت نون الوقاية مع ليت وهو كثير .

[3] (لعلّ) یەکێکە لەو شەش حەرفەی کە پێیان دەوترێت (الحروف المشبهة بالفعل) لە ئایندەدا باسیان دەکەین، إن شاء الله.

[4] ئایەتی (٣٦)ی سورەتی غافر کورتەی ماناکەی { بە هیوای ئەوەی بگەمە ئەو ڕێگایانەی – ئەمە ووتەی فیرعەونە لە لووت بەرزیدا دەیوت کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکەن بۆ ئەوەی بگەمە ئاسمان }.

ش١٩- فقلتُ : اعيراني القدوم لعلني اخطُ بها قبراً لأبيض ماجدِ[١]

پاشـان دانـەر باسـی ئـەوەی کـرد لەسـەرجەم حەرفـەکانی تـری هاوشـێوە (اخـوات )ی لیت و لعلّ کـه بـریتین لـه : إنّ و انّ ، وکـأنّ ولکنّ ، سەرپشکی لەوەی نونی وقایەی پێوە بلکێنیت یان نا دەتوانیت بڵێی : إنّي و انّني ، وانّي و انّني ، وكأنّي و كأنّني ولكنّي ولكنّني. پاشان باسی ئەوەی کرد کە هەردوو حەرفی ( مِن و عَن ) نونی وقایە وەردەگرن و دەڵێیت : مِنّي وعَنّي – بەشدەی نوونەکە[٢] . وە هەندێ لە زانایان نونی وقایەکە حذف دەکەن و دەڵـێن : مـني و عـني بـەبێ شـدەی نونەکـە– ئەمـەش شـاذە ، شـاعیر ووتویەتی:

ش٢٠ / ایّها السائلُ عَنْهم وعَنِي لستُ من قيس ولا قيسُ مِنِي[٣]

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە بەم شێوەیەیە : لعلّ / حرف مشبه بالفعل للترجي. ي / ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب اسم لعلّ. ابلغُ / فعل مضارع مرفوع علامة رفعه الضمة الظاهرة . وفاعله / ضمير مستتر تقديره (انا) الاسباب/ مفعول به منصوب علامة نصبه الفتحة والجملة الفعلية ( ابلغ الاسباب )في محل رفع خبر لعلّ. الشاهد في هذه الآية : تجريد لعل من نون الوقاية وهذا هو الفصيح .

[١] مانای ئەم دێڕە : جا ووتم بە سپاردە پێم بدەن تەشوێ بەهیوای ئەوەی کێلانێك بۆ شمشێرە سەنگینەکەم دروست بکەم ، بەڵگە ( شاهد )ی ئەم دێڕە : ووشەی ( لعلني ) نونی وقایەی پێوە لکاوە ئەمەش کەمە.

[٢] شدە : واتا دووبارە بوونەی پیت ، کە لە زمانی عەرەبیدا ئەم هێمایەی هەیە ( ّ ) .

[٣] کورتەی مانای ئەم دێڕە : ئەی ئەو کەسەی پرسیار دەکەیت دەربارەی ئەوان و من، نە من لە قەیسم و نە قەیسیش لە منن. بەڵگە ( شاهد )ی ئەم دێڕە: بەکارهێنانی ووشەی ( عني و مني )ە بەبێ نوونی وقایە.

٧١- وفي لَدُنِّي لَدُنِي قَلّ ، وَ في قدني وقطني الحذف ايضاً قد يفي[(١)]

ئاماژه دهكات بۆ ئهوهى كه خوێندنهوهى ڕهوانی ووشهى ( لدني ) ئهوهيه نونی وقايهى ههبێت ، وهكو خواى گهوره دهفهرموێت ﴿قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا﴾[(٢)] بهكهميش خوێندراوهتهوه حذف كردنی نونهكه وهكو خوێندنهوهى ئهوهى كه ئايهتهكهى بهم شێوهيه خوێندۆتهوه[(٣)] ﴿ من لدني﴾ بهبێ نونی وقايه، وه ڕاى زۆر له خوێندنهوهى ووشهى ( قد وقط)[(٤)] ئهوهيه نونی وقايه وهردهگرن[(٥)] وهكو : قدني وقطني ، وهكهمه حذف

---

(١) كورتهى ماناى ئهم دێڕهى ئهلفيه : ووشهى لدنی به زۆرى وايه نونی وقايهى پێوه بێت – كاتێك جێناوى ياى كهسى يهكهمی پێوه لكا – بهكهميش هاتووه بهبێ نونی وقايه، ههروهها له ههردوو وشهى (قد و قط) وايه واتا وهكو (لدني) وايه.

(٢) – سورهتی الكهف ئايهتی (٧٦)، كورتهى ماناكهى { بێگومان لهلايهن منهوه بيانووت ههيه بۆ ئهوهى وازم لێبينيت }

إعرابی تهواوى ئهم ئايهته بهم شێوهيهيه : قد / حرف تحقيق. بلغتَ/ فعل ماضي مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك. تَ / ضمير متصل مبني على الفتح في محل رفع فاعل. من / حرف جر. لدني / لدنْ / ظرف مكان مبني على السكون في محل جر اسم مجرور. والنون للوقاية / و / ي / ضمير متصل مبني على السكون في محل جر مضاف اليه. عذراً / مفعول به منصوب وعلامه نصبه الفتحة. إثبات نون الوقاية في لدني وهو الفصيح .

(٣) مهبهست ئهوهيه ههندێ له ئايهتهكانی قورئانی پيرۆز به چهند شێوازێكی جياواز دهخوێنرێتهوه – ئهو خوێندنهوانه هيچ لهماناى ئايهتهكان ناگۆڕێت ، كه پێی دهوترێت ( القراءات السبع ) يان ( القراءات العشر ) .

(٤) واته : قَدْ لێرهدا اسمهو حرف نيه و بهماناى ( حَسْبُ ) دێت ، ههروهها ( قط )يش بهههمان شێوه و ههردووكيان مبنين لهسهر سكون.

(٥) واتا / كاتێك جێناوى ياى كهسى يهكهمی تاك ( ياء المتكلم ) پێوه لكا.

کردنی وەکو : (قدي وقطي) کە بە واتای بەسمە ( حسبي ) دێت ، جا هەردوو خوێندنەوەکە لە ووتەی شاعیردا کۆ دەبنەوە :

ش٢١- قدني من نصر الخُبيبين قدي  ليس الإمام بالشحيح الملحد[1]

---

[1] واتای ئەم دێڕە بە کورتی : من بەسمە سەرخستنی دوو خوبەیبەکە و بەسمە ، چونکە ئیمام و پێشەوای موسڵمانان کەسێکی ڕژد و بێ دین نیە.

بەڵگەی ئەم دێڕە: بەکارهێنانی ووشەی (قد)ە کە (یا)ی ڕاناوی پێوە لکاوە، دووجار بەکارهاتووە جارێك نونی وقایەی پێوەیە (قدنی) جارێکیش (قدی) نونی وقایەی پێوە نیە.

# جۆری دووەم لە ناوە ناسراوەکان
# النوع الثاني من المعارف
## ( العَلَمُ )[١]

٧٢- اسمٌ يُعيّن المسمّى مُطْلقا عَلَمُهُ كجعفرٍ ، وخرنقا

٧٣- وَقَـرَنٍ ، وعـدَنٍ ، ولاحِقَ وشَذْقَمٍ ، وهَيْلَةٍ وواشَق[٢]

عەلم بریتیە لەو ناوەی دیاری دەکات ناونراوەکەی بە ڕەهای (مطلق)، واتە بەبێ کۆت و (قید)ـی قسەکردن (تکلم)و دواندن (خطاب) و باسکردن (غیبة)[٣]، جا کە دەڵێین ناو[٤] : ڕەگەزێکە لە خۆ دەگرێت ناوی ناسراو و نەناسراو ، هەروەها کە دەڵێین (بەبێ کۆت) دەردەکات هەموو جۆرەکانی تری ناسراو وەکو ڕاناو ، چونکە ڕاناو دیاری دەکات ناونراوەکەی بە کۆتی قسەکردن وەکو من (أنا) یان بەهۆی دوواندن وەکو تۆ (أنت) یان بەهۆی باس کردنی کەسی سێهەم وەکو ئەو (هُو) ، پاشان دانەر نمونەی هێنایەوە بەناوی عەلەمی مرۆڤ و غەیری مرۆڤیش بۆ ئەوەی ئاگادارمان بکاتەوە کە ناوی عەلەم بۆ ئاقڵەکان و غەیری عاقڵیش لەو شتانەی ناسراون دەگرێتەوە جعفر : ناوی پیاوە ، وە خرنق ناوی ئافرەتێکە لە شاعرەکانی عەرەب کە

---

[١] ووشەی (العلم) لە زمانی عەرەبیدا چەن مانایەکی هەیە لەوانە : کێو (الجبل) هەروەها ئالاّ کە دروشمی دەوڵەتان و سوپاکانە، هەروەها بە مانای نیشانە (علامة)ـش دێت.

[٢] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە : عەلەم بریتیە لەو ناوەی دیاری دەکات ناوەنراوەکەی بەبێ هیچ کۆت (قید)ێك وەکو ناوی ( جعفر و خرنق و ...... هتد ) .

[٣] مەبەست ئەوەیە کە ناوی عەلەم لە ڕاناو جیا بکاتەوە ، چونکە ڕاناو بەهۆی کەسی یەکەم و دووەم و سێ یەمەوەیە (التکلم و الخطاب و الغیبة) ناونراوەکەی دیاری دەکات ، بەڵام عەلەم وانیە.

[٤] لێرەوە ابن عقیل ڕاڤەی پێناسەی عەلەم دەکات و بڕگە بە بڕگە شی دەکاتەوە.

خوشكى دايكى طەرەفەى كوڕى عەبدە ، قرن : ناوى هۆزە (قبيلة) ، وعدن: ناوى شوێنە ، ولاحق : ناوى ئەسپە ، وشذقم : ناوى وشترە ، وهيلة : ناوى بزن ، وە واشق : ناوى سەگە .

* باسى جۆرەكانى عەلەم ( أنواع العلم )[١]

٧٤- واسماً اتى وكُنْيةً ، ولقباً          واخِّرَن ذا إنْ سواهُ صَحِبا[٢]

دابەش دەبێت عەلەم بۆ سێ جۆر : ناو (اسم)و كنيە و نازناو (لقب)[٣] ، مەبەست لەناو لێرەدا ئەوەيە كە نە كنيە بێت و نە لقب بێت وەكو ، زيد و عمر ، وە مەبەست لە كنيە : ئەوەيە سەرەتاكەى ووشەى باوك بێت يان دايك وەكو باوكى عبدالله و دايكى خير ، مەبەست لە نازناو (لقب) : ئەوەيە كە باسكردن بە چاكە (المدح) بێت يان باسكردن بە خراپە (الذم) بێت ، وەكو لووتى ووشتر (انف الناقة)[٤].

---

[١] لە زمانى عەرەبيدا ناوى عەلەم چەن دابەشكردنێكى هەيە : لەوانە دابەش بوون بە پێى اسم و كنيە ولقب ، هەروەها دابەش بوونى بە پێى : ئەصلى بوون و وەرگێرانى دەبێتە دوو بەش ( منقول ) و ( مرتجل ) ، هەروەها دابەش بوونى بە پێى ديارى كردنى ماناكەى و ديارى نەكردنى : ( تشخيص معناه وعدم تشخيصه) دەبێتە دوو جۆر (علم شخص) ، و (علم جنس) . دواتر باسى هەموو ئەم جۆرانە دەكەين ، إن شاء الله.

[٢] پوختەىماناى ئەم دێرەى ئەلفيە : ناوى عەلەم يان اسمە يان كنيەيە يان لقبە ، جا لقب دوا بخە ئەگەر لەگەڵ اسمدا بوو ، واتە ئەگەر لە ڕستەيەكدا ناوو لقب بە دواى يەكدا هاتن دەبێت لقبەكە لە دواى ناوەكە بێت .

[٣] لە زمانى كورديدا بە لقب و كنيە دەوترێت نازناو ، بەلام لە عەرەبيدا جياوازن و وەكو پێناسە كراون.

[٤] ووشەى (انف الناقة) نازناوى جعفرى كوڕى قريعە يە ، بۆيە واى پێ وتراوە باوكى ووشترێكى سەربڕيوەو دابەشيكردوە بەسەر ژنەكانيدا و دايكى جعفريش جعفرى

هەروەها ئاماژەی کرد بە ووتەی (وأخّرن ذا – تا کۆتایی) بۆ ئەوەی کە لقب ئەگەر لەگەڵ اسمدا پێکەوە بوون ئەوە پێویستە لقبەکە دواخرێت وەکو زیدٌ أنفُ الناقة ، وە دروست نیە لقبەکە بێتە پێشەوە و نابێت بڵێت : انف الناقە زیدٌ مەگەر بەکەمی ، ئەم ووتەیەش لەوەیە :

ش٢٢/ بأنّ ذا الكلبِ عمراً خيرُهُم حَسَبا   ببطْنِ شِرْيانَ يَعْوي حولَه الذيب[1]

جا بە پێی قسەی دانەر پێویستە دواخستنی لقب ئەگەر لەگەڵ غەیری خۆیدا بوو ، کە (لەگەڵ غەیری خۆیدا) دەگرێتەوە اسم و کنیەش ، بەڵام لقب تەنها پێویستە دواخرێت ئەگەر لەگەڵ اسمدا بێت ، بەڵام لەگەڵ کنیەدا سەرپشکی لەوەی کنیەکە پێش بخەیت و بڵێیت : ابو عبدالله زین العابدین[2]، یان لقبەکە پێش بخەیت و بڵێیت : زین العابدین ابو عبدالله ، جا لە هەندێ چاپ–کۆپی–(نسخة)دا[3] لەبەر ووتەی (وأخّرن ذا إنْ سواه صحبا) ئەمە هاتوە ( وذا اجعلْ آخراً إذا اسماً صحبا )[4] ، ئەمەش جوانترە لەبەر ئەوەی دوور دەبێت

---

ناردوە بۆ بەشەکەیان کاتێك جعفر ڕۆیشتوە تەماشا دەکات تەنها سەری ووشترەکە ماوە و باوکی ووتویەتی ( ئەمە بەشتانە و هەر ئەمە ماوە ) جعفریش دەسی کردوە بە لووتی ووشترەکەداو ڕایکێشاوە ، ئیتر پێی وتراوە ( انف الناقة ) لووتی ووشتر ودواتر بۆتە نازناو( لقب ) بۆ هەموو کەسێکی نەوسن و چڵێس .

[1] مانای ئەم دێڕە بەم شێوەیەیە : پێیان ڕاگەیەنە کە بێگومان ئەم سەگە کە عەمرە لە هەموویان چاکترە نەژادی ، لەناو دۆڵی شریاندا دەوەڕێ و گورگیش دەوریان داوە ، بەڵگە (شاهد)ی ئەم شیعرە : پێشخستنی لقبە (ذا کلب) بەسەر ناوەکەیدا (عمر) ئەمەش پێچەوانەی یاسایە.

[2] (ابو عبدالله) کنیەیەو (زین العابدین)یش نازناوی ئیمامی (علي کوڕی حسینی کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی طالیب)ە ، ڕەزای خوایان لێبێت .

[3] مەبەست نسخەی ئەلفیەیە.

[4] واتا ( کنیە بخە دواوە ئەگەر لەگەڵ اسم دا بوو ).

له ڕەخنه هاتنه سەری ، چونكه ئەمەیان [١] ڕاستەوخۆ باسی ئەوە دەكات كه پێویسته لقب دواخرێت ئەگەر لەگەڵ ناو ( اسم ) دا بوو ، ناوەڕۆكەكەشی وایه ئەگەر لەگەڵ كنیەدا بوو پێویست نیه دواكەوتنی، ئەمەش وایه ، وەكو باسكرا ، خۆ ئەگەر ووتبای[٢] (وأخّرن ذا إنْ سواها صحبا)[٣] . ئەوە ڕەخنەی نەدەهاته سەر چونكه مانای ئەمه وایه: دوا بخه لقب ئەگەر لەگەڵ غەیری كنیەدا بوو كه اسمه ، ئەو كات وەكو ئەوەی ووتویەتی : دوا بخه لقب ئەگەر لەگەڵ ناودا بوو .

* باسی چۆنیەتی إعرابی اسم و لقب.

٧٥- وإن يكونا مفردين فأضِفْ حَتماً ، وإلا أتبع الذي رَدِف[٤]

ئەگەر ناو ( الاسم ) و نازناو ( اللقب ) كۆبونەوە لەیەك ڕستەدا : ئەوەیان هەردووكیان سادەن (مفرد)[٥] دەبن ، یان هەردوكیان لێكدراو ( مركب ) دەبن ، یان ناوەكه لێكدراو دەبێت و نازناوەكه ساده دەبێت ، یان ناوەكه

---

[١] واتا ( وذا اجعل آخراً إذا اسماً صحبا )

[٢] واتا / ابن مالك

[٣] چونكه (سواها) ڕاناوی مێینه (مؤنث)ی پێوەیه كه (ها)یه كه دەگەڕێتەوە بۆ كنیه.

[٤] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیه : ئەگەر ناو و نازناو هەردووكیان پێكەوە بوون و (مفرد) بوون و (مركب) نەبوون ئەوە یەكەم كه ناوەكەیه إضافة بكه بۆ لای دووەم كه نازناوە (لقب) كەیه ، بەڵام ئەگەر هەردووكیان مفرد نەبوون بەوەی لێكدراو (مركب) بوون ، ئەو كات دووەم شوێن یەكەم دەكەوێت له إعرابەكەیدا.

[٥] له زمانی عەرەبیدا (مفرد) بەكاردێت له بەرامبەر (مثنى و جمع) دا، هەروەها بەكاردێت له بەرامبەر (مضاف) دا ، وە بەكاردێت لەبەرامبەر (جملة) دا ، هەروەها بەكاردێت لەبەرامبەر لێكدراو (مركب) دا ، ئەوەی لێرەدا هاتوە لەبەرامبەر لێكدراو دایه بۆیه له ڕێزمانی كوردیدا پێی دەوترێت ساده.

ساده دەبێت و نازناوەکە لێکدراو دەبێت، جا ئەگەر هەردووکیان ساده (مفرد) بوون ئەوە واجبە لای بەصریێکان یەکەم إضافة بکرێت بۆ لای دووەم وەکو : هذا سعيدُ كرزٍ[١] ، ورأيتُ سعيدَ كُرزٍ ، ومررْت بسعيدِ كُرزٍ ، بەڵام لای کوفیەکان دروستە دووەم شوێنی یەکەم کەوێت لە إعرابدا[٢] و دەڵێت : هذا سعيدٌ كُرزٌ ، ورأيتُ سعيداً كرزاً ، ومررْت بسعيدٍ كرزٍ ، دانەریش – واتە ابن مالك – هاوڕایانە لە غەیری ئەم کتێبەدا.

بەڵام ئەگەر هەردووکیان سادە نەبوون – بەوەی هەردووکیان لێکدراو بن وەکو : عبدالله انفُ الناقة ، یان یەکێکیان لێکدراو بێت و یەکێکیان سادە بێت وەکو عبدالله كرزٌ ، وسعيدٌ انفُ الناقة – لەم کاتەدا واجبە دووەم شوێنی یەکەم کەوێت لە إعرابەکەیدا هەروەها دروستیشە دابڕێت لەیەکەم بۆ لای حاڵەتی رفع یان نصب وەکو : مررْت بزيدٍ انفُ الناقة ، وانفَ الناقة جا کە مرفوع دەبێت مبتدایەکی بۆ دادەنێین و ڕاڤەکەی دەبێتە : هو انفُ الناقة[٣] ، وە کە منصوبیش دەبێت فعلێکی بۆ دادەنێین و و ڕاڤەکەی دەبێتە : أعني أنفَ الناقةِ[٤] ، جا دابڕانی دووەم لەیەکەم لە حاڵەتی مرفوع

---

[١] إعرابی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : هذا / اسم إشارة مبني في محل رفع مبتدا. سعيدٌ / خبر مرفوع وعلامة رفعه الضمة وهو مضاف . كرزٍ / مضاف اليه مجرور وعلامه جره الكسره. دوو ڕستەکەی تریش إعرابی ئاشکرا (واضح)یە.

[٢] کە پێی دەوترێت (الإتباع) / اتباع / ئەوەیە ناوێك لە دوای ناوێکی ترەوە بێت و ئەم ناوەی دووەم یان سیفەتە بۆ ناوی یەکەم وەکو ئێرە– یان توکیدە یان عطفة یان بدلە و هەمان إعرابی ناوی یەکەم وەردەگرێت / واتە / ئەگەر ناوی یەکەم مرفوع بوو ناوی دووەمیش مرفوع دەبێت وە ئەگەر منصوب بوو منصوب دەبێت ، وە ئەگەر مجرور بێت مجرور دەبێت.

[٣] کەواتە / انفُ دەبێتە (خبر لمبتدا محذوف) .

[٤] اعني / فعل و فاعله و / انف / دەبێتە مفعول به منصوب.

بوونی یەکەمدا دووەم دەکەینە منصوب ، وە لە حاڵەتی منصوب بوونی دا دووەم دەکەینــە مرفــوع بــەلاَم لــە حاڵــەتی مجــرور بــوونی یەکەمـدا دووەم دادەبڕێت بۆ حاڵـەتی نـصب و رفع وەکـو : هـذا زیـدٌ انـفَ الناقـة[١] ، ورأیـتُ زیداً انفُ الناقة[٢] ومرَرْتُ بزیدِ انفُ الناقة ، وانفَ الناقة[٣].

* باسی جۆرەکانی تری عەلەم

| | |
|---|---|
| ٧٦- ومِنْهُ مَنْقُولٌ : كفضلٍ وأسد | وذو ارتجالٍ كسُعَاد وأُدَد |
| ٧٧- وجملةٌ وما بمزجٍ رُكّبــــا | ذا إنْ بغير ويهَ تَمَّ أُعْربا |
| ٧٨- وشاَع في الاعلام ذو الإضافة | كعبدِ شَمْسٍ وابي قُحَافَة[٤] |

دابەش دەبێت عەلەم[٥] ، بۆ مرتجل وە بۆ منقول ، جا مرتجل بریتیە : لەو ناوەی کە پێشتر بەکار نەهاتوە بۆ ماناو شتێکی تـر وەکو نـاوی سعاد و

---

[١] لەم ڕستەیەدا / هذا / في محل رفع مبتدا /زید/خبر مرفوعه./ انفَ / دەبێتە مفعول به بۆ فعل وفاعلێکی مقدره کە/ اعني/ـە.

[٢] رایتُ : فعل و فاعله و /زیداً / مفعول به. و /انفُ / دەبێتە خبر لمبتدا محذوف.

[٣] لێرەدا دەتوانین بڵێین / انفَ / بە منصوبی دەبێتە مفعول به ، بۆ فعل و فاعلێکی تر، وە دەتوانین بڵێین / انفُ / بە مرفوعی دەبێتە خبر بۆ مبتدایەکی مقدر.

[٤] مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە : (٧٦) جۆرێك لەعەلەم پێی دەوترێت (منقول) واتە گواستراو و ئەقلکراو لە شتێکی ترەوە بۆ ناو ، هەروەها جۆرێکی تر پێی دەوترێت (مرتجل) واتە ناوێکە لەیەکەم بەکارهێنانەوە بە عەلەمی بەکارهاتوە وەکو (سعاد و ادد) کە ناوی ئافرەتن. (٧٧) جۆرێکی تر لەعەلەم ڕستەیە – واتە ڕستەیەك کراوە بە ناوی کەسێك ، جۆرێکی تریان لێکدراوی تێکهەڵکێشراوە جا ئەگەر تێك هەڵکێشرانەکە بەبێ (ویهِ) بوو ئەوە معرب دەبێت . (٧٨) زۆرە لە ناو ناوە عەلەمەکان عەلەمی لێکدراوو مضاف وەکو (عبد الشمس و أبي قحافة) .

[٥] ئەمە دابەش بونێکی ترە بۆ عەلەم ، وەکو پێشوتر باسمان کرد عەلەم چەن دابەش بوونێکی هەیە.

أدد[١]، وه عەلـەمی منقـول : بریتیـه لـەو نـاوەی کـه پـێش بـوونی بـه عەلـەم بـۆ کەسـێك یـان شـوێنێك یـان شـارێك بـەکارهاتوه[٢]، جـا نەقڵکردنیش یان لەسیفەتێکەوه بووه وەکو حارث[٣] ، یـان لـه چاوگ (مـصدر) ێکـەوه وەکـو نـاوی فـضل[٤] ، یـان لـه نـاوێکی ڕەگـەزی شتێکەوه وەکو أسد[٥] ، ئەم ناوه مەنقولانه هەمـــوویـــان معــربن ، وه یان نەقل کراوه لـه ڕستـەیەکـــەوه (جمله) وەکو ناوی قام زیدٌ یـان زیـدٌ قـائمٌ[٦]، حـوکمی إعرابـی ئەمـەش ئەوەیـه کـه لـه ڕسـتـەدا دەگێڕدرێتەوه ، بۆ نمونـه دەڵێیت : جاءنی زیـدٌ قـائمٌ[٧]، ورأیـتُ زیـدٌ قائم[٨]، ومررْت بزیدٌ قائمٌ[٩]، ئەمەش جۆرێکه له عەلەمی لێکدراو.

---

[١] ناون بۆ ئافرەت.

[٢] واته / نەقڵکراو چونکه ( منقول ) واته نەقڵکراو.

[٣] چونکه ووشەی ( حارث ) اسمی فاعلەو فاعلیش صفەیه.

[٤] (فَضْل) مصدری (فَضَلَ یَفْضُلُ)ـه.

[٥] واتا دەکرێت کەسێك ناوی (أسد) بێت ، وه أسد له أصلدا ناوه بۆ جۆره دڕندەیەك.

[٦] له زمانی عەرەبیدا ناوی (تأبط شراً) یان (شاب قرناها) هاتووه که ناون بۆ کەسێك و له أصلدا جملەی فعلین بەلاّم ناو نەهاتووه جملەی اسمی بێت وەکو (زیدٌ قائم) بەلاّم شتی وا دروسته.

[٧] لەم ڕستەیەدا (زیدٌ قائمٌ) پێکەوه إعراب دەکرێت و دەڵێین / فاعل مرفوع وعلامه رفعه الضمة المقدره منع من ظهورها الحكاية.

[٨] هەروەها لێرەشدا إعرابی ( زیدٌ قائمٌ ) : مفعول به منصوب وعلامه نصبه الفتحة المقدرة منع من ظهورها الحكاية.

[٩] لەم ڕستەیەشدا إعرابی ( زیدٌ قائم ) : اسم مجرور وعلامة جره الكسرة المقدره منع من ظهورها الحكاية.

هەروەها جۆرێكی تر لە عەلەم بریتیە لە عەلەمی لێكدراوی تێكەڵكراو[١]، (مركب مزجي) وەكو : بعلبكّ و معدي كرب[٢] وسيبويه ، جا دانەر باسی ئەوەی كرد كە لێكدراوی تێكەڵكراو : ئەگەر كۆتاییەكەی بە ( ويه ) نەبێت ئەوە معربە ، كەواتە ناوەڕۆكی قسەكەی وایە ئەگەر كۆتاییەكەی بە ( ويه ) بوو ئەوە معرب نیە ، بەڵكو مبنیە ، هەر وایشە ، بۆ نمونە دەڵێیت : جاءنی بعلبكُ ، ورايتُ بعلبكً ، ومررْت ببعلبكٌ[٣]، إعرابی وەكو إعرابی ناوێكی (ممنوع من الصرف)ـە ، هەروەها دروستە مبنیشی كەیت لەسەر فتحەو بڵێیت : جاءنی بلعبكَ ، ورايْتُ بعلبكٌ ، ومررْت ببعلبكَ ، هەروەها دروستیشە إعرابی كەیت وەكو إعرابی دوو ناوی (مضاف و مضاف إليه) و بڵێت : جاءني حَضْرُموتٍ[٤]، ورايْتُ حضرَموتٍ[٥]، ومررتُ بحضرِموتٍ[٦]،

---

[١] عەلەمی مركب سێ جۆرە ( ا ) مركب اسنادي / كە لە جملە پێك دێت وەكو ( تأبَطَ شراً ، جادَ الحق .... ). ( ب ) مركب إضافي / كە لە دوو ناو پێك دێت وەكو ( عبدالله وعبدالرحمن و ابوبكر .. ).( ج ) مركب مزجي: ئەمەش لە دوو ووشەی تێكەڵكراو پێك دێت چونكە ووشەی (مزج) وات تێكەڵكردن وەكو ( بعلبك ، سيبويه ، حضر موت).

[٢] ووشەی بعلبك ناوی شارێكە لە شام پێكهاتوە لە (بعل) كە ناوی بتە ، وە (بك) ناوی خاوەنی شارەكەیە ، هەروەها ناوی (معدی كرب) پێكهاتووە لە دوو ناو.

[٣] لێرەدا (بعلبَك) لە سێ ڕستەدا بەكار هاتووە و لە یەكەمدا فاعل و مرفوعە و علامەی رفعی ضمەیە و لە دووەمدا مفعول به منصوب وعلامه نصبه الفتحه الظاهرة وە لە سێیەمدا (اسم مجرور وعلامة جره الفتحة بدل الكسرة لأنه ممنوع من الصرف).

[٤] لێرەدا / حضرموت / فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة وهو مضاف . (موتٍ) مضاف اليه مجرور علامه جره الكسره.

[٥] لەم ڕستەیەدا / حَضْرَ / دەبێتە مفعول به منصوب وعلامه نصبه الفتحه الظاهرة وهو مضاف (مضاف) مضاف إليه مجرور.

[٦] بحضرِ / حَضْرِ لەم ڕستەیەدا / اسم مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة وهو مضاف (مَوتٍ) مضاف اليه مجرور.

هەروەها دەڵێیت بۆ ئەو عەلەمە لێكدراوەی كۆتاییەكەی (ویە)یە : جاءني سيبويهِ ، ورايتُ سيبويهِ ، ومررتُ بسيبويهِ ، مبنی دەكەیت لەسەر كسره[١]، وە هەندێ لە زانایان بە درووستیان داناوە إعراب كردنی ئەم جۆرە عەلەمە[٢]، وەكو إعرابی ناوی ( ممنوع من الصرف ) نمونەی : جاءنی سيبويهُ ، ورايتُ سيبويهَ ، ومررتُ بسيبويهَ[٣].

جۆرێكی تر لە عەلەمی لێكدراو : بریتیە لە ناوێكی لێكدراو لە دوو ناوی (مضاف و مضاف اليه ) وەكو عبد الشمس ، ابي قحافة [٤]، ئەمەش ناوێكی معربە ، دەڵێت : جاءنی عبدُ شمسٍ وابو قحافة[٥]، ورايتُ عبدَ شمسٍ وأبا قحافةَ ، ومررْتُ بعبد شمسٍ وابي قحافة.

جا دانەر ئاگاداری كردینەوە كە بە هێنانەوەی دوو نمونەكەی[٦] ، كە ئەم ناوە لێكدراوە لە دوو ناو دەكرێت ناومی یەكەمیان معرب بێت بە حركات

---

[١] واتە لە ڕستەی یەكەمدا دەڵێین : سيبويه / اسم علم مركب مبني على الكسر في محل رفع فاعل ، وە لە ڕستەی ( رايتُ سيبويهِ ) دەڵێین : سيبويهِ / اسم علم مركب مبني على الكسر في محل نصب مفعول به ، وە لە ڕستەی ( مررت بسيبويه ) دەڵێین : سيبويه / اسم علم مركب مبني على الكسر في محل جر اسم مجرور.

[٢] واتە علمی مركب مزجي مختوم بـ( ويه ).

[٣] لەم سێ رستەیەدا : سيبويه / لە یەكەمدا / مرفوع علامة رفعه الضمة / لە دووەمدا/ مفعول به منصوب وعلامة نصبه الفتحة ، وە لە سێ یەمدا / اسم مجرور وعلامه جره الفتحه بدل الكسره لأنه ممنوع من الصرف.

[٤] ابو قحافة / نازناوی باوكی ئەبوبكری صدیقە – ڕەزای خوایان لێبێت – ناوی عثمانی كوڕی عامرە ساڵی فتحی مەككە مسوڵمان بووە.

[٥] لەم دوو ڕستەیەدا : عبدُ / فاعل مرفوع وعلامه رفعه الضمه الظاهرة وهو مضاف ( شمس ) مضاف اليه ، هەروەها ( ابو ) فاعل مرفوع وعلامه رفعه الواو لأنه من الاسماء الخمسه وهو مضاف ( قحافة ) مضاف اليه مجرور وعلامه جره الفتحه لأنه ممنوع من الصرف.

[٦] واتا هەردوو ناوی ( عبد الشمس ) و ( ابوقحافة ).

وەکو ( عبد ) وە دەکرێت بە حروف[١] وەکو ( أبي ) هەروەها ناوی دووەم دەکرێت ناوێکی ( منصرف )[٢] بێت وەکو ( شمس ) هەروەها دەکرێت ( غیر منصرف )[٣] ، بێت وەکو قحافة.

٧٩- وَوَضَعُوا لبعض الأجْناسِ عَلم    كعلمِ الأشْخاص لفظاً وهُوَ عَم

٨٠- من ذاك : أُمُّ عِرْيَط للعَقْرب    وهكذا ثُعالة للثعلب

٨١- ومِثلُهُ بَرَّةُ للمبرّة    كذا فَجَارِ علمٌ للفَجَرة[٤]

عەلەم دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر[٥] : عەلەمی تاك ( شخص ) ، عەلەمی ڕەگەز ( جنس )[٦]، جا عەلەمی تاك دوو حوکمی هەیە : لە ڕووی ماناوە مەبەست پێی تاکێکە وەکو : زیدٌ واحمدُ ، وە لە ڕووی وێژە ( لفظ ) ەوە ئەویش بریتیە لە دروستی هاتنی حال بۆ لای کۆتاییەکەی[٧]،

---

[١] پێشتر باسی ئەو ناوانەمان کرد کە إعرابیان بە حروفە.

[٢] ( منصرف ) بەو ناوانە دەوترێت کە تنوین و ضمە و کسرە و فتحة وەردەگرن.

[٣] ( غیر منصرف ) واتە ( ممنوع من الصرف ) ئەو ناوانەن کە تنوین و کسرە وەرناگرن واتا حاڵەتی جریان بە فتحە دەبێت وەك پێشتر باسمان کرد.

[٤] پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە : (٧٩) دایان ناوە زانایانی نحو بۆ هەندێ ڕەگەز ( جنس ) ناوێکی عەلەم ، ئەم عەلەمی جنسە لە ڕووی لفظەوە وەکو عەلەمی تاك ( شخص ) وایە ، بەڵام لە ڕووی ماناوە گشتیەو بۆ شتێکی تایبەت نیە. (٨٠) نمونەی عەلەمی جنس ( أمُّ عریط ) کە کراوەتە ناو بۆ ڕەگەزی دووپشك واتە کە وتراوە ( ام عریط ) هەموو دووپشکێك دەگرێتەوە ، هەروەها ( ثُعالة ) کراوەتە ناو بۆ ڕەگەزی ڕێوی. (٨١) هەروەها عەلەمی جنس هەیە دانراوە بۆ ماناو واتاکان وەکو (مبرة ) کراوەتە ڕەگەزی چاکەکاری ، هەروەها ( فجار ) کراوەتە ڕەگەز بۆ خراپەکاری.

[٥] ئەمەش جۆرێکی ترە لە دابەشەکانی ناوی عەلەم.

[٦] مەبەست لە (علم جنس) ئەو ناوانەن دانراون بۆ ڕەگەزی شتێك تایبەت نیە بەتاکێکی دیاری کراو.

[٧] بۆیە دەڵێت لە کۆتاییەوە بۆ ئەوەی بزانین کە حال لە کۆتایی ناوێکەوە هات ئەو ناوە معرفەیەو نکرە نیە.

وەكو ( جاءنی زيدٌ ضاحكاً )[١]، هەروەها دەبێتە[٢] ممنوع من الصرف لەگەڵ هۆكارێكی تری جگە لە عەلەمیەت[٣]، وەكو ( هذا أحمدُ )[٤]، هەروەها دروست نەبوونی ئەليف و لام پێوە بوونی ، درووست نيە بڵێین ( جاء العمرو )[٥].

جا عەلەمی ڕەگەز ( جنس ) وەكو عەلەمی تاك وايە لە ڕووی لفظەوە ، بۆ نمونە دەڵێيت ( هذا أُسامة مقبلاً )[٦]، لێرەدا ناوی ( أسامة ) دەبێتە (ممنوع من الصرف ) و حاليش لە دوايەوە هاتوە و ئەليف و لاميش وەرناگرێت ، كەواتە دروست نيە بڵێين ( هذا الاسامة ) ، بەڵام عەلەمی جنس لە ڕووی ماناوە وەكو ( نكرة ) وايە لەو ڕووە وەی مەبەست پێی تاكێك نيە بە تەنها ، بۆيە هەموو شێرێك دروستە پێی بوترێت اسامة ، هەورەوها هەموو دووپشكێك ( عقرب ) دروستە پێی بوترێت ( ام عريط)[٧]، هەروەها هەموو ڕێويەك دروستە پێی بووترێت ثعالة.

---

[١] لەم ڕستەيەدا ( ضاحكاً ) دەبێتە ( حال ) بۆ زيدٌ. ( زيدٌ )نيش ناوێكی عەلەمی تاكە.

[٢] مەبەست پێی عەلەمی تاكە وەكو ( احمد ، يزيد ، عثمان .... ).

[٣] لە زمانی عەرەبيدا ناوێك كاتێك كە دەبێتە ( ممنوع من الصرف ) كە دوو هۆكار لە هۆكارەكانی (ممنوع من الصرف)ی تێدا بێت جگە لە چەند ناوێكی كەم نەبێت كە بەيەك هۆكار دەبنە ( ممنوع من الصرف ) دواتر باسی ئەم بابەتە دەكەين إن شاء الله تعالى.

[٤] لەم ڕستەيەدا : ( احمد ) خبرەو تنوين وەرناگرێت چونكە ( ممنوع من الصرف ) لەبەر ( علميه ) و (وزن الفعل).

[٥] چونكە ( عمرو ) ناوی عەلەمە و معرفەيە و پێويستی بە ئەليف و لام نيە چونكە ناكرێت ناوێك دوو نيشانەی معرفەی تێدا بێت مەگەر لە چەن حاڵەتێكی تايبەتدا.

[٦] لەم ڕستەيەدا ( اسامة ) ناوە بۆ ڕەگەزی شێر ، واتە عەلەمی جنسەو حاڵی لێدراوەتەوە وەكو چۆن حاڵ لە عەلەمی تاك دەدرێتەوە.

[٧] واتا / ( ام عريط ) بۆ هەموو دووپشكێك بەكاردێت.

كەواتــە عەلــەمى جـنس دەگونجێـت بـۆ تاكێـك بێـت وەكـو باسـكرا[١]، وە دەكرێت بۆ مانا بێت وەكو ئەوەى نمونەى هێنايەوە بە ووتەى ( برّةٌ للمبرة، وفجار للفجرة )[٢].

---

[١] ئەوەى باسكرا مەبەست پێى ( اسامة ) و ( ام عريط ) كە بۆ شێرو دوو پشك بەكاردێن.

[٢] واتە / بَرَّة : چاكەكارە و ( فجار )يش خراپە كارە. ئەم دووانە مانان و ناوى تاكێك نين.

## جۆری سێیەم لە ناوە ناسراوەکان
## النوع الثالث من المعارف
## ( اسم الاشارة )

٨٢- بذا لمفردِ مذكرٍ أَشِر بذي وذه تي تاعلى الأُنثى اقتصر[١].

ئاماژە دەکرێت بۆ تاکی نێر ( المفرد المذكر ) بە ووشەی ( ذا ) ، جا ڕاو بۆچوونی زنا بەصرێکان وایە کە ئەلیفی ( ذا ) بەشێکە لە خودی ووشەکە، بەڵام زانا کوفیەکان پێیان وایە ئەلیف ( ذا ) زیاد کراوە و بەشێك نیە لە ووشەکە، وە ئامازە دەکرێت بۆ تاکی مێ بە ووشەی ( ذي ) و ( ذه ) بە ساکن بوونی پیتی هایەکەی ، هەروەها بە ووشەی [٢] ( تي ) و ( تا ) و (ذِهِ) بە کسرەی پیتی هایەکە بە کورت دەربڕینی کسرەکە ، یان بە تەواو درێژکردنەوەی کسرەکە [٣] ، هەروەها بە ووشەی ( تە )[٤] بە ساکن بوونی پیتی هایەکە و بەکسرە بوونی جا کسرەکە بە کورتی دەربڕێت و درێژ نەکرێتەوە یان بە تەواوی دەربڕێت و بکرێتە یایەکی تەواو ، هەروەها بە ووشەی ( ذات )[٥].

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕە ئەلفیە : بۆ ئاماژەکردن بۆ شتێکی تاکی نێر ووشەی ( ذا ) بەکاردێت ، هەروەها بۆ ئاماژەکردن بۆ شتێکی تاکی مێ ذی و ذه و تی و تا بەکاردێت.

[٢] واتە : ئاماژە دەکرێت بۆ تاکی مێ.

[٣] کاتێك پیتی ( ها ) دەکەوێتە کۆتایی ووشەوە و متحرك دەبێت و پێشیشی متحرك بێت ئەو حەرفی ها یە دەتوانین حەرەکەکەی درێژ بکەینەوە ئەم درێژکردنەوەیە پێی دەوترێت ( إشباع ) ، وە ئەگەر درێژمان نەکردەوە پێی دەوترێت ( إختلاس ).

[٤] – واتا : ئاماژە دەکرێت بۆ شتێکی تاکی مێ بە ووشەی ( تە ).

[٥] – دەکرێت ئاماژە بکرێت بۆ ناوێکی تاکی مێ بە ووشەی ( ذات ).

٨٣- وذانِ تانِ للمثّنى المرتفع          وفي سواه ذَيْنِ تَيْنِ اذْكُر تُطِع[1].

ئاماژه دەكريْت بۆ دووانی نێر له حالّەتی رفعدا به ووشەی ( ذان ) وه له حالّەتی نصب و جردا به ووشەی ( ذَيْنِ ) وه ئاماژه دەكات بۆ دووانی مێ به ووشەی ( تانِ ) بۆ حالّەتی رفع و به ووشەی ( تَيْنِ ) بۆ حالّەتی نصب و جر.

٨٤- وبأُولى اشِر لجِمَعْ مُطْلقاً          والمدُّ اولى ، ولدى البُعدَ انطقا

٨٥- بالكاف حَرفاً دونَ لامٍ ، او معه          واللاّم إنْ قدمْتَ ها ممتنعه[2].

ئاماژه دەكريْت بۆ ناوی كۆ ( جمع ) – نێر بێت یان مێ – به ووشەی (أولى) بۆیه دانەر فەرمووی ( ئاماژه بكه به ووشەی ( أولى ) بۆ كۆ به ڕەهایی (مطلق ) مانای وایه ئاماژه دەكريْت بۆ عاقلّ و نا عاقلّ ، دیاره ئەمەش هەر وایه[3] ، بەلاّم زۆرتر وایه ( اولى ) بەكاربێت بۆ عاقلّ ، نمونەی ئەوەی كه (اولى ) بەكارهاتوه بۆ غەیری عاقل ووتەی شاعیره :

---

[1] – كورتەی مانای ئەم دێره بەم شێوەیەیه : بەكار دێت ووشەی ( ذان ) و ( تان ) بۆ دووان له حالّەتی رفعدا ، بەلاّم له غەیری حالّەتی رفعدا – واته له حالّەتی نصب و جردا ( ذين ) و (تين ) بەكاربێنەو باسبكەو ئەوه گوێڕایەڵی زانایانت كردوه.

[2] كورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیه (٨٤) بەكاردێت ووشەی ( اولى ) بۆ ئاماژه كردن بۆ شتی كۆ به رەهای واته نێربێت یان مێ عاقلّ بێت یان نا عاقلّ بێت ، وه باشتر وایه ( أولى ) درێژ بكرێتەوه، بۆ ئاماژه كردن بۆ دوور به كار بێنه.

(٨٥) حەرفی كاف بەبێ لام واتا ووشەی ( ذاك ) بەكاربێنه بۆ ئاماژەی دوور یان حەرفی كاف و لام به كاربێنه وەكو ( ذالك ) ، بەلاّم ئەگەر حەرفی هاى تنبيه لەسەرەتای اسمی اشارەوه هات ئەو كات نابێت لام بەكار بێت.

[3] واته : ووشەی ( اولى ) بەكاردێت بۆ ئاماژەكردن بۆ كۆ عاقلّ بێت یان نا عاقلّ نێر بێت یان مێ.

ش٢٣- ذُمَّ المنازلَ بعد منزلة اللّوى والعيشَ بعد اولئك الايام[١]

جا ووشەی ( اولی ) بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە : بە درێژ کردنەوەی حەرفی کۆتایی ( المد ) ئەمەش خوێندنەوەی حیجازییەکانە و لە قورئانیشدا بەم شێوەیە هاتوە[٢] ، هەروەها خوێندنەوەی دووەم : بە کورت کردنەوی حەرفی ئەلیفی کۆتای ( القصر ) ئەمەش خوێندنەوەی تمیمێکانە[٣].

هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی ( ولدى البعد انطقا بالكاف - تا کۆتایی دێڕەکە ) بۆ ئەوەی ئاماژە پێکراو دوو پلەی هەیە : نزیك ، دوور ، هەموو ئەوانەی باسکران ئاماژەیان بۆ نزیك پێکرا ، جا ئەگەر ویسترا ئامارە بۆ دوور بکرێت ئەوە حەرفی کاف دەهێنرێت بە تەنها وەکو ( ذاك ) یان حەرفی کاف و حەرفی لام دەهێنرێت وەکو ( ذالك ) جا ئەم حەرفی کافە حەرفی دواندن ( خطاب ) ەو هیچ جۆرە إعرابێك وەرناگرێت ، ئەمەش خیلافی تێدا نیە.

جا ئەگەر حەرفی ئاگادار کردنەوە ( تنبيه ) کە بریتیە لە پیتی ( ها ) کەوتە پێش اسمی إشارەکەوە ئەوە تەنها حەرفی کاف بە کاردێت[٤] و دەڵێیت (هذاك ) ووتەی شاعیریش کە دەڵێت :

---

[١] مانای ئەم دێڕە شیعرە بە کوردی : بە خراپ باسبکە هەموو شوێنێك جگە لە شوێنی ( اللوى ) ناوی شوێنێکە کە جۆرەها خۆشیت تێدا دیوە ، هەروەها هەموو ژیانێکیش ناخۆشە جگە لەو کات و ژیانەی لەویّ بەسەرت برد، بەڵگەکەی: بەکارهێنانی ووشەی (اولئك) بۆ نا عاقڵ کە (ایام)ە.

[٢] واتە لە قورئاندا ووشەی ( اولئك ) بەکارهاتووە.

[٣] تمیمێکان ( تمیم ) هۆزێکن لە هۆزەکانی عەرەبی عەدنانی و زمان و شێوازی خوێندنەوەیان بەڵگەیە و جێی بایەخە.

[٤] واتە : حەرفی لام و کاف پێکەوە کۆ نابنەوە کاتێك اسمی إشارە های تنبیەی پێوە بێت.

ش ٢٤ / رایتُ بني غبراء لا ینکروننی ولا أهلُ هذاك الطّراف ِالمحدد[1].
وه دروست نیه لهم حالّهتدا[2] ، حهرفی کاف و لام پیّکهوهبن و نابیّت بلّیّیت ( هذا لكَ ) .

جا به پیّی قسهی ئاشکرای دانهر ئامارْه بوّ کراو تهنها دوو پلهی ههیه : نزیك و دوور وهکو باسمان کرد ، بهلاّم زوّربهی زانایان لهسهر ئهوهن ئامارْه بوّ کراو ( مشار الیه ) سیّ پلهی ههیه : نزیك ، ناوهند ( وسط ) ، دوور ، جا ئامارْه دهکریّت بوّ ئامارْه کراوی نزیك به ناویّك[3] ، نه حهرفی کاف و نه حهرفی لام پیّوه بیّت وهکو : ذا ، وذي ، وه ئامارْه دهکریّت بوّ ئامارْهی مام ناوهند به ناویّك که تهنها حهرفی کافی پیّوه بیّت : ذاك ، ههروهها ئامارْهی دهکریّت بوّ ئامارْه بوّ کراوی دوور به ناویّك که حهرفی کاف و حهرفی لامیش پیّوه بیّت وهکو ( ذالك ).

٨٦- وبهُنا او ههُنا اشِر إلی دانی المکانِ ، وبه الکاف صلا
٨٧- في البعد ، او بثَمَّ فُهْ او هُنَّا او بهنا لك انطقن ، أو هِنّا[4]

---

[1] مانای ئهم دیّره شیعره و بهلّگهکهی به کورتی : دلّنیام که ههموو خهلّکی به ههژار و دهولّهمهندهوه من دهناسن ( بني غبراء ) مهبهست خهلّکی ههژاره ، ( الطراف المحدد) مهبهست خهلّکی دهولّهمهنده.

بهلّگه ( شاهد )ی ئهم دیّره : به کارهیّنانی ووشهی ( هذاك ) که هائی تنبیهی پیّوهیه و له کوّتایشهوه تهنها حهرفی کافی پیّوهیه و لامی پیّوه نیه.

[2] واتا له حالّهتی هاتنی حهرفی های تنیهی له سهرهتای ناوهکهوه.

[3] واتا : ناوی ئامارْه ( اسم الاشارة ).

[4] کورتهی مانای ئهم دوو دیّرهی ئهلفیه بهم شیّوهیه : (٨٦) به ووشهی هُنا یان ههنا ئامارْه بکه بوّ شویّنی نزیك ، وه پیّوهی بلکیّنه حهرفی کاف . (٨٧) له کاتی ئامارْه کردن پیّی واته ( هنا ) بوّ شویّنی دوور ، یان ئامارْه بکه به شویّنی دوور به

ئاماژه دهكريت بۆ شوينى نزيك به ووشهى ( هُنا ) وه دروسته پيتى هاى ئاگادار كردنهوه ( تنبيه ) پيشى كهويت ئهو كات دهوتريت ( ههنا ) ، وه ئاماژه دهكريت بۆ شوينى دوور – لهسهر بۆچوونى دانهر به ( هُناك ، وهنالِكَ ، و هَنَّا ) ئهم ناوهيان دهكريت به ( هِنَّا ) بخوينريتهوه واته پيى هايهكهى كسره دار بيت وه دهكريت ( ثَمَّ ) و ( هِنَّت ) يش بهلام به پيى بۆ چوونى غهيرى دانهر ووشهى ( هناك ) بۆ ئاماژه كردنه بۆ شوينى مام ناوهند ( متوسط ) وه ئهوانى تر [1] ، بۆ شوينى دووره.

تيبينى : ئهسماى اشاره ههموويان مبنين جگه له ( هذان و هاتان ) كه بۆ دووان ( مثنى ) به كاردين زانايانى ( نحو ) رايان جيايه دهربارهيان ، ههنديكيان پييان وايه ( هذان و هاتان ) معربن چونكه لايهنى ( تثنية ) زالبوه بهسهرياندا ، وه ههنديكييان پييان وايه ( هذان و هاتان ) مبنين وهكو سهرجهم ناوهكانى ديكه.

* ليرهدا كۆتايى به بابهتى جۆرى سىْ يهمى ناوه ناسراوهكان هات كه بريتيى بوو له ئهسماى إشاره ، إن شاء الله له وانهى ئاينده‌دا دهچينه سهر جۆرى چوارهمى ناوه ناسراوهكان كه بريتيه له ئهسماى موصوله.

---

ووشهى ( ثَمّ ) يان به هَنَا ، يان به هنالك يان به هِناً ، واته ووشهكانى ( هناك و ثَمَّ و هَنَّا و هنالك و هِنَّا ) ههموويان به كاردين بۆ ئاماژهكردن بۆ شوينى دوور.

[1] مهبهست لهوانى تر بريتيه له ناوهكانى ( ثَمَّ و هَنَّا وهنالك و هِنَّا ).

# جۆری چوارەم لە ناوە ناسراوەکان
# النوع الرابع من المعارف ( الموصول )[١]

٨٨- موصولُ الاسماء الذي، الانثى التي     واليا إذا ما ثُنيا لا تُثبتِ
٨٩- بَلْ ما تليه أوْله العلامة     والنون إنْ تشدد فلا مَلامه
٩٠- والنون مِنْ ذَين وتَيْنِ شُددا     أيضاً ، وتعويضٌ بذاك قصد[٢]

دابەش دەبێت موصول بۆ دوو جۆر : اسمی و حرفی.

جا دانەر باسی موصولاتی حەرفی نەکردوە ، کە پێنجن :

یەکەمیان : حەرفی ( أنْ )ی مصدریه[٣] ، ئەم حەرفە لە دوایەوە فعلی متصرف[٤] دێت جا ئەو فعلە ڕابردوو ( ماضی ) بێت وەکو :

---

[١] وشەی ( موصول ) اسمی مفعولە و لە فعلی ( وصل ) وەرگیراوە ، واتە گەیەندراو، جا لە زاراوەی ڕێزمانی عەرەبیدا موصول بەو وشانە دەڵێن کە بە تەنها مانا ناگەیەنن بەڵکو پێویستیان بە ڕستەکەی دوای خۆیان هەیە و بە هۆی ڕستەکەی دوای خۆیانەوە مانا دەگەیەنن.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕانەی ئەلفیە : ( ٨٨ ) ناوە موصولەکان بریتین لە ( الذی ) بۆ تاکی نێر ، بۆ مێ ( التي ) ، پیتی یای الذی و التي کاتێك کران بە دووان ( تثنیة ) نامێنێ. ( ٨٩ ) بەڵکو ئەوەی کە پیتی یا بە دوایدا هاتوە – کە بریتیە لە پیتی ذال لە الذي و تا لە التی پێیان بدە علامەی مثنی – واتا پیتی ذال لە الذی دا و پیتی تا لە التی دا خۆیان مکسورن – بەڵام کاتێك دەکرێن بە دووان ( تثنیة ) مفتوح دەبن ، وە ئەگەر نونی (الذان و اللتان ) شەدە دار بکەیت هیچ لۆمەت لەسەر نیە واتا دروستە. ( ٩٠ ) هەروەها پیتی نون لە هەردوو ناوی ( ذین و تین ) کە اسمی اشارەن – شەدە دار کراون ، مەبەست لە شەدەدار کردنەکە بری حەرفی یای حذف کراوە. واتا : یای الذي و التي.

[٣] بۆیە پێی دەوترێت مصدریه چونکە لەگەڵ ڕستەکەی دوای خۆیدا تاویل دەکرێن بە مصدر وەکو ڕوون دەبێتەوە لە نمونەکان.

[٤] فعلی متصرف ئەو فعلانەن کە ماضی و مضارع و امر و اسمی فاعل و اسمی مفعولی لێ دروست دەبێت ، واتە دەگۆڕێن و جێگیر نین پێچەوانە ( عکس )ی فعل جامد.

( عجبْتُ من أنْ قامَ زيدٌ )[1] ، يان ڕانەبردوو ( مضارع ) بێت وەکو( عجبْتُ من ان يقومَ زيدٌ )[2] ، يان فرمانی داخوازی ( فعلی امر ) بێت وەکو ( أشرْتُ إليه بأنْ قُمْ )[3] ، جا ئەگەر حەرفی ( أنْ ) لە دوايەوە فعلێکی جامد[4] هات وەکو فەرمودەکەی خوای گەورە ﴿ وأن ليْس للإنسانِ إلاّ ما سعى ﴾[5] ، يان

---

[1] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەيە بەم شێوەيەيە : عجبْتُ : فعل و فاعل. /من/ حرف جر./ ان / حرف موصول مصدری. / قام / فعل ماضی مبني على الفتح. / زيدٌ / فاعل مرفوع. والجملة الفعلية ( قام زيدٌ ) مع ان المصدرية في محل جر اسم مجرور والتأويل ( عجبْتَ مِنْ قيام زيدٍ ).

[2] ئەم ڕستەيەش وەکو ڕستەی پێشوو تر وايە ، تەنها جياوازيان ئەوەيە ئەميان فعلەکەی مضارعە.

[3] / اشرت / فعل و فاعل . / إاليه / جار و مجرور. / ب / حرف جر. / ان / حرف موصول مصدری. / قُمْ / فعل امر مبني على السكون و فاعله ضمير مستتر تقديره ( انت ). وأن وما بعده في تأويل المصدر في محل جر اسم مجرور والتأويل ( اشرْت إليه بالقيام ).

[4] فعلی جامد ئەو فعلانەن کە دەست کاری ناکرێن و نەگۆڕێن . واتا / تەنها بە يەك شێوە ( صيغە ) دێن و ناکرێنە مضارع و أمر.

[5] ئايەتی ( ٣٩ ) ی سورەی ( النجم ) کورتەی ماناکەی : بێگومان مرۆۆ جگە لە هەوڵ و کۆششی خۆی خاوەنی هيچی تر نيە.

إعرابی ئەم ئاياتە پيرۆزە بەم شێوەيەيە : و : حسب ما قبلها. ان : مخففه من ( أنَّ ) وهی حرف مشبه بالفعل و اسمه ، ضمير الشأن المحذوف تقديرهُ ( وانهُ ). / ليس / فعل ماضی ناقص مبنی على الفتح. / للإنسان / جار و مجرور متعلق بمحذوف خبر ليس مقدم. / إلاّ / اداة حصر واستثناء. / ما / حرف مصدری مبنی على السكون. او هو اسم موصول مبني فی محل رفع اسم ليس مؤخر. / سعى / فعل ماضی مبنی على الفتح المقدر ، وفاعله ضمير مستتر تقديره ( هو ). وجملة ( سعى ) مع ما المصدرية فی تأويل المصدر فی محل رفع اسم ليس. أو صله الموصول. إذا كان ما موصوله. . بەڵگە ( شاهد )ی ئەم ئايەتە : انْ مخففة لأنه وقع بعده فعل غير متصرف ( جامد ).

فەرموودەی :﴿ وأن عسى أنْ يكون قَدْ اقترب اجلهُم ﴾[١] لەم حاڵەتەدا[٢] ، (أَنْ ) دەبێتە ( مخفف من الثقيلة )[٣] و نابێتە مصدری.

دووەم / حرفی ( أنَّ )[٤] دەگەیەنرێتە اسم و خبرەکەی وەکو ( عجبتُ من أنَّ زيداً قائمٌ )[٥] ، وەکو فەرموودەی خوای گەورە ﴿ أَو لَمْ يَكْفِهِم أنَّا انزلنا ﴾[٦]

---

[١] ئایەتی ( ١٨٥ ) ی سورەی الاعراف. کورتەی ماناکەی : لەوانەیە نزیك بووبێتەوە کۆتای ژیانیان بێگومان.

إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیەیە : / و / حسب ما قبلها. / انْ / مخففة من الثقيلة. واسمه ضمير الشأن المحذوف. / عسى / فعل ماضي مبنى على الفتح-المقدر للتعذر ( وهو فعل جامد ). / انْ / حرف نصب ومصدر واستقبال. / يكون / فعل مضارع ناقص منصوب وعلامه نصبه الفتحة الظاهرة. واسمه : ضمير مستتر تقديره ( هو ) وانْ وما بعده ( يكون ) في محل رفع فاعل عسى. / قد / حرف تحقيق. / اقترب / فعل ماضى مبنى على الفتح. / اجلُ / فاعل مرفوع وعلامه رفعه الضمة الظاهرة وهو مضاف. / هُم / ضمير متصل مبنى على السكون في محل جر مضاف إاليه. وجمله ( قد اقترب اصلهم ) في محل نصب خبر يكون.

الشاهد في هذه الأية / ان المخففه لأنه وقع بعده فعل جامد وهو ( عسى ).

[٢] واتە / کاتێك فعلی جامدی بە دوادا هات.

[٣] مخفف من المثقل / مەبەست ئەوەیە لە ئەصلدا ( انَّ ) شدەی هەیە بەلاّم شدەکەی لا دەدرێت و بە سوکی دەخوێنرێتەوە بۆیە پێی دەوترێت ( مخفف من المثقل ) دواتر بە تفصیل باس دەکرێت إن شاء الله لە باسی إنَّ واخواتها.

[٤] حەرفی ( انَّ ) یەکێکە لەو شە حەرفەی پێیان دەوترێت ( الحروف المشبهه بالفعل ) دواتر باس دەکرێن.

[٥] / عجبْتُ / فعل و فاعل. / مِن / حرف جر. / انَّ / حرف مشبه بالفعل. / زيداً / اسم انَّ منصوب. / قائم / خبر ان مرفوع . وانَّ وما بعدها في محل جر اسم مجرور و التقدير ( عجبْتُ من قيام زيد ).

[٦] ئایەتی ( ٥١ ) سورەی ( القصص ) کورتەی ماناکەی : ئایە بۆ ئەوان – ئەوانەی داوای بەڵگە دەکەن – بەس نیە کە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆ تۆ.

جا ( أنْ )ی مخففیش وەکو ( مثقل ) وایە دەگەیەنرێتە اسم و خبرەکەی ، بەلاّم لە مخفف دا اسمەکەی محذوفە و لە مثقلدا اسمە کە محذوف نیە ومذکورە[1].

سێ یەم / حەرفی ( کي )[2] لەدوایەوە تەنها فعلی مضارع دێت وەکو( جئتُ لکي تکرمَ زیدٌ )[3].

چوارەم / ( ما )[4] ئەمیش دەبێتە مصدری ظرفی وەکو : ( لا اصحبُكَ ما دُمتَ منطلقاً ) واتە { هاوەڵیت ناکەم ماوەی ئەوندە دەڕۆم } وە دەکرێت ما مصدری بێت و ظرفی[5] نەبێت وەکو ( عجبتُ مما ضربْتَ زیداً ) جا حەرفی

---

إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە بەم شێوەیە : / أ / حرف استفهام إنکاري تقریري مبني على الفتح لا محل له من الاعراب. / و / حرف عطف. / لم / حرف نفي وجزم وقلب./ یکفِ / فعل مضارع مجزوم ب / لم / وعلامة جزمه حذف الیاء لأنهُ معتل الأخر. / همْ/ ضمیر متصل مبني على السکون في محل نصب مفعول به. / أنّا / أنَّ : حرف نصب وتوکید مصدری / نا / ضمیر متصل مبني على السکون في محل نصب اسم أنَّ. / انزلْنا / فعل ماضي مبني على السکون لاتصال ب ( نا ) الفاعل. / نا / ضمیر متصل- -مبني على السکون في محل رفع فاعل ( انزل ) وأنَّ و ما دخل علیه في محل رفع فاعل ( یکف ) والتقدیر ( أولم یکفهم إنزالنا ).

الشاهد في هذه الأیة : استعمال ( أنَّ ) کموصول حرفي ، وهی توصل باسمها وخبرها.

[1] دواتر لە باسی ( انّ و اخواتها ) باسی ئەم بابەتە بە تفصیلی دەکەین إنشاالله.

[2] ( کی ) لە زمانی عەرەبیدا چەند مانایەکی هەیە ، یەکێکیان ئەمەیە کە دەبێتە ( حرف مصدری واستقبال ) بە مانای هۆ ( سبب ) دێت.

[3] تقدیری ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە ( جئتُ لإکرام زیدٍ ).

[4] ( ما ) لە زمانی عەرەبیدا چەن مانایەکی هەیە یەکێکیان دەبێتە مصدری ( ظرفی ) جا بۆیە دەوترێت مصدری چونکە لەگەڵ دوای خۆیدا دەبنە مصدرێك ، وە بۆیە پێی دەوترێت ( ظرفي ) ظرف واتە کات و ماوە چونکە بە مانای ماوە دێت.

[5] واتا / باسی کات و ماوەی تێدا نەبێت.

ما دەگەينرێتە فعلى ماضى وەكو نمونەمان هێنايەوە ، وە دەگەيەنرێتە فعلى مضارع وەكو ( لا أصحبك ما يقومُ زيدٌ[١] ، وعجبتُ مما تضربُ زيداً[٢] ) لەم جۆرەيە[٣] فەرموودەى خواى گەورە﴿بما نسوا يوم الحساب﴾[٤] ، هەروەها ما دەگەيەنرێتە جملەى اسمى وەكو (عجبتُ مما زيدٌ قائمٌ و لاأصبحك ما زيدٌ قائمٌ)[٥]ئەمەش كەمە [٦] ،

---

[١] إعرابى ئەم ڕستەيە : / لا / نافية غير عاملة. / اصحبُ / فعل مضارع مرفوع ، وفاعله ضمير مستتر تقديره انا. / كَ / ضمير متصل مبني على الفتح في محل نصب مفعول به / ما / حرف موصول مصدري ظرفي. / يقومُ / فعل مضارع مرفوع.
/ زيدٌ / : فاعل مرفوع وتقدير هذه الجملة ( لا اصبحك مُدة قيام زيد ).

[٢] لەم ڕستەيەشدا (ما) فعلى مضارعى بە دوادا هاتوە بەلأم لێرەدا ( ما ) نابێتە ظرفي واتا باسى ماوە و كاتى تێدا نيە

[٣] واتا ( ما )ى گەيندراو بە فعل.

[٤] ئايەتى ژمارە ( ٢٦ ) ى سورەى (ص) كورتەى ماناكەى : ئەوانەى لە ڕێى خوا لادە دەن گومڕان سزاى سەختيان بۆ هەيە – چونكە ڕۆژى لێپرسينەوەيان لە بيركردبوو. إعرابى ئەم ئايەتە پيرۆزە بەمە شێوەيەيە : /ب/ حرف جر. /ما/ مصدرية مبني على السكون مؤولة مع ما بعدها بمصدر تقديره ( بسبب نسيانهم ) والجار و المجرور (بما) متعلقان بمحذوف حال /نسوا/ فعل ماضي مبني على الضم لاتصاله بواو الجماعة. / وا / ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل. والالف: فارقة. / يومَ / مفعول فيه ( ظرف زمان ) منصوب وعلامة نصبه الفتحة وهو مضاف. / الحساب / مضاف إليه مجرور وعلامة جره الكسرة.
( الشاهد في هذه الأية ) استعمال ( ما ) المصدرية غير الظرفية كموصول حرفي ، وقد وصلت هنا بالفعل الماضي.

[٥] لەم دوو ڕستەيەدا ( ما ) مصدري بە دوايدا جملەى اسمى هاتووە ، لە يەكەمياندا ( ما ) مصدرية غير ظرفية ، وە لە دووەمياندا مصدرية ظرفية ، تقديرى ڕستەى يەكەم ( عجبتُ من قيام زيدٍ ) وە تقديرى ڕستەى دووەم ( لا اصبحك مدة قيام زيد ).

[٦] واتە / هاتنى جملە اسمى لە دواى ( ما )ى مصدري.

زۆرتر وایه ( ما ) ی مصدری ظرفي بگەینرێتە فعلی ماضي و مضارعێك كه نفی كرابێت بەهۆی حەرفی ( لمْ ) وەكو ( لا اصبحك ما لم تضربْ زيداً ) وه كەمتر وایه مای مصدری بگەینرێتە مضارعێك كه نەفی نەكرا بێت به ( لَمْ ) وەكو :

( لا أصبحك ما يقومُ زيدٌ ) و وەكو ووتەی شاعیر :

ش٢٥ / أُطوّف ما اطوّف ثم اوي    إلى بيتٍ قعيدته لكاع[١].

پێنجەم / حەرفی ( لو )[٢] كه دەگەینرێتە فعلی ماضي وەكو ( وددْتُ لو قام زيدٌ )[٣] هەروەها دەگەینرێتە فعلی مضارعیش وەكو ( وددْتُ لو يقومُ زيدٌ)[٤].

جا كه دانەر فەرمووی ( موصول الاسماء ) خۆی پاراست لە حەرفە موصولەكان كه بریتین له ( أن وأنّ وكي وماولو ) نیشانەی موصول بوونی ئەم حەرفانەش ئەوەیە ڕاست و دروست بێت مصدر له جێیان دانیشێت و ماناكەشی تەواو بێت وەكو ( وددْتُ لو تقومُ ) واتە قيامك[٥] ، وه وەكو

---

[١] كورتە مانای ئەم دێرە شیعرە : بەم ڕۆژگارە دەگەڕێم و دەسوڕێمەوە بۆ پەیداكردنی بژێوی ژیان – پاشان دێمەوە بۆ ماڵێك كه خانمەكەی بیٚ ڕێزو هیچ و پوچە . بەڵگە ( شاهد )ی ئەم شیعرە : ( ما اطوف ) (ما)ی مصدری به دوایدا فعلی مضارع هاتووە و فعلەكەش منفی نیە به ( لم ).

[٢] ( لو ) له زمانی عەرەبیدا پێنج مانا و بەكارهێنانی هەیە : یەكێكیان بریتیە له (مصدری ) به زۆری وایە لەم حاڵەتەدا ( لو ) له دوای فعلی ( وَدَّ ) و هاوماناكانی ( ودَّ) ەوە دێت.

[٣] تقدیری ئەم جملەیە ( وددْتُ قيامَ زيد ).

[٤] ئەم ڕستەیەش به هەمان شێوەی پێش خۆی تقدیر دەكرێت واتە دەبێتە ( وددْتُ قيامَ زيدٍ ).

[٥] مەبەستی ئەوەیە حەرفی ( لو ) لەگەڵ فعلە مضارعەكەی دوای خۆی دەكرێتە مصدرێك وه دەبێتە ( قيامك ).

(عجبتُ مما تَصنع[١] ، وجئتُ لكي أقرأ[٢] ، ويُعْجبني انّك قائم[٣] ، وأريدُ أنْ تَقُوم[٤])
پێشتر باسكرا.

جا ناوه موصولەكان بریتین له ( الذي ) بۆ تاكی نێر ، وه ( التي ) بۆ تاكی مێ جا ئەگەر ئەم دوو ناوه بكەیته مثنی ئەوه پیتی كۆتاییان كه ( یاء )ەكه لا دەبەیت و له جێگەی ئەو یائه حەرفی ئەلیف دێنێت له حاڵەتی رفعدا وەكو :
( اللذانِ واللتانِ )ـه و له حاڵەتی نصب و جردا یائی مثنی دێنێت و دەڵێیت (اللّذينِ ، اللّتيْنِ ). وه دەتوانیت ئەم نونه[٥] شەدە دار كەیت– له بری یایه حذف كراوەكه[٦]– دەڵێت ( اللذانِّ واللتانِّ ) ئەم ئایەته پیرۆزه خوێندراوەتەوه ﴿ واللّذانِّ يأتيانها منكم ﴾[٧] ، هەروەها دروسته شەدە بدرێته نونەكه لەگەڵ حەرفی یاشدا[٨] – ئەمەش بۆ چوونی كوفیەكانه

---

[١] تقدیری ئەم ڕستەیەش بەم شێوەیه ( عجبتُ من صُنْعِك ).

[٢] ئەم ڕستەیەش بەم شێوەیه تقدیر دەكرێت ( جئت للقراءة ).

[٣] ئەم ڕستەیەش تقدیر دەكرێت به ( يعجبني قيامُك ).

[٤] واته ( اريدُ قيامَكَ )

[٥] واتا / نونی اللتان واللذان.

[٦] واتا حەرفی یای ووشەی ( الذي و التي ) كاتێك دەكرێنه مثنی حەرفی یایەكەیان حەذف دەكرێت.

[٧] ئایەتی ( ١٦ )ی سورەتی النساء . كورتەی ماناكەی { ئەو دوانەی – مەبەست كوڕ و كچه – ئەو كاره پیسه ( زینا ) دەكەن ئەوه سزایان بدەن ......}
إعرابی تەواوی ئەم ئایەته بەم شێوەیەیه { / و / حسب ما قبلها. / اللذانِّ / مبتدا مرفوع وعلامة رفعه الالف لأنه مثنى. وقيل / اسم موصول مبني في محل رفع مبتدا. / ها / ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. / منكم / جار و مجرور. والجملة الفعلية ( يأتيانها ) في محل رفع خبر * الشاهد في هذه الآية هو : تشديد النون عوضاً عن الياء المحذوفة من المفرد.

[٨] واتا / له حاڵەتی نصب دا كه بریتین له ( اللّذينِّ ، اللتينِّ ).

دەڵێـت ( اللــذینَّ و اللــتینَّ ) وە خوێندراوەتـەوە ئـەم ئایەتـە ﴿ ربّنـا ارنـا اللذینَّ﴾[1] بــە شـــەدەی حــەرفی نــونــەکــە.
جا ئەم شەدە دارکردنی نونە دروست بۆ مثنـای ( ذا و تا ) کە دوو ناوی إشارەن ، دەڵێت ( ذانّ ، تانّ ) هەروەها لەگەڵ حەرفی یا شدا دروستەو دەڵێیت(ذَینَّ و تَینَّ) ئەمەش بۆ چوونی کوفیەکانە – وە مەبەست لەم شەدەدار کردنە لە جیاتی ئەلیفە حذف کراوەکەیە[2] وەکو پێشتر باس کرا لە ( الذي و التي )[3].

٩١– جمع الذي الأُلى الذين مطلقاً　　　وبعضهم بالواو رفعاً نطقاً
٩٢– باللاتِ واللاءِ – التي قَدْ جُمِعا　　　واللاَّءِ كالذين نزراً وقعا[4].

---

[1] ئایەتی (٢٩)ی سورەی فصلت. کورتەی ماناکەی بەم شێوەیەیە { ئەوانەی بێ باوەڕن لە دۆزەخدا دەڵێن ئەی پەروەردگارمان نیشانمان بدە ئەو دووانەی گومڕایان کردین– جنۆکە و مرۆڤ }.
إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە پیرۆزە : رَبّنا / منادی – بحرف نداء محذوف – منصوب وعلامة نصب الفتحة وهو مضاف ( نا ) ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. / ارِنا / أرِ : فعل امر مبني على حذف حرف العلة لأنه معتل الآخر ، وفاعله ضمير مستتر تقديره ( انت ) / نا / ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به اول. / اللّذينَّ / اسم موصول في محل نصب مفعول به ثانٍ.
الشاهد في هذه الآية : جواز تشديد النون مع وجود الياء ، وهذا مذهب الكوفيين.
[2] واتا ئەلفی ( ذا و تا ) کاتێك دەکرێنە دووان ( مثنی ).
[3] هەروەکو چۆن ( الذي و التي ) کاتێك دەکرێنە مثنی یایەکەیان حذف دەبێت ، ( ذا و تا )ش کاتێك دەکرێنە دووان ئەلیفەکەیان حذف دەکرێت.
[4] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە : (٩١ ) کۆ ناوی ( الذي ) بریتیە لە ( الأُلی ) و ( الذين ) بۆ حاڵەتی رفع و نصب و جر ، وە هەندێ لە عەرەب بۆ حاڵەتی رفع دەڵێن ( الذون ). (٩٢) هەروەها کۆ ناوی ( التي ) بریتیە لە ( اللاَّءِو اللاّتِ ، وە بە کەمی اللاء – کە بۆ مؤنثە – وەکو الذين بە کاردێت.

بۆ جمعى مذكر ناوى ( الأُلى ) به كارديّت به ڕەهايى واته عاقلْ بيّت يان نا عاقلْ بيّت ، وەكو ( جاءنى الأُلى فعلوا )[١] ، وە بەكەمى بەكارديّت ( الأُلى ) بۆ جمعى مؤنث ، كۆبۆتەوە هەردووكيان[٢] لە ووتەى شاعير :

ش٢٦ / وتبلي الأُلى يستلئمون على الالى تراهُنَّ يوم الروع كالحدا القُبْلِ[٣].

جا شاعير ووتى ( يستلئمون ) پاشان ووتى ( تراهُنَّ )[٤] ، وە دەوتريّت بۆ جمعى مذكرى عاقل ( الّذين ) به ڕەهايى واتا : بۆ حالّەتى رفع و نصب و جر ، دەلّيّت : (جانى الذين اكرموا زيداً ، ورايتُ الذين اكرموه ، ومررْت بالذين اكرموه )[٥] ، وە هەنديّ لە عەرەب دەلّيّن ( الّذون ) بۆ حالّەتى رفع و ( الّذين ) بۆ حالّەتى نصب و جر، ئەوانيش ( بنو هُذيل ) ن ، جاووتەى شاعير بەلّگەيە[٦]

ش٢٧ / نحنُ الذون صبّحوا الصّباحا يوم النخيل غارةً ملحاحاً[٧].

---

[١] ليّرەدا ( الأُلى ) بەكارهاتوە بۆ جمعى مذكر لەبەر ئەوەى واوى جماعە لە ڕستەى (اكرموا )ى بۆ دەچيّتەوە.

[٢] واتا : بەكارهيّنانى ( الالى ) بۆ جمعى مذكر و وە بۆ عاقلْ و نا عاقلْ.

[٣] ماناى ئەم ديّرە شيعرە بە كوردى : ئەرزێنیْ مردن ئەو جەنگاوەرانەى زريّيان ئەپۆشى لە كاتى جەنگدا و دەيان بينى لەسەر ئەسپەكانن وەكو كۆلارەى خيّل خيّرا و سەريعن.
بەلّگەى ئم شيعرە : بەكارهيّنانى ناوى ( الالى ) ى يەكەم بۆ جمعى مذكرى عاقلْ بەكارهاتوە و ( الالى ) ى دووەم بۆ جمعى مؤنثى سالم نا عاقلْ بەكار هاتوە.

[٤] يستلئمون : واتا زريّى جەنگى دەپۆشين. تراهُنَّ : ئەو ئەسپانە دەبينى.

[٥] لەم سێ ڕستەيەدا ( الذين ) هاتووە لە ڕستەى يەكەمدا ( الذين ) فى محل رفع فاعله. وە لە ڕستەى دووەمدا لە دواى ( رايتُ ) هاتووە كەواتە دەبيّتە اسم موصول مبني فى محل نصب مفعول. وە لە ڕستەى سێ يەم دا ( الذين ) لە دواى حەرفى جرەوە هاتوە بۆيە دەبيّتە اسم موصول مبني في محل جر اسم مجرور.

[٦] واتا بەلّگەيە بۆ ئەو ڕايەى دەلّيّت بۆ حالّەتى رفع ( الذون ) بەكارديّت.

[٧] مانا و بەلّگەى ئەم ديّرە شيعرە بە كوردى : ئيّمە ئەوانە بووين كە لەبەرەبەياندا هەستاين بە هيّرشيّكى گەورە بۆ سەر دووژمنان لە ڕۆژى نوخەيلدا – النخيل– ناوى شويّنيّكە كە جەنگەكەى ليّبووە.

هەروەها بۆ جمعی مؤنث دەوترێت ( اللاَتِ ، واللاء ) به حذف کردنی یای کۆتایی[1] ، دەڵێیت ( جاءنی اللاّتِ فَعَلْنَ[2] ، واللاءِ فَعَلْنَ ، هەروەها دروستیشه جێگیر کردنی یائەکەی ، دەڵێت ( اللاّتي واللاّئي ) هەروەها هاتوه ( الّلاء ) به واتای الذین ، شاعیریش دەڵێت :

ش٢٨ / فما اباؤُنا بأَمَنَّ منه          علينا اللاّءِ قد مهدوا الحجورا[3]

هەروەکو چۆن ( الاولی ) به واتای ( اللاء ) دێت ، وەکو ووتەی شاعیر :

فأمَّا الاولى يسكُنُّ غور تهامةٍ          فكلُّ فتاةٍ تترك الحِجْل أقصما[4].

* باسی ( مَنْ و ما و ال ) ی موصوله.

٩٣- ومَنْ ، وما ، وال ، تُساوي ما ذكر          وهكذا ( ذو ) عند طيّئٍ شُهر

---

بەڵگەی ئەم دێرە : ناوی ( الذون ) به واو هاتوه بۆ حاڵەتی رفع.

[1] مەبەست ئەوەیه هەردوو ناوی ( اللاتي و اللاّئي ) دەتوانین یای کۆتاییان باس کەین و دەتوانین حذفی کەین. دروسته

[2] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیه بەم شێوەیەیه : /جاء / فعل ماضي مبني على الفتح. /ن/ نون الوقاية/ی / ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به مقدم /اللاتِ/ اسم موصول مبني في محل رفع فاعل/ فَعَلْنَ/ فَعَل : فعل ماضي مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك./ نَ/ نون النسوة ضمير متصل مبني على الفتح في محل رفع فاعل،والجملة الفعليه( فعلن )لامحل لها من الاعراب(صلة الموصول)

[3] واتای ئەم دێرە شیعرە : باوکانمان کە بەخێویان کردین و باوشیان بۆ کردین بە لانکە لەو – مەبەست کەسێکە – چاکترینین بۆمان . بەڵگەی ئەم دێرە : بەکارهێنانی ( اللاء ) بۆ جمعی مذکر کە ووشەی ( اباء )ە.

[4] ئەم دێرە شیعرە لە هەندێ نسخەکانی شرحی ابن عقیل دا هاتوە و لە هەندێکی تردا نەهاتوە بۆیە ژمارەی بۆ دانەنراو ، و ماناکەی { بێگومان ئەوانەی نیشتەجێی – غورەی تهامەی – ناوی شوێنێکە – ، هەموو کچۆڵەیەك کە گەورە دەبێت خرخاڵەکانی دەشکێت } مانای ئەم دێرە پەیوەندی بە دێرەکانی تری شیعرەکەوە هەیە.

٩٤- وكالّتي ايضاً لديهم ذاتُ          ومَوْضِعَ اللاتي اتى ذوات.[1]

ئاماژەی كرد به ووتەی ( تساوی ما ذكر ) بۆ ئەوەی كه ناوی موصولی ( من و ما ) هەروەها ئەلیف و لامی موصول[2] ، بەیەك شێوە دێن بۆ مذكر و مؤنث و مفرد و مثنى و جمعيش[3]،دەڵێیت : جاءني مَنْ قام[4] ، ومَنْ قَامَتْ[5] ، ومَنْ قاما[6] ، ومن قامتا[7]، ومَنْ قاموا[8] ، ومَنْ قمن[9] ، واعجبني مارُكِبَ ، ومارُكِبَتْ ، وما رُكبا ، وما ركبتا ، وما ركبوا ، وما ركبْنَ[10] ، و جاءني القائم[11] ، والقائمةُ ، والقائمان ، والقائمتان ، والقائمون ، والقائماتُ.

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە : (٩٣) هەرسێ ناوی ( من و ما و ال ) هاوتای ئەوانەن باسكران – واتا بەكاردێن بۆ هەموو ئەسمای موصوله له مفرد و مثنى و جمع . و هەروەها لای طائیەكان ووشەی ( ذو ) به موصولی بەكاردێت. (٩٤) هەروەها بەكارهاتوه ناوی ( ذاتُ ) له جێی التي وه ناوی ( ذواتُ ) له جێی اللاّتي.

[2] ئەلیف و لامی موصول خیلافی تێدایه لەوەی كه حەرفه یان ناوه دواتر باسی دەكەین إن شاء الله.

[3] واته من و ما و ال – بۆ هەموویان بەیەك شێوه بەكاردێت و ناگۆڕێن.

[4] لێرەدا ( من ) بۆ مفردی مذكره ،به پێی ئەو ڕاناوەی لەفعلەكەدا هەیه كەپێی دەوترێت ( عائد )دەزانین بۆ مفردی مذكره.

[5] بۆ مفردی مؤنثه.

[6] بۆ مثنى مذكره.

[7] بۆ مثنى مؤنثه.

[8] لێرەدا من بۆ جمعی مذكر بەكارهاتوه.

[9] لێرەشدا بۆ جمعی مؤنث.

[10] دەبینین شەش جار ( ما ) بەكارهاتوه ، سیانیان بۆ مذكر و سیانیان بۆ مؤنث هەمووی بەیەك شێوه هاتوه.

[11] لێرەدا ( القائم ) ئەلیف و لامەكەی موصولەو به واتا ( الذي قام ) دێت ، جا زانایان خیلافیان هەیه له إعراب كردنی ( ال )ی موصول هەندێكیان پێیان وایه ( الْ )

جـا بـە زۆری بـەکـاردێـت (مـا) بـۆ غـەیری عاقڵ ،هەندێ جاری بەکاردێت بۆ عاقڵ ، وەکو فەرمودەی خوای گەورە ﴿ فا نكحوا ماطاب لكم من النساء مثنى ﴾[1] ، وەکو ووتەی عەرەب ﴿ سبحانَ ما سخركُنَّ لنا ﴾[2] ، هەروەها ﴿ سبحان مایسبح الرعدُ بحمده ﴾ [3].

بـەڵام نـاوی ( مَـنْ ) بـە پێـچەوانـەوە ، واتـا زۆر بـەکـاردێـت بـۆ عـاقڵ و کـەمـجاریـش بـۆ غـەیـری عاقـڵ بەکاردێت ، وەکو

دەبێتە { اسمى موصول مبني على السكون في محل رفع او نصب او جر – حسب موقعه من الجملة } ، وە هەندێکیان پێیان وایە ئەلیف و لامەکە لەگەڵ صلەکەیدا پێکەوە إعراب دەکرێن، ئەم رایەش جوانترە، کەواتە ( القائمُ ) لەم ڕستەیەدا دەبێتە فاعل مرفوع وعلامه رفعه الضمة الظاهرة. بەڵام بە پێی ڕای یەکەم ( القائم ) ( الْ ) دەبێتە اسم موصول مبني على السكون في محل رفع فاعل . ( قائم ) صله ال.

[1] ئایەتی (٣)ی سورەی النساء. کورتەی ماناکەی { مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆ تان دوو دوو ..... }

إعرابی تەواوی ئەم ئایەتی پیرۆزە بەم شێوەیەیە : فانكحوا / فا / واقعة في جواب شرط في بداية الآية. / انكحوا / فعل أمر مبني على حذف النون لأنه من الافعال الخمسة. / وا / واو الجماعة : في محل رفع فاعل . / ما / اسم موصول مبني على السكون في محل نصب مفعول به. / طاب / فعل ماضي مبني على الفتح. والفاعل ضمير مستتر تقديره ( هو ) / لكم / جار و مجرور متعلق ب ( طاب ) / من النساء ) جار و مجرور متعلق ب ( طاب ) / مثنى / تمييز منصوب وعلامه نصبه الفتحة المقدرة منع من ظهورها التعذر.

* الشاهد في هذه الآية / استعمال ( ما ) الموصولة في العاقل مع كونها تستعمل في غير العاقل غالباً.

[2] ئەم ڕستەیەش گێڕدراوەتەوە لە هەندی عەرەب کاتێك گوێیان لە دەنگی هەور بووە و ماناکەی { پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی هەوری بۆ رام کردوین }.

[3] مانای ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە { پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی هەورە گرمە تسبیحات و ستایشی دەکات } لە کتێبەکانی فەرمودەدا ئەم نزایە دانراوە بۆ نزای هەورە گرمە.

فەرموودەی خوای گەورە ﴿ ومنهمْ مَنْ يَمْشي على أربعٍ يخلق الله من يشآء ﴾[1] ، هەروەها وتەی شاعیر کە دەڵێت :

ش٢٩/ بكيتُ على سِرْب القطا إذ مررْن بي فقلْتُ ومثْلي بالبكاء جدير

اسرْبَ القطا هَلْ مَنْ يُعير جناحَه لعلّي إلى مَنْ قد هويْتُ اطير[2]

هەروەها ئەلیف و لام[3] بۆ عاقڵ بەکاردێت و بۆ غەیری عاقڵیش ، وەکو (جاءنی القائم ، والمركوب )[4] ، جا زانایان خلافیان هەیە لە ئەلیف و لام ، هەندێکیان پێیان وایە اسمی موصولە ئەمەش ڕای ڕاستە ، وە هەندێکیان دەڵێن : حەرفی موصولە ، وە وتراوە : ئەلیف و لام حەرفی تعریفەو موصول نیە.

---

[1] ئایەتی (٤٥)ی سورەی النور ، کورتەی ماناکەی { ... وە هەشیانە لەسەر چوار پێ دەڕوات ، خوای گەورە هەرچی بوێت دروستی دەکات } إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیەیە : و / حرف عطف /منهم / جار و مجرور متعلق بخبر محذوف./ مَنْ / اسم موصول مبني على السكون في محل رفع مبتدا مؤخر. / يمشي / فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة للثقل. والفاعل : ضمير مستتر تقديره هو . والجملة الفعلية لا محل لها من الاعراب صلة الموصول. على أربع : جار و مجرور متعلق ب(يمشي ).

الشاهد في هذه الآية : استعمال ( مَنْ ) في غير العاقل.

[2] مانای ئەم دوو دێڕە شیعرە بە کوردی : گریام کاتێك پۆلێك قەتێ – جۆرە باڵندەیەکە – کە تێپەڕبوون بەلامدا ووتم هاوشێوەی منیش شایستەی گریانە ! هۆ کۆمەڵە قەتێ ئایا یەکێکتان باڵی خۆیم دەداتێ بە ئەمانەت بە هیوای ئەوەی بفڕم بۆ لای خۆشەویستم .

بەڵگە ( شاهد )ی ئەم دێڕە شیعرە : بە کارهێنانی ناوی موصولی ( من ) ە بۆ ناعاقڵ کە بریتین لە باڵندە.

[3] واتا ئەلیف و لامی موصولە.

[4] لەم دوو ڕستەیەدا دوو جار ئەلیف و لامی موصول هاتووە جارێك بۆ عاقڵ کە بریتیە لە ( القائم ) وە جارێکیش بۆ ناعاقڵ کە بریتیە لە ( المركوب ) واتا سواری.

بەلاّم ( من و ما )ی غەیری مصدری بە یەکدەنگی ناون ، وە ( ما )ی مصدري[١] ، ڕای ڕاست وایە حەرفە و بەلاّم ئەخفەش پێی وایە اسمە. هەروەها لای طائیەکان ووشەی ( ذو )[٢] بە موصولی بەکاردێت بۆ عاقڵ و غەیری عاقڵ و باوترین بۆ چوون و خوێندنەوەی طائیەکان بۆ ناوی ( ذو ) ئەوەیە کە بەکاربێت بەیەك شێوە بۆ نێر و مێ و تاك و دووان و کۆ، دەڵێت: ( جاءني ذو قام ، وذو قامَتْ ، وذو قاما ، وذو قامتا ، وذو قاموا ، وذو قُمْنَ ) ، وە هەیانە[٣] بۆ تاکی مێ دەڵێت( جاءني ذاتُ قامَتْ )[٤] ، وە بۆ کۆی مێ ( جاءني ذواتُ قُمْنَ )[٥] ، ئەمەیە ئاماژە بۆ کراو بە ووتەی دانەر کە ووتی ( وکالّتي ايضاً .... تا کۆتای دێڕ ) ، هەروەها هەشیانە[٦] ذو دەکاتە دووان و کۆ و دەڵێت : ( ذَوَا ، وذَوُو ) لە حاڵەتی رفع و ( ذَوَيْ ، وذَوِي ) لە حاڵەتی نصب و جردا ، هەروەها ( ذواتا ) بۆ حاڵەتی رفع و ، وە (ذَواتَيْ ) بۆ حاڵەتی نصب و جر[٧] ، و ( ذواتُ ) بۆ

---

[١] مەبەست ئەوەیە ( من وما ) بە چەند شێوازێك بە کاردێن لە زمانی عەرەبیدا ، جا ئەگەر من و ما لەگەڵ دوای خۆیاندا کرانە مصدرێك ئەوەی پێیان دەوترێت ( مصدرية ) بەلاّم ئەگەر لەگەڵ دوای خۆیاندا نەکرانە مصدر ئەوە دەبنە – غير المصدرية.

[٢] لە زمانی عەرەبیدا ناوی ( ذو ) دوو جۆرە : (١) ( ذو ) بە مانای خاوەن ( صاحب ) کە دەبێتە یەکێك لەشەش ناوەکە ( الاسماء الستة ) ومعربە پێشتر باسمان کرد. (٢) بە مانای ( ئەوەی ) یان ئەوانەی ( الذي ، الذين .. ) ئەمیش دەبێتە اسمی موصول و مبنیە و پێی دەوترێت ( ذو الطائية ).

[٣] واتا / لەناو طائیەکاندا هەیە.

[٤] لەم ڕستەیەدا ( ذاتُ ) بە مانای ( التي ) هاتووە و (مبني على الضمة في محل رفع فاعل ).

[٥] لەم ڕستەیەشدا ( ذواتُ ) بە واتای ( اللاّتي ) هاتووە و هەمان إعرابی ( ذاتُ ) ی هەیە.

[٦] واتا / لە ناو طائیەکان.

[٧] ئەگەر دووانی مێ ( مثنى مؤنث ) بێت.

جمع جا ذواتُ مبنیە لەسەر ضمە ، شیخ بهاالدین ابن النحاس ئەوەی گێڕاوەتەوە کە ( ذواتُ ) إعرابی وەکو إعرابی جمعی مؤنثی سالمە[١].

جا ڕای باو و زانراو ئەوەیە ( ذو )- ی موصولە- مبنیە ، بەڵام لە هەندێ لە عەرەب معرەبی دەکات بە واو لە حاڵەتی رفع و بە ئەلیف لە حاڵەتی نصب و بە یایش لە حاڵەتی جردا ، دەڵێن ( جاءنی ذو قام ، ورایْتُ ذا قام، ومـررْت بـذي قـام )[٢] ، کەواتە وەکو إعرابی ( ذی ) بە واتای خاوەن دەبێت[٣]، جا گێڕدراوەتەوە ووتەی شاعیر :

فإمّا كرامٌ موسرون لقيتُهمْ فحسبی مِنْ ذي عندهم ما كفانيا[٤]

بە ( ذی ) کەدەبێتە معرب هەروەها بە ( ذو ) دەبێتە مبنی[٥] .

بەڵام ناوی ( ذاتُ ) ڕای بەهێز و ڕەوان ئەوەیە مبنیە لەسەر ضمە لە حاڵەتی رفع و نصب و جردا وەکو ناوی ( ذواتُ ) وە هەندێ لە عەرەب إعرابی[٦] دەکات وەکو إعرابی مسلمات : رفعی دەکەن بە ضمە و نصب و جریشی دەکەن بە کسرە.

---

[١] واتا رفعی بە ضمەیەو و نصب و جری بە کسرەیە.

[٢] لێرەدا ( ذو )ی طائیە بەکارهاتووە بە معربی و إعرابیشی بە حروفە ، ئەمەش بۆ چوونی هەندێ لە طائیەکانە.

[٣] ( ذو ) کە بەمانای خاوەن بێت یەکێکە لەشەش ناوەکە ( الاسماء الستة ) پێشتر باسمان کرد.

[٤] پێشتر لە شاهیدی ژمارە (٤) دا ئەم دێڕەمان باسکرد ، بەڵام هەندێکیان بە ( ذی ) خوێندویانەتەوە.

[٥] واتا/ ئەو دێڕە شیعرە بە دوو شێوە گێڕدراوەتەوە لای زۆربەیان بە ( ذو ) کە مبنیە هەندێکیشیان بە ( ذی ) کە دەبێتە معرب.

[٦] واتا / ناوی ( ذواتُ ) معرب دەکەن ، بەڵام لای زۆربەیان مبنیە لەسەر ضمە.

٩٥- ومثلُ ما ( ذا ) بَعْدَ ما استفهام أو مَنْ إذا لمْ تُلْغَ في الكلام[١].

واتا / ( ذا )ی اسمی إشاره تايبەتە لە ناو هەموو اسمه اشارەكان بەوەی بە كاردێت وەكو ناوێكی موصول ، وە وەكو ( ما ) ی موصوله دەبێت لەو ڕووەوەی بەیەك شێوه بەكاردێت بۆ نێر و مێ و تاك و دووان و كۆ ، دەڵێیت : ( مَنْ ذا عندك ) و ( ما ذا عندك )[٢] جا یەكسانه ئەو شتەی لای ئەو[٣] تاكی نێر بێت یان غەیری تاك و نێر بێت[٤]. جا مەرجی بەكارهێنانی ذا بە موصولی ئەوەیە كە ( ما ) یان ( مَنْ ) ی پرسیار ( استفهام )ی لە پێشەوە بێت ، وەكو ( مَنْ ذا جاءك ، وماذا فعلت ) جا مَنْ : اسمی استفهامە و لە محلی مبتدایە ، و ( ذا ) دەبێتە اسمی موصول و بە واتای (الذی ) دێت و لە محلی رفعی خبر دايە بۆ ( مَنْ ) ، وە ڕستەی ( جاءَك )[٥] دەبێتە صلەی موصول[٦] ، ماناكەی[٧] دەبێتە ( مَنْ الذی جاءك ؟ )

---

[١] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : هاوێنەی ( ما )ی موصولەیە ناوی ( ذا )ی اسمی إشاره بە مەرجێك ( ما ) و ( من )ی پرسیاری لە پێشەوە بێت – واتە بڵێین – (ماذا ) و ( مَنْ ذا ) ، بە مەرجێك هەڵنەوەشێتەوە ئیش و مانای ( ذا )یەكە.

[٢] لێرەدا ( ذا ) لە دوو ڕستەدا بەكارهاتوە و لە هەردووكیاندا ( من وما )ی پرسیاری لە پێشەوەیە و بۆیە دەبێتە اسمی موصول.

[٣] واتا لای ئەو كەسەی دواندنەكەی لەگەڵ كراوە ، كە دەڵێیت ( ما ذا عندكَ )؟ هەرچییەكی لابێت تاك بێت یان دووان یان كۆ نێر یان مێ.

[٤] واتا / مێ بێت یان دووان یان كۆ.

[٥] جاءَك / ڕستەیەكی تەواوە و پێكهاتووە و لە فعلێكی ماضي ( جاء ) و فاعلێكی مستتر و مفعولێك كە جێناو ( ضمیری) ی ( كَ ).

[٦] هەموو موصولێك اسم بێت یان حەرف پێویستی بە ڕستەیەك یان نیمچە ڕستە ( شبه جمله ) یەك هەیە كە ماناكەی تەواو دەكات و پێی دەوترێت ( صلة الموصول ) كە لە دێڕی (٩٦)ی ئەلفیەدا باسی دەكەین – إن شاء الله–.

[٧] واتا / مانای ( ذا ) وەكو مانای ( الذي ) وایە.

هەروەها ( ما )[1] دەبێتە مبتدأ و ( ذا ) اسمی موصولەو بە واتای (الذي ) و دەبێتە خبری ( ما ) وە ڕستەی ( فَعَلْتَ )[2] دەبێتە صلەی ( ذا ) ، عائدی[3] صلەکەش حذف کراوە و تقدیرەکەی دەبێتە ( ماذا فعلته )؟ واتا : ماالذي فعلته. چ کارێکت ئەنجام دا.

جا خۆی پاراست بە ووتەی ( إذا لم تُلْغَ في الكلام ) لەوەی کە ( ما )ی پرسیاری و ( ذا )یەکە یان ( من )ی پرسیاری و ( ذا ) یەکە پێکەوە بکرێتە ووشەیەك بۆ پرسیار[4]، وەکو ( ماذا عندك ؟) واتە چ شتێکت لایە ؟ هەروەها ( مَنْ ذا عندك ؟) لێرەدا ماذا : دەبێتە مبتدأ و ( عندكَ ) دەبێتە خبری[5] ، هەروەها ( مَنْ ذا ) دەبێتە مبتدأ و ( عندك ) دەبێتە خبری ، لەم دوو نمونەیەدا[6] ذا هەڵوەشاوەتەوە و چونکە ناوێکی سەربەخۆ نیەو بەڵکو بۆتە بەشێکی ووشەکە چونکە ووشەکە پێکەوە[7] بۆ پرسیار ( استفهام )ە.

*　　　*　　　*

---

[1] واتا / ما لە ڕستەی ( ماذا فعلت ).

[2] مەبەستی ( فعلت )ی ( ماذا فعلت ؟) یە.

[3] مەبەست لە عائدی صلە ئەوەیە هەموو ناوێکی موصول دەبێت لە دوایەوە ڕستەیەك یان نیمچە ڕستەیەك ( شبه الجملة) بێت بۆ تەواو کردنی ئەو موصولە و پێی دەوترێت ( صلة ) جا لەناو صلەدا دەبێت جێناو ( ضمير ) ێك هەبێت بگەڕێتەوە بۆ اسمە موصولەکە بەو ضمیرە دەوترێت عائد ، دواتریش باسی دەکات لە دێڕی ٩٦.

[4] واتا / ( ماذا ) یان ( من ذا ) پێکەوە بکرێنە یەك ناو بۆ پرسیارکردن.

[5] مەبەستی ئەوەیە ( ماذا ) پێکەوە وەك یەك ناومامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و جیا ناکرێنەوە و ( عندك ) دەبێتە ( ظرف مكان مبني على الفتح في محل رفع خبر ).

[6] واتا لە هەردوو نمونەی ( ماذا عندك ؟ ) یان ( من ذا عندك )؟.

[7] مەبەست ووشەی ( ماذا ) یان ( من ذا عندك )؟.

٩٦- وكُلُّها يَلْزَمُ بَعْدَه صِلَه          على ضميرٍ لائقٍ مُشْتمله[١]

موصولەكان هەموویان – حەرفی بن یان اسمی = پێویستە لە دوایانەوە صلەیەك[٢] بێت بۆ تەواو كردنی ماناكەی جا مەرجە بۆ صلەی موصولی اسمی لە خۆ بگرێت جێناوێكی گونجاو بۆ خۆی[٣]. ئەگەر ناوەكە مفرد بوو ئەوە دەبێت جێناوەكەشی مفرد بێت ، وە ئەگەر مذكر بوو دەبێت جێناوەكەشی مذكر بێت ، وە ئەگەر اسمە موصولەكە مفرد یان مذكر نەبوو ئەوە دەبێت جێناوەكەش وابێت ، بۆ نمونە ( جاءني الذي ضربْتُهُ )[٤] ، هەروەها ئەگەر دووان یان كۆ ، وەكو ( جاءني اللذانِ ضربْتُهَا[٥] ، والذين

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: هەموو موصولەكان پێویستیان بە – صلەیە – كە لە دوایانەوە باس دەكرێت و مانای موصولەكە بە هۆی صلەكەوە تەواو دەبێت ، وە دەبێت صلە لە خۆ بگرێت ڕاناوێكی گونجاو لەگەڵ موصولەكە كە پێی دەوترێت ( عائد ) واتە / گەڕاوە بۆ مەوصولەكە.

[٢] پێناسەی ( صلە ) بەم شێوەیەیە { هي الجملة التي تذكر بعد الاسم الموصول لتتم معناه } جا ئێمە لە باسی مبنی و معربدا باسمان كرد اسمی موصول بۆیە مبنیە چونكە پێویستی بە دوای خۆیەتی بۆ تەواو بوونی ماناكەی واتا بە هۆی شتێكەوە ماناكەی تەواو دەبێت و ئەو شتەش پێی دەوترێت صلە.

[٣] واتا بۆ اسمە موصولەكە.

[٤] لەم ڕستەیەدا ( الذي : اسم موصول مبني فی محل رفع فاعل ) و جملەی ( ضربْتُهُ) دەبێتە ( صلە الموصول ) و جێناوی ( ە ) لە جملەی ( ضربتهُ ) دەبێتە عائد واتا دەگەڕێتەوە بۆ ( الذي ) چونكە الذي بۆ مفردی مذكرە و جێناوی ( هُ ) بۆ مفردی مذكرە. ئەمەش پێی دەوترێت ( ضمیر لائق ) واتا جێناوی گونجاو بۆ اسمە موصولەكە.

[٥] لەم ڕستەیەدا ( اللذان ) اسمە موصولەكەیەو جملەی ( ضربتهما ) دەبێتە صلەی و جێناوی ( هما ) دەبێتە عائد چونكە مثنی یە.

ضربْتُهُمْ )[١] هەروەها بۆ مؤنثیش دەڵێت ( جاءتْ التي ضرَبْتُهما[٢] ، واللتانِ ضربْتُهما ، واللاتي ضَربْتُهُنَّ )[٣] .

جا هەندێ جار موصولەکە لفظەکەی مفردی مذکرە بەڵام ماناکەی بۆ دووان یان بۆ کۆیە ، ئەمەش وەکو ناوی ( من و ما ) ئەگەر بەکاریان بێنیت و مەبەستت پێیان غەیری مفردی مذکر بێت ، لەم کاتەدا دروستە ڕەچاوی لفظەکە بکەین[٤] ، هەروەها دروستیشە ڕەچاوی مانا بکەین ، دەڵێیت (اعجبني من قام[٥] ، ومن قامَتْ[٦] ، ومن قاما[٧] ، ومَنْ قامَتَا[٨] ، ومَنْ قاموا[٩] ، ومَنْ قُمْنَ[١٠] ) بە پێی ئەو ماناو مەبەستەی دەویسترێت.

* * *

[١] لێرەشدا ( الذين ) اسمی موصولەو لە جملەی ( ضربتهم ) دەبێتە صلەی و جێناوی ( هم ) دەبێتە عائد چونکە جمعە.

[٢] لەم ڕستەیەدا ( التی ) اسمی موصولەو بۆ تاکی مێ بۆ تاکی مێیەو جملەی جملەی ( ضربْتها ) دەبێتە صلەی و جێناوی ( ها ) دەبێتە عائدی موصولەکە.

[٣] لەم ڕستەیەدا ( اللاتي ) اسمی موصولەو بۆ جمعی مؤنثە و جملەی ( ضربتهُنَّ ) دەبێتە صلەی و جێناوی ( هُنْ )دەبێتە عائد.

[٤] واتا لفظی ( من وما ) بۆ تاکی نێر ( مفرد مذکر )ن ، بەڵام لە مانادا بۆ غەیری مفرد و مذکریش بە کاردێن.

[٥] لەم ڕستەیەدا ( مَنْ ) اسمی موصولەو بۆ مفردی مذکرە و جملەی ( قام ) صلەیە ، جا ( قام ) فاعلەکەی ضمیر مستترەو دەگەڕێتەوە بۆ ( من )ەکە.

[٦] لەم ڕستەیەشدا ( من ) بەکارهاتوە بۆ مفردی مؤنث بە پێی ( قامَتْ ) دەزانرێت.

[٧] لێرەشدا ( من ) بەکارهاتووە بۆ دووانی نێر بەپێی ( قاما ) وە ئەلفی ( قاما ) دەبێتە عائد.

[٨] ( من ) بەکارهاتووە بۆ دووانی مێ بە پێی ( قامتا ).

[٩] ( مَنْ ) بەکارهاتووە بۆ جمعی مذکر و واوی جماعە ( قاموا ) دەبێتە عائدەکەی.

[١٠] ( مَنْ ) بەکارهاتووە بۆ جمعی مؤنث و نونی نسوەی ( قُمْنَ ) دەبێتە عائدەکەی.

٩٧/ وجُملةٌ او شِبْهُها الذي وُصِل    به ، كمَنْ عندي الذي ابنُهُ كُفِل[١]

صلەی موصول دەبێت یان جملەی تەواو بێت یان نیمچە جملە ( شبە جملە) بێت ، مەبەست لە نیمچە جملە ظرف و جار و مجرورە[٢] ، دیارە ئەمەش [٣] بۆ غەیری صلەی ئەلیف و لامە[٤] ، کە دواتر باسی دێت ، جا مەرجە جملەی صلە سێ مەرج لە خۆ گرێت: یەکەم دەبێت جملەی خبری[٥] بێت ، دووەم: دەبێت مانای سەرسوڕمان ( التعجب )ی تێدا نەبێت[٦] ، سێ یەم : ئەو جملەیە پێویستی بە پێ خۆی نەبێت بۆ تەواو کردنی ماناکەی ، جا[٧] خۆ پارێزراو بە مەرجی ( الخبریة ) لە غەیری خبری کە بریتیە لە جملەی داخوازی و

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : صلەی موصول – دەبێت یان ڕستەی تەواو بێت یان نیمچە ڕستە بێت ، وەکو لە نمونەی ( کمَنْ عندی الذي ابنه کفل ) لێرەدا دوو اسمی موصول هاتووە یەکەمیان ( مَنْ عندي ) صلەکەی بریتیە لە ( عند ) ظرفەو دەبێتە نیمچە ڕستە ، دووەمیان ( الذي ابنه كفُل ) صلەکەی (ابنه کفل ) جملەی اسمیە. ماناکەشی ( ئەوەی لای منە ئەو کەسەیە کوڕەکەی کفیلی کراوە ).

[٢] هەموو کات مەبەست لە ( شبە جملە ) ظرف یان جار و مجرورە.

[٣] واتا / ئەوەی کە صلە دەبێت ڕستەی تەواو بێت یان نیمچە ڕستە بێت.

[٤] مەبەست ئەلیف و لامی موصولە ، کە دیارە صلەکەی نە ڕستەیەو نە نیمچە ڕستەیە بەڵکو بە زۆری وایە مفرد بێت ، وەکو خۆی فەرمووی دواتر باسی دەکات.

[٥] لە زمانی عەرەبیدا جملە یان ( خبریە ) کە بریتیە لەو ڕستەیەیی ڕاست و درۆ هەڵگرێت ( ما یحتمل الصدق أو الکذب) ، جا جملەی إنشائیە دوو جۆرە : ( أ ) طلبی کە داخوازی لە خۆ دەگرێت وەکو ( امر و نهي و استفهام و تمني و نداء ) ،( ب) غیر طلبي داخوازی تێیدا نیە وەکو ( مدح و ذم وقَسَم ورجاء ).

[٦] زانایانی نحو خیلافیان هەیە دەربارەی ئەوەی جملەی تعجب خبریە یان إنشائیە ؟ بەڵام هەردوو لایان پێیان وایە جملەی تعجب دروست نیە بکرێتە صلەی موصول.

[٧] لێرەوە ابن عقیل – ڕەحمەتی خوای لێبێت – ئەو سێ مەرجە ڕوون دەکاتەوە.

کردنی کارێك ، کەواتە دروست نیە بڵێیت ( جاء الذي اضْرِبْهُ )[١] بە پێچەوانەی بۆ چوونی کسائی[٢] ، هـــەروەهـــا دروست نیە بڵێیت (جاءنی الذي ليتَه قائم )[٣] ، بە پێچەوانەی هشام[٤] ، هەروەها خۆ پارێزرا بە مەرجی ( خالی بوونی جملەی صلە لە مانای سەرسوڕمان ( التعجب ) لە جملەی سەرسوڕمان ، کەواتە دروست نیە بڵێیت ( جاءنی الذي ما أحسنه )[٥] ، هەرچەندە بڵێین جملەی سەرسوڕمان خبریشە[٦] ، هەروەها خۆ پارێزرا بە مەرجی ( پێویستی نەبێت بە پێش خۆی ) لە وێنەی ( جاءنی الذي لكنه قائم ) بێگومان ئەم جملەیە دەخوازێت جملەیەکی تر لە پێشیەوە بێت ، وەکو ( ما قعد زيدٌ لكنه قائم )[٧].

هەروەها مەرجە لە ظرف و جار و مجرور[٨] کە مانایان تەواو بێت ( تامّ ) ،

---

[١] لەم ڕستەیەدا ( اضربه ) أمرەو جملەیەکی إنشائی طلبیە یە بۆیە دروست نیە ببێتە صلەی موصول.

[٢] شێخی کەسائی یەکێکە لە پێشەوایانی زانستەکانی زمانی عەرەبی و یەکێکە لە حەوت قورئان خوێنەکە ( القراء السبع ) و ساڵی ١٨٩ ك کۆچی دوایی کردوە ، جا کسائی پێی وایە دروست جملەی إنشائی ببێتە صلەی موصول.

[٣] لەم ڕستەیەدا ( ليته قائم ) جملەیەکی إنشائی طلبیە یە چونکە تمنیە ، بۆیە دروست نیە ببێتە صلەی موصول.

[٤] هشامی کوڕی معاویە یەکێکە لە زانایانی نحوی مدرسەی کوفێکان و فەقێی پێشەوا کسائی بووە و ساڵی ٢٠٩ کۆچی دوای کردوە ، – خوای گەورە لێی ڕازی بێت – جا ئەم زانایە پێی وایە دروستە جملەی إنشائی ببێتە صلەی موصول.

[٥] لەم ڕستەیەدا ( ما أحسنه ) جملەی تعجبە و دروست نیە ببێتە صلەی موصول.

[٦] چونکە وەکو ووتمان خیلاف هەیە دەربارەی ئەوەی جملەی تعجب خبریە یان إنشائیە ؟ جا ئەگەر بڵێین خبریشە هەر دروست نیە ببێتە صلەی موصول.

[٧] چونکە ( لكنّ ) ئەگەر کەوتە نێوان دوو جملەوە حەرفی استدراکە ، ( استدراك ) یش واتە پڕکردنەوەی قسەی پێشووتر.

[٨] واتا / ظرف و جار و مجرور کاتێك دەبنە صلە دەبێت مانایان تەواو بێت.

مەبەست لە مانا تەواویان : ئەوەیە کاتێك کرانە صلەی موصول قسەکە تەواو کەن و مانا بگەیێنن ، وەکو ( جاء الذي عندكَ[١] ، والذي في الدار )
جا ئەوەی عەمەلی کردوە لەم ظرف و جار و مجرورە فعلێکی حذف کراوە و تقدیری جملەکە بەم شێوەیەیە ( جاء الذي استقرّ عندك ) یان ( الذي استقر في الدار )
جا ئەگەر ظرف و جار و مجرور تەواو ( تام ) نەبوون ئەوە دروست نیە بکرێنە صلەی موصول ، کەواتە دروست نیە بڵێیت ( جاء الذي بك ) یان (جاء الذي اليوم )[٢].

* * * *

٩٨/ وصفةٌ صريحةٌ صلةُ الْ وكونها بمعرب الافعال قَلّ.[٣]

ئەلیف و لامی موصول صلەکەی تەنها دەبێت صیفەی ڕاستەوخۆ (صریحة)[٤] بێت ، دانەر فەرموویەتی لە هەندێ لە کتێبەکانیدا : مەبەستم لە صیفەی صریحە اسمی فاعلە وەکو ( الضارب )[٥] و اسمی مفعول وەکو

---

[١] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : جاء : فعل ماضي. الذي / اسم موصول مبني في محل رفع فاعل. عندَ / ظرف مكان مبني على الفتح متعلق بمحذوف والتقدير ( استقر عندك ) وعند مضاف. /كَ / ضمير متصل مبني على الفتح في محل جر مضاف إاليه.

[٢] چونکە مانای تەواوی نیە.

[٣] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : صلەی ئەلیف و لامی موصول دەبێت صفەیەکی ڕاستەوخۆبێت ، وە کەمە لکاندنی ئەلیف و لامی موصول بە فعلی معربەوە – واتا فعلی مضارعەوە – .

[٤] مەبەست لە صیفەی صریحة ئەو ناوانەن وەکو فعل وان لە ڕووی عمل و لە ڕووی ماناوە ، کەواتە صیفەی صریحة تەنها اسمی فاعل و اسمی مفعول و صیفەی مبالغەیە ، بەڵام لە صیفەی مشبەدا خیلاف هەیە وەکو ابن عقیل باسی کرد.

[٥] الضارب. واتا / الذي ضَرَبَ.

(المـضروب )[1] وَ صـفەی مـشبهە[2] وەکـو ( الحـسن الوجـە )[3] کەواتـە دەردەچێت وێنەی ( القرشيّ والأفضل )[4] ، بەلاّم لە بوونی صفەی مشبە بە صلەی ئەلیف و لام خیلاف هەیە ، ڕای پێشەوا ئەبولحسنی کوڕی عصفور دانەمەزراوە لەم بارەوە[5] ، جارێك وتویەتی صفەی مشبە دەبێتە صلەی ئەلیف و لام ،وجارێکیش وتویەتی نابێت و دروست نیە.

هەروەها بە شاذی هاتووە گەیاندنی ئەلیف و لام بە فعلی مضارعەوە[6]، بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد دانـــەر بـــە وتـــەی( بوونـــی ئەلیف و لام بە فعلـــی معربەوە – واتا فـــعلی مضارعەوە – کـــەمـــە ) وتـــەی شاعیریـــش بەڵـــگـــەیـــە کـە دەڵێت :

---

[1] المضروب. واتا / الذي ضُرِبَ.

[2] صیفەی مشبە / بریتیە لەو ناوەی کە وەر دەگیرێت لە فعلی ثلاثی لازم و بۆ جێگیر بوونی ئەو صیفەتە یە لەو کەسەدا ، کەواتە صفەی مشبە لە ئەصلدا اسمی فاعلە بەلاّم جیاوازی لەگەڵ اسمی فاعل لەوەدایە کە صفەی مشبە بۆ جێگیر ( ثبوت ) بوونی صیفەتەکەیە.

[3] ئەگەر ئەلیف و لامی ( الحسن ) موصولە بێت ئەوە ماناکەی دەبێتە ( الذی حَسُنَ وجهە ).

[4] القرشيّ صفە نیە چونکە پاڵدراو ( منسوب )ە بۆ لای ( قُرَیش ) بۆیە لە بنچینەدا لە صفە نیە ، هەروەها ( الأفضل ) اسمی تفضیلە و صفەیە بەلاّم صفەیەکی صریح نیە چونکە لە هەموو ڕوویەکەوە لە فعل ناچێت.

[5] واتا / لە بارەی ئەوەی کە ئایە صفەی مشبهە دەگونجێت بۆ ئەوەی ببێتە صلەی ئەلیف و لام یان نا.

[6] دیارە مەبەست لە ئەلیف و لامـی موصولـە ، چونـکە وەکو لە سـەرەتاوە باسمان کرد ئەلیف و لام یەکێکـە لە نیشانەکانی اسم.

ش٣٠/ما أنتَ بالحكم التُرضَى حكومتهُ

ولا الأصيلِ ولاذي الراي والجدل[١]

ئەمەش[٢] لای زۆرینەوەی زانا بەصریّکان تایبەتە بە شیعر ، بەلأم دانەر – لە غەیری ئەم کتێبەدا[٣]– ووتویەتی : تایبەت نیە بە شعر ، بەڵکو لە حاڵەتی غەیری شیعریشدا دروستە[٤] ، هەروەها هاتووە گەیاندنی ئەلیف و لام بە جملەی اسمیەوە، هەروەها بە ( ظرف )ەوە بە شاذی ، نمونەی یەکەم[٥] ووتەی شاعیرە :

ش٣١ / مِنَ القومِ الرسول اللهِ منهم    لَهُمْ دانَتْ رقابُ بني مَعَدّ[٦].

وە نمونەی دووەم[٧] ، ووتەی شاعیر :

ش٣٢ / مَنْ لا يزالُ شاكراً على المعه    فَهُوَ حَرٍ بعيشةٍ ذاتِ سَعَه[٨]

---

[١] ماناو بەڵگەی ئەم شاهدی ژمارە ( ٣٠ ) یە بەم شێوەیەیە : تۆ کەسێك نیت بڕیارت وەرگیراو بێت و جێی ڕەزامەندی بێت ، هەروەها کەسێکی خاوەن نەژاد و خاوەن ژیری و گفتو گۆی جوان نیت تا بتکەن بە حاکم و دادوەر.

بەڵگە ( شاهد )ەکەی : ووشەی ( الترضى ) فعلی مضارعەو ئەلیف و لامی پێکەوە لکاوە ، ئەمەش زۆر کەمە.

[٢] واتا / لکاندنی ئەلیف و لام بە فعلی معرەبەوە.

[٣] واتا / لە غەیری کتێبی ئەلفیەدا و لە کتێبی ( التسهیل ) دا فەرموویەتی.

[٤] واتا / لە قسەی ئاسای و غەیری شیعردا دروستە ئەلیف و لام بلکێت بە فعلی مضارعەوە.

[٥] واتا / نمونەی لکاندنی ئەلیف و لام بە جملەی اسمیەوە.

[٦] ماناو بەڵگەی ئەم شیعرە بەم شێوەیەیە : لەو گەلەیە کە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەوانە ، بۆیان ملکەچ بووە گەردەنی نەوەکانی معەد – کە نەوەکانی عدنانە – بەڵگەی ئەم دێرە : ( الرسول الله منهم ) ئەلیف ولام چۆتە سەر جملەی اسمی و ئەمەش شاذە.

[٧] واتا / نمونەی لکاندنی ئەلیف و لام بە ئاوەڵفرمان ( ظرف )ەوە.

[٨] مانای ئەم دێرە شیعرە بەم شێوەیەیە : هەرکەسێك بەردەوام شوکرانە و ستایشی خوا بکات لەسەر ناز و نیعمەتەکانی ، ئەوە شایەنی ژیانێکی خۆشە ، ئەم دێرەش وەرگیراوە لە فەرموودەی خوای گەورە ﴿ لئن شكرتم لأ زيدنكم ﴾-

*** باسی ناوی موصولي ( ايُّ )[(١)]**

٩٩ / أيٌّ كما واعْرِبَتْ ما لَمْ تُضَفْ        وَصدرُ وَصلها ضميرٌ انحذف[(٢)].

واتا /( ايُّ ) وەكو ( ما )ی موصول وايە لەو ڕووەوەی بەیەك شێوە دێت بۆ نێر و مێ تاك بن یان دووان یان كۆ ، نمونەی ( يعجبني أيهُّمْ هو قائمٌ )[(٣)] ، جا ( ايّ )[(٤)] چوار حاڵەتی هەیە : یەكەمیان : ئەوەیە إضافە كرێت و سەرەتای صلەكەی باس كرێت وەكو ( يعجبني أيُّهم هو قائمٌ )[(٥)] ، دووەم :

---

-بەڵگەی ئەم دێڕە : ( المعه ) ئەلیف ولام چۆتە سەر ئاوەڵفرمان ( ظرف ) ئەمەش شاذە.

(١) لە زمانی عەرەبیدا ( ايّ ) پێنج ماناو بەكارهێنانی هەیە : ( أ ) ايٌّ الشرطية : معربەو ماناكەشی بە پێی ئەو ناوەی دوای خۆی دەبێت. ( ب ) ايُّ الاستفهامية : بۆ پرسیار كردن بە كاردێت و معربەو پرسیاری پێدەكرێت لە عاقلْ و غەیری عاقڵیش و هەموو كاتێكیش مضافە. ( ج ) ايُّ : الوصلية : كە دلكێت بە حەرفی ( ها )ی ئاگادار كردنەوە ( التنبيه ) و لە پێشەوە حەرفی نداء دێت و لە دوایەوە ناوێكی ناسراو بە ( ال ) دێت وەكو ( ياايّها الانسان ) لێرەشدا مبنيە و معرب نيە.

( ء ) ايُّ الكمالية : بۆ گەیشتن بەو پەڕی جوانی و چاكی شتێك بەكاردێت و معربەو وەكو ( محمدٌ عاملٌ ايُّ عامل ).

( هـ ) ايّ الموصولة : كە بە مانای الذی دێت و مەبەستمان لێرەدا ئەم جۆرەیە كەباسی دەكەین.

(٢) كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : ايُّ بەكاردێت وەكو ما  بەلاّم ايُّ معربە بە مەرجێك إضافە نەكرێ و سەرەتای صلەكەی جێناو ( ضمير )ێكی حذف كراو بێت.

(٣) لەم ڕستەیەدا : يعجبُ : فعل مضارع مرفوع. ن/ نون الوقاية.  ي/ ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به.  أيّهم / فاعل مرفوع وهو مضاف.  هُمْ / ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. ( هو قائم ) دەبێتە جملەی صلەو ( هو ) سەرەتا ( صدر) ی صلەكەیە.

(٤) مەبەست لە ( ايّ ) موصولەیە.

(٥) لەم ڕستەیەدا : ( أيُّ ) اضافەكراوەبۆ لای جێناوی ( هم ) ، وە سەرەتایی صلەكەی باس كراوە كە بریتیە لە ( هو ).

نه إضافه کرێت و نه سەرەتای صلەکەی باس کرێت وەکو ( یعجبني ايٌّ قائمٌ)[1] ، سێ یەم : إضافە نەکرێت بەڵام سەرەتای صلەکەی باس دەکرێت وەکو ( یعجبني ايّ هو قائمٌ ) ، جا لەم سێ حاڵەتەدا ( ای ) معربەو إعرابی بە حەرەکاتی ظاهرە دەبێت – لە حاڵەتی رفع بە ضمە و حاڵەتی نصب بە فتحە و جریش بە کسرە – وەکو ( یعجبني ايُّهُمْ هو قائمٌ ، ورایْتُ ايَّهمْ هو قائمٌ ، ومررْتُ بايّهم هو قائمٌ )[2] ، هەروەها ( ايٌّ قائم ، وايًّا قائمٌ ، وأيٍّ قائمٌ)[3] ، هەروەها ( ايٌّ هو قائمٌ ، واياً هو قائمٌ ، وايٍّ هو قائمٌ )[4] ، چوارەم: إضافە کرێت و سەرەتای صلەکە حذف کرێت وەکو ( یعجبني ايُّهُم قائمٌ ) لەم حاڵەتەدا مبنیە لەسەر ضمە ، بۆیە دەڵێیت ( یعجبني ايُّهُم قائمٌ ، ورایتُ ايُّهم قائمٌ ، ومررْت بأيُّهم قائم)[5] فەرموودەی خوای گەورەشی لەسەرە کە دەفەرموێت :

﴿ ثُم لننزعَنَّ مِنْ كُلِّ شيعةٍ ايُّهُمْ أشَدُّ على الرحمنِ عتياً ﴾[6] ،

---

[1] لەم ڕستەیەدا : ايٌّ إضافە نەکراوە و سەرەتای صلەکەش باس نەکراوە. بۆیە (قائم) دەبێتە خبر بۆ مبتدا محذوف والتقدیر ( هو قائم ).

[2] لێرەدا ( اي ) لە سێ ڕستەدا بە هەمان شێوەی پێشوو إعرابی ( ايّ ) بە حرەکاتی ظاهرەیە ، چونکە نە إضافە کراوە و نەسەرەتای صلەکەی باسکراوە.

[3] لەم سێ ڕستەیەشدا بەهەمان شێوەی پێشوو إعرابی( ايّ )بەحرکاتی ظاهرەیە چونکە نە إضافە کراوە ونە صلەکەی باسکراوە

[4] لەم سێ ڕستەیەشدا بە هەمان شێوەی دوو حاڵەتەکەی پێشوترە.

[5] بەڵام لەم سێ ڕستەیەدا ( ايُّ ) مبنی لەسەر ضمە نەگۆڕاوە چونکە إضافە نەکراوە و صلەکەی باس نەکراوە.

[6] ئایەتی (٦٩)ی سورەتی مریم. کورتەی ماناکەی {پاشان بێگومان دەری دێنین ( و دەیخەینە دۆزەخەوە ) لەهەر پێروو دەستەیەك کامیان تاوانبارتر بووە لەبەرامبەر خوای میهرەبان }.

إعرابی تەوای ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : / ثم / حرف عطف. لننزعن/ لَ : حرف توکید. ننزعَنَّ : فعل مضارع مبني على الفتح لاتصاله بنون التوكيد وفاعله ضمير-

هەروەها ووتەی شاعیریش :

ش٣٣ / إذا ما لقيتَ بني مالكٍ فَسلِّمْ على أيُّهُمْ افْضَلُ[١]

ئەمەش[٢] وەرگیراوە لە ووتەی دانەر ( واعربت مالم تضف – تا کۆتایی دێڕەکە ) واتا : معربە ايُّ ئەگەر إضافە نەکرێت لە کاتی حذف کردنی سەرەتای صلەکەی ، کەواتە ئەم قسەیە دەگرێتەوە ئەو سێ حاڵەتەی پێشوو کە بریتی بوون لەوەی ( أيّ ) اضافە کرێت و سەرەتای صلەکەی باسکرێت،یان إضافە نەکرێت و سەرەتای صلەکەی باس نەکرێت،یان اضافە نەکرێت وسەرەتای صلەکەی باسکرێت،چوارەم بریتیە لەوەی إضافە کرێت و سەرەتای صلەکەی باسنەکرێت لەم کاتەد معرب نابێت و مبنی دەبێت

* * *

-مستتر تقديره (نحن). / من كل / جار و مجرور متعلقان ب( ننزعنّ ). /شيعةٍ / مضاف إليه مجرور. /ايُّهم / اسم موصول مبني على الضم في محل نصب مفعول به للفعل ( نزعن ) وهو مضاف /هم / في محل جر مضاف اليه. /اشدُّ / مبتدا لخبر محذوف. /على الرحمن / جار و مجرور متعلقان ب ( اشد ). /عتياً / تمييز منصوب وعلامة نصبه الفتحة بەڵگەی ئەم ئایەتە : بەکارهێنانی ( أيّ ) بە مبنی بوون لەسەر ضمە چونکە اضافە کراوە و سەرەتای صلەکەشی حذف کراوە.

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە شیعرە بەم شێوەیەیە : هەر کات گەیشتیتە نەوەکانی مالك، ئەوە سلاوکە لەوەیان بکە کە چاکتریانە.

بەڵگەی ئەم دێڕە : ( ايهم )ی بەکارهێناوە بە مبني چونکە لە دوای حەرفی جرەوە ئەگەر معرب بوایە دەیوت ( أيِهم ).

[٢] ئەوەی کە باسمان کرد کە ( ايّ ) چوار حاڵەتی هەیە و لە سیانیاندا معربە و لە حاڵەتێکیشیاندا مبنیە.

*** باسی حذف كردنی عائد[1]**

١٠٠ – وبعضُهم اعْرب مطلقاً ، وفي ذا الحذف أيّاً غيرُ ايّ يقتفي

١٠١ – إن يستطل وصلٌ ، وإن لم يُستَطل فالحذف نزرٌ وابوا أن يختزل

١٠٢ – إنْ صَلَحَ الباقي لوصلٍ مُكملٍ والحذف عندهم كثيرٌ منجلي

١٠٣ – في عائدٍ مُتصّل إنْ انتصب بفعلٍ او وصفٍ كمن نرجويَهَبْ[2]

واتا هەندێ لەعەرەب[3] بەرەهای ( مطلقاً ) معرب دەكەن ناوی ( أيُ ) ، واتا / ئەگەر إضافەش كرێت و سەرەتای صلەكەی باس نەكرێت بۆ نمونە دەڵێيت ( يعجبني أيُهُمْ قائمٌ ، ورايْتُ ايَّهم قائمٌ ، ومررْتُ بأيِّهم قائمٌ )[4] ، وە

---

[1] ئەم چوار دێڕەی ئەلفیە جگە لە نیوە دێڕی یەكەمی كە پەیوەندی بەباسی ( ايّ ) ەوە هەیە ، ئەوی تر باسی حذف كردنی ( عائد ) واتا ئەو جێناوەی لە جملەی صلەدا هەیە دەگەڕێتەوە بۆ اسمە موصولە – دەكات بۆیە سەرباسەكەمان ناو ناوە ( حذف كردنی عائد). كەواتە سێ دێڕ و نیوی پەیوەندی بەهەموو موصولاتەوە هەیە ئاگادار بە.

[2] كورتەی مانای ئەم چوار دێڕە ئەلفیە بەم شێوەیە : (١٠٠) هەندێ لە عەرەب كە – كوفیەكانن– بە ڕەهای معرب دەكەن ( ايّ ) ، ناوە موصولەكانی تر جگە لە – ايُ– شوێنی ايّ دەكەون لە حذف كردنی عائدەكەیان– واتا موصولەكانی تریش دەكرێت عائدەكەیان حذف كرێت بەڵام بە مەرج. (١٠١) بە مەرجێك درێژ بێت صلەكەیان – جا ئەگەر صلەكەیان درێژ نەبوو – درێژ ئەوەیە جملەی صلەكە لە دوو ووشە زیاتر بێت– ئەوە حذف كردنی عائدەكە كەمە ، هەروەها زانایان ڕێگەیان نەداوە عائد حذف كرێت. (١٠٢) ئەگەر دوای حذف كردنی عائدەكە– ئەوەی مایەوە بۆ خۆی بگونجێت ببێتە جملەیەكی تەواو و عائدیش لە خۆ بگرێت– چونكە لەم كاتەدا نازانین عائد حذف كراوە یان نا– ، هەروەها حذف كردنی عائد لە زمانی عەرەبیدا زۆر و ئاشكرایە. (١٠٣) لە عائدێكدا كە لكاو بێت و منصوب بێت بە فعلێك یان سیفەیەك وەكو فعل – واتا اسمی فاعل و اسمی مفعول– نمونەی ( مَنْ نرجوه يهب ) واتە ( ئەو كەسەی ئومێدمان پێیە دەبەخشێت ) لەم نمونەیەدا من : اسم موصول و / نرجو / فعل وفاعل و مفعولەكەش كە دەبێتە عائد – حذف كراوە و ئەصلەكەی ( من نرجوه ) بووە.

[3] كە كۆمەڵێك لە زانا كوفیەكان ، پێیان وایە ايّ هەموو كاتێك معربە و مبني نیە.

[4] لەم سێ ڕستەیەدا ( ايّ ) اضافە كراوە و سەرەتای صلەكەشی باس نەكراوە و حذف كراوە ، بەڵام نەبۆتە مبنی بەڵكو بە معربی بەكارهاتوە و لە یەكەمیاندا فاعل و–

خوێندراوەتەوە فەرمودەی خوای گەورە ﴿ ثم لننزعنّ من كل شِعةٍ أيُّهم اشدّ على الـرحمن عتيـاً ﴾بـە منـصوب بـوونی ( اي )[1] ، هـەروەها دێـرە شیعرەکەش[2] گێڕدراوەتەوە بە ( فسلّم على ايِّهم ) بە مجرور بوونی أي.

هـەروەها ئامـاژەی کـرد دانـەر بـە ووتـەی[3] ( وفي ذا الحـذف .... تـا کۆتای ) بۆ ئەو شوێنانەی عائدی موصـولی[4] تێدا حـذف دەکرێت ، جا ئەو عائدە : یان مرفوعە[5] یان غەیری مرفوعە ، جا ئەگەر مرفوع بوو ئەوە دروست نیە حذف کرێت مەگەر مبتدا بێت و خبـرەکەشی مـفرد بێت وەکـو ﴿ وهو الـذي في السـماء إلـهٌ ﴾[6] وە ،

---

-علامەی رفعی ضمە یە لە دووەمدا مفعول به و علامەی نصبی فتحە ظاهرەیەو لە سێ یەمیشدا اسمی مجرورە و علامەی جری کسرە ظاهرەیە.

[1] پێشتر ماناو إعرابی ئەم ئایەتەمان کرد ، جا لای هەندێ لە خوێنەران ( القراء ) (اي) لەم ئایەتەدا بە منصوبی خوێندراوەتەوە چونکە دەبێتە مفعول به و معربە.

[2] مەبەست شاهیدی ژمارە ( ٣٢)یە.

[3] لێرەوە باسی حذف کردنی عائد دەکات.

[4] پێشتر باسمان کرد هەموو اسمێکی موصول پێویستی بە جملەیەك یان شبە جملەیەکە پێی دەوترێت ( صله ) بۆ تەواو کردنی ماناکەی ، جا لەناو جملەی صلەدا جێناوێك هەیە دەگەڕێتەوە بۆ اسمە موصولەکە ئەو جێناو ( ضمیر )ە پێی دەوترێت عائد.

[5] واتا لە محلی رفع یان نصب یان جردایە ، چونکە جێناو ( ضمیر ) بۆ خۆی مرفوع و منصوب و مجرور نیە بەڵکو لە محلدا دەبێت.

[6] ئایەتی ( ٨٤ )ی سورەی ( الزخرف ) کورتەی ماناکەی { ئەو ( خوایە ) زاتێکە پەرستراوە لە ئاسماندا .......}

إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە بەم شێوەیەیە: هو : ضمیر منفصل مبني على الفتح في محل رفع مبتدا. /الذي / اسم موصول مبني في محل خبر. / في السماء / جار و مجرور متعلقان. ب ( اله ) لأنه بمعنی معبود. / الهٌ / خبر لمبتدا محذوف والتقدير ( هو إلهٌ ) والجملة صلة موصول الذي.-

( ايُّهم أشدُّ )[١] ، كەواتە دروست نيە بلّێت ( جاءني اللذان قام )[٢] يان (اللذان ضرب )[٣] ، چونكە يەكەميان[٤] مرفوعەو فاعلە و دووەميان[٥] نائب فاعلە بە لكو دەبێت بوترێت ( قاما ، وضُرِبا ) ، بەلاّم مبتدا[٦] حذف دەكرێت لەگەلّ ناوى ( ايّ ) هەرچەندە جملەى صلەكەشى درێژ نەبێت[٧] ،وەكو پێشتر ووتمان لەوەى دەلّێت ( يعجبني أيهم قائمٌ )[٨] وێنەى ئەمانەش ،بەلاّم سەرەتاى صلەكە حذف ناكرێت لەگەلّ غەيرى( ايّ )مەگەر صلەكە

---

-لەم ئايەتەدا عائدى اسمە موصولەكە ( الذي ) حذف كراوە چونكە لە محلى رفعى مبتدايە و صلەكەش درێژە.

[١] ايهم اشد : لێرەشدا عائدى ( ايّ ) حذف كراوە چونكە لە محلى رفعى مبتدايە ، هەرچەندە صلەكەش درێژ نيە ، چونكە مەرج نيە بۆ حذف كردنى عائدى ( اي ) صلەكەى درێژ بێت، هەروەها عائدى ( ايّ ) بەردەوام لە محلى رفعدايە.

[٢] ئەم ڕستەيە بەم شێوەيەيە دروست نيە چونكە عائدەكە فاعلە بۆيە دەبێت بلّێن ( جاءنى اللذان قاما ).

[٣] لەم ڕستەيەشدا عائدەكەى نائب فاعلە و حذف كراوە بۆيە دروست نيە و دەبێت بلّێين ( جاءنى اللذان ضُرِبا ).

[٤] واتا جێناو ( ضمير )ى لكاو بە ( قاما ).

[٥] واتا جێناوى لكاوى بە ( ضُرِبا ).

[٦] جياوازى عائدى ( ايّ ) و عائدى اسمە موصولەكانى تر لەوەدايە كە عائدى ( أيُّ ) حذف دەبێت صلەكەى درێژ بێت يان كورت بێت ، وە عائدى ( ايّ ) هەموو كاتێك لە محلى رفعى مبتدايە ، بەلاّم عائدى اسمە موصولەكانى تر كاتێك دروستە حذف بێت صلەكەى درێژ بێت و عائدەكەش لە محلى رفعى مبتدا بێت ، بەلاّم ئەگەر صلەكەى درێژ نەبێت ئەوە حذف كردنى عائد كەمە وەكو باسى دەكەين.

[٧] مەبەست لە درێژى صلە ئەوەيە لە دوو ووشە زياتر بێت.

[٨] لەم ڕستەيەدا عائدى ( ايّ ) حذف بووە هەرچەندە صلەكەش درێژ نيە.

درێژ بێت وەکو( جاء الذي هو ضاربٌ زيداً )[١] لێرەدا دروستە حذف کردنی ( هو ) دەڵێیـــــت ( جاء الذي ضاربٌ زيداً ) ووتەی عەرەبیش بەشێکە لەمە کە دەڵێن ( ما أنا بالذي قائلٌ سوءاً )[٢] تەقدیری ئەم ڕستـــــەیە (بالذي هو قائل لك سوءاً ) ، جا ئەگــــــەر صلەکە درێـژ نەبێت ئەوە حذف کردنی عائدەکە کەمەو کوفیەکانیش بە دروستی دەزانن بە قیاس کردن[٣] ، وەکو ( جاء الذي قائمٌ )[٤] تقدیرەکەی ( جاء الذي هو قائمٌ ) فەرموودەی خـــــوای گەورەش لەمەیە کە دەفەرمـــــوێت ﴿ تماماً على الذي احسَنُ﴾[٥] لـــــە خوێندنـــــەوەی ئەوانە ( أحْسنُ ) بە مـــــرفوعی دەخوێننەوە ، تقدیرەکـــــەشی ( هـــــو أحسنُ ).

---

(١) لەم ڕستەیەدا ( هو ضاربٌ زيداً ) دەبێتە صلەو درێژە چونکە چوار ووشەیە بۆیە بەبێ خیلاف دروستە عائدەکە حذف کرێت.

(٢) لەم ووتەیەشدا ( هو قائل لك سوءاً ) صلەی موصولە درێژە بۆیە دروستە عائدەکەی حذف کرێت.

(٣) لای بەصریەکان حذف کردنی عائدی غەیری ( أيّ ) دروستە مادام صلەکە درێژ بێت، بەڵام ئەگەر صلەکە کورت بوو ئەوە بە سماعی – واتا بەبێ یاسا و قیاس کردن غەیری ئەوەی بیسراوە – دروستە ، بەڵام لای کوفیەکان بە قیاس دروستە واتە لە هەموو ڕستەیەکدا دەتوانی.

(٤) لەم ڕستەیە عائد حذف کراوە لەگەڵ ئەوەی صلەکە کورتیشە.

(٥) ئایەتی (١٥٤)ی سورەی ( الاعراف )ە ، کورتەی ماناکەی { ... بۆ تەواو کردنی چاکە و بەهرەمان بەرامبەر بە کەسێك کە بە چاکی پێی هەستاوە ...}

إعرابی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیەیە: / تماماً / حال منصوب. على الذي / جار و مجرور متعلقان ب ( تماماً ). / احسنُ / خبر لمبتدا محذوف والتقدير ( هو احسنُ ) إنْ قرئ ( احسنُ ) بالرفع. وإن قرئ بالنصب ( احسنَ ) فانه فعل ماضي مبني على الفتح وفاعله ضمير مستتر تقديره ( هو ).

بەڵگەی ئەم ئایەتە : إحسنُ : إن قرئ بالرفع ، وفية جواز حذف صدر الصلة قياساً وهذا مذهب الكوفيين.

وە بە دروستیان داناوە لە ڕستەی ( لا سیّما زیدٌ )[١] کاتێك ( زیدٌ ) مرفوع بێت: ما[٢] موصولە بێت و ( زیدٌ )یش خبر بێت بۆ مبتدایەکی محذوف وتقدیرەکەشی ( لا سيَّ الذي هو زيدٌ ) عائدەکە مبتدایەو بریتیە لە – هو – بە واجبی حذف کراوە[٣] ئەمە[٤] شوێنێکە سەرەتای صلەکە حذف کراوە لەگەڵ غەیری ( أي ) بە واجبی و صلەکەش درێژ نیە ، کەواتە ئەمە قیاسیەو شاذ نیە.

هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی ( وأبوا أنْ يختزل إنْ صلح الباقِ لوصلٍ مكمل ) بۆ ئەوەی کە مەرجی حذف کردنی سەرەتای صلە ئەوەیە دوای حذف کردنەکە ئەوەی دەمێنێتەوە گونجاو نەبێت بۆ ئەوەی ببێتە صلەی تەواو ، وەکو ئەوەی لە دوای عائدەکەوە[٥] جملەیەکی تەواو هەبێت وەکو ( جاء الذي هو

[١] لە زمانی عەرەبیدا ووشەی ( لاسيما ) زۆر بەکاردێت ، جا ئەگەر لە دوای ( لاسيما ) ناوێکی ناسراو ( معرفة ) هات ئەوە ئەو ناوە سێ إعرابی تێدا دروست دەبێت: ( أ ) مرفوع بێت و ببێتە خبر لمبتدأ محذوف لەم کاتەدا ( ما ) ی ( سيما )ش دەبێتە موصول وەکو لێرە بە نمونە هێنراوەتەوە.

( ب ) منصوب بێت و بۆ فعلێکی محذوف لەم کاتەدا ( ما )ی ( سيما ) دەبێتە مای زائدة.

( ج ) مجرور بێت و بێتە بدل یان عطف یان بۆ ( ما ) ی سیماو لەم کاتەدا ( ما ) تامەیە و لە محلی جری (مضاف إليه) دایە.

[٢] واتا / ( ما )ی لکاو بە ( سيّ ) ەوە وەکو ووتمان دروستە موصولە بێت.

[٣] واتا / دروست نیە عائدەکە کە باسکرێت و بلێت ( لا سيما هو زيدٌ ).

[٤] مەبەستی حذف کردنی عائدە لە جملەی ( لاسيما زيدٌ ).

[٥] هەندێ جار لە جملەی صلەدا دوو جێناو یان زیاتر هەیە لەم کاتەدا دروست نیە عائدەکە حذف کرێت چونکە نازانرێت حذف کراوە یان نا ؟ چونکە لە جملەکەدا جێناوی تر هەیە و دەگونجێت ببێتە عائدی صلە.

ابـوه منطلـق )[١] یـان ( هـو ینطلـق )[٢] ، یـان ظـرف بێـت ، یـان جـار و مجـروری تـەواو بن ، وەکـو ( جاء الذي هـو عندك )[٣] یـان ( هـو في الـدار)[٤] ، لـەم نمـونـانـەدا دروسـت نیە سەرەتای صلەکەی حذف کـرێـت ، کەواتـە دروست نـیە بڵێیت ( جاء الذي أبوه منطلق ) ئەگـەر مەبەسـت ( جاء الذي هو ابوه منطلق ) بێت[٥] ، چونکە قسەکە بەبێ ئەو عائدەش[٦] تەواوە و ماناداره ، بۆیە نازانرێت ئایە شتێکی لێ حذف کراوە یان نا ؟ هەروەها هەموو نمونەکانی دیکەش کە باسکران ، لەمەدا[٧] جیاوازی نیە لە نێوان (ايّ ) و غەیری ( ايُّ )ش ، کەواتە دروست نیە عائد حذف کرێت لە ڕستەی ( یعجبني ایُّهم هو یقوم )[٨] چونکە نازانرێت حذف کراوە ، هەروەها ئەم

---

[١] لەم ڕستەیەدا ( هو ابوهُ منطلق ) دەبێتە صلەی موصول و عائدەکە ( هو )یە دروست نیە حذف کرێت چونکە جێناوێکی تریش لە ڕستەکەدا هەیە کە بریتیە لە جێناوە لکاوەکەی ( أبوه) چونکە ئەگەر ( هو ) حذف کرێت نازانین حذف کراوە یان نا.

[٢] لەم ڕستەیەدا ( هو ینطلق ) دەبێتە صلە چونکە فعلی مضارعەوە و فاعلێکی مستتری هەیە کە ( هُوَ ) یە ، جا لێرەدا ئەگەر ( هو ) ی سەرەتای صلەکە حذف کرێت نازانرێت حذف کراوە چونکە لە ڕستەکەدا جێناوێکی تری هەیە جێی بگرێت.

[٣] لەو ڕستەیدا ناتوانین ( هو ) حذف بکەین چونکە ( عندك ) ظرفێکی تەواوە و بە تەنها خۆی دەگونجێنیت ببێتە صلە چونکە شبە جملەیە.

[٤] في الدار : شبە جملەیە و دەگونجێت ببێتە صلە بۆیە ناتوانین ( هو ) حذف بکەین.

[٥] چونکە لەم ڕستەیەدا دوو جێناو ( ضمیر ) هەیە.

[٦] واتا / بەبێ ( هو )ی سەرەتای صلەکە.

[٧] واتا لەوەی کە عائد دروست نیە حذف کرێت ئەگەر دوای حذف کردن عائدەکە جێناوێکی تر هەبوو گونجاو بێت بۆ عائد بوون.

[٨] لەم ڕستەیەدا ( هو یقوم ) دوو جێناوە ( هو ) و جێناوێکی نادیار ( مستتر ) لە فعلی یقوم دا ، بۆیە دروست نیە ( هو ) سەرەتای صلەکە حذف کرێت.

حوکمە[١] تایبەت نیە بەو جێناوەی (عائدەی ) مبتدا بێت ، بەڵکو پێوەری ئەم حوکمە ئەوەیە هەر کاتێك قسەکە حذف کردن و نەکردنی هەڵدەگرت ئەوە دروست نیە عائدەکە حذف کرێت ئەمەش کاتێك دەبێت لە ناو صلەکەدا جێناوێك هەبێت – جگە لەو جێناوەی حذف کراوە – گونجاو بێت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ موصولەکە ، وەکو ( جاء الذي ضربتهُ في داره) لێرەدا دروست نیە جێناوی ( ها ) لە (ضرَبْتُهُ ) حذف کرێت ، ناتوانیت بڵێیت ( جاء الذي ضربْتُ في داره ) چونکە نازنراێت حذف کراو کامەیە.

جا بەمە[٢] بۆت دەردەکەوێت کە قسەی دانەر نا ڕوونیەکی تێدایە ، چونکە ڕوونی نەکردۆتەوە چ کاتێك گونجاو بێت دوای جێناوەکە[٣] بۆ ئەوەی ببێتە صلە حذف ناکرێت ، ئایە ئەو جێناوە لە محلی رفعدا بێت یان نصب یان جردا بێت ، هەروەها ئەو موصولەی عائدەکەی حذف دەکرێت ( ايُّ ) بێت یان غەیری ( ايُّ ) ، بەڵکو هەندێك جار قسەکانی وای لێدەفامرێتەوە کە ئەم حوکمە[٤] تایبەتە بە جێناوی حاڵەتی رفع ، وە تایبەتە بە جگەلە (ايُّ ) لە ناوە موصولەکانی تر ، چونکە قسەکانی[٥] لە باسی حذف کردنی عائدی ( أيّ ) دا بوو ، بەلاّم خۆی باسی هەموو موصولاتە نەك تەنها ( أيًّ ) ، بەڵکو عائدی موصول حذف ناکرێت لەگەڵ ( ايُّ ) و غەیری ( ايُّ ) ش

---

[١] واتا / دروست نەبوونی حذف کردنی عائد لە ڕستەیەکدا کە جێناوی تر لە ڕستەکەدا هەبێت و گونجاو بێت بۆ ئەوەی ببێتە عائد.

[٢] مەبەستی ابن عقیل ئەوەیە کە ڕوون کردنەوەیەکی ووردی کرد لەسەر عائد و حذف کردنی.

[٣] واتا / ئەو جێناوەی دەبێتە ( عائد )ی موصولەکەو حذف دەکرێت.

[٤] واتە / حوکمی حذف کردنی عائدی موصولەکە.

[٥] واتا / قسەکانی ابن مالك لەو چوار دێڕەدا کە باسی حذف کردنی عائدی موصولاتی کرد بە شێوەیەك لە شێوەکان تێکەڵاوی لە قسەکانی ابن مالك – ڕەحمەتی خوای لێبێت – ناڕوونیەکی تێدایە.

هەر کاتێك گونجاو بێت دوای حذف کردنی عائدەکە ڕستەکە ببێتە صلەو عائدی تری هەبێت وەکو باسکرا ، ، نموونەی ( جاء الذي هو أبوه منطلق ، ويعجبني ايُّهم هو ابوه منطلق )[١] هەروەها ئەو جێناوەش لە حاڵەتی نصب و جردایە وەکو ( جاءنی الذي ضربتُهُ في داره[٢] ، ومررتُ بالذي مررْتَ به في داره[٣] ) و ( يعجبني ايُّهم ضربْتُهُ في داره، ومررت بأيهم مررْت به في داره[٤] ).

هەروەها ئاماژەی کرد بە وتەی ( والحذف عندهم كثيرٌ – تا کۆتایی دێڕەکە ) بۆ عائدی حاڵەتی نصب جا مەرجی حذف کردنی عائدی منصوب ئەوەیە : لکاو ( متصل ) بێت ، منصوب بێت بە فعلێکی تەواو ( تام )[٥] یان بە وەصفێك[٦] وەکو ( جاء الذي ضربته [٧]، والذي أنا معطيكه درهم[٨] ) کەواتە دروستە حذف کردنی جێناوی ( ها ) لە ڕستەی ( ضربته )و

---

[١] لەم دوو نموونەیەدا عائدەکە جێناوی ( هُو ) یە و دروست نیە حذف کرێت چونکە لە ڕستەی صلەکەدا جێناوی تر هەیە و گونجاوە ببێتە عائد.

[٢] لەم ڕستەیەدا عائدەکە جێناوی ( ه )ی لکاوە بە فعلی ( ضربته ) لە محلی نصبی مفعول بە دروست نیە حذف کرێت چونکە لە ڕستەکەدا جێناوی تر هەیە و گونجاوە بۆ ئەوە ببێتە عائد.

[٣] لەم ڕستەیەشدا عائدەکە جێناوی ( ه )ی لکاوە بە حرفی جری با ( بە ) کەواتە جێناوە عائدە لە محلی جری اسمی مجرور دایە.

[٤] لێرەدا دوو نموونەی هێناوەتەوە بۆ عائدی ( أيُّ ) یەکەمیان (يعجبني ايُّهم ضربْتُهُ في داره ) عائدەکە بریتیە لە جێناوی ( ه )ی بە ( ضربْتُهُ )ەوە ، دووەمیشیان (مررت بأيهم مررْت به في داره ) لێرەشدا عائدەکە بریتیە لە جێناوی ( ه )ی لکاو بە حرفی جری ( به ).

[٥] فعلی تەواو ( الفعل التام ) بە پێچەوانەی فعلی ناتەواوە ( الفعل الناقص ).

[٦] وەصف : لە زانستی نحو دا واتە سیفەت بۆ ناوێك یان بۆ هەر شتێك ، بەڵام وەصف لە زانستی صرفدا واتە : اسمی فاعل و اسمی مفعول و صیغەی مبالەغەو ...جا لێرەدا کە دەڵێت وەصف مەبەست پێی اسم فاعل یان اسم مفعولە.

[٧] لەم ڕستەیەدا عائدەکە کە جێناوی لکاوە بە ( ضربت(ه) ).

[٨] لەم ڕستەیەشدا عائدەکە جێناوی ( ه )ی لکاوە بە اسمی فاعل کە ( مُعْطيى )ە.

دەڵێیت ( جاء الذي ضربْتُ ) فەرموودەی خوای گەورەش – لەمەیە – ﴿ذرني ومَنْ خلقْتُ وحيداً ﴾[1] هەروەها فەرموودەی ﴿ أهذا الذي بَعَثَ الله ورسولاً ﴾[2] تقديری ئەم دوو ئايەتە ( خلقتُهُ ، بَعَثَهُ ) هەروەها دروستە حذف کردنی جێناوی ( ها ) لە ( معطيكه ) و دەڵێیت ( الذي أنا معطيكَ درهم )[3] ، وە ووتەی شاعیریش :

---

[1] ئایەتی( ١١ )ی سورەتی( المدثر )کورتەی ماناکەی { واز لە من وئەو کەسە بێنە کەدرووستم کردووە بەتەنها– جۆرێکە لەهەڕەشە}

إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە: ذَرْ : فعل أمر مبني على السكون. وفاعله ضمير مستتر تقديره ( انت ) ، / ن / نون الوقاية. /ی/ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. /ومَنْ / و : للمعية. مَنْ : اسم موصول مبني في محل نصب مفعول معه. / خلقْتُ / فعل و فاعل. /وحيداً / حال منصوب.

الشاهد في هذه الآية / جواز حذف عائد الاسم الموصول وهو الضمير المحذوف من الفعل ( خلقت ) والتقدير ( خلقته ).

[2] ئایەتی (٤١)ی سورەتی الفرقان. کورتەی ماناکەی { بێ باوەڕان ووتیان – ئا ئەمەیە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەر } إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیەیە: / أ / حرف استفهام. / هذا / اسم إشارة مبني في محل رفع مبتدأ / الذی / اسم موصول مبني في محل رفع خبر. / بَعَثَ : فعل ماضي مبني على الفتح / الله / فاعل مرفوع. / رسولاً / مفعول به منصوب والجملة الفعلية ( بعث الله رسولاً ) صلة الموصول الشاهد فيها : الذي بعث الله : فيه جواز حذف عائد الاسم الموصول وهو الضمير المحذوف من الفعل ( بَعَثَ ) والتقدير ( بَعَثَهُ الله ).

[3] لەم ڕستەیەدا ( معطي ) اسم فاعلە و پێویستی بە دوو مفعولە ، یەکێیان جێناوی لکاوی ( كَ ) و دووەمیان جێناوی ( ه )ی حذف کراوە چونکە عائد لکاوە بە وەصفێکەوە تقدیرەکەشی ( مُعطيكه ).

ش٣٤ / ما اللهُ موليكَ فَضلٌ فاحمدنهُ به  فما لدى غيرِهِ نَفعٌ و لاضَرَرُ[١]

تقديری ئەم شيعره : الذي الله موليكه[٢] فضل ، جێناوی ( ه )ی لكاو به (موليك ) حذف كراوه.

جا قسەی دانەر وا دەخوازێت ئەمە[٣] زۆر ، بەلاّم وانيه بەڵكو زياتر وايه عائد حذف كرێت لەگەڵ ئەو جۆره فعلەی باسكرا[٤] ، بەلاّم حذف كردنی عائد لەگەڵ وصفدا كەمە.

جا ئەگەر جێناوەكە[٥] سەربەخۆ ( منفصل ) بوو ئەوه دروست نيه حذف كرێت ، وەكو ( جاء الذي إياه ضَرَبْتَ )[٦] ، دروست نيه لێرەدا جێناوی (ايّاه ) حذف كرێت ، هەروەها دروست نيه حذف كردنی عائد ئەگەر لكاو و منصوب بوو به جگه له فعل و وەصف – كەواته به حرف – وەكو ( جاء الذي إنهُ منطلق )[٧] دروست نيه جێناوی ( ه ) حذف كرێت هەروەها

---

[١] مانای ئەم دێره بەم شێوەيەيه : ئەو ناز و نيعمەتانەی خوای گەوره دەت داتێ سوپاس و ستايشی بكه ، چونكه سود و زيان تەنها لای خوای گەورەيه و به دەستی كەس نيه.
بەڵگەی ئەم دێره : ( ما الله موليك ) لێرەدا جێناوی ( ه ) لكاوی كه عائدی ( ما )ی موصولەكەيه حذف كراوه ، چونكه منصوبه به وەصفێك كه بريتيه له ( موليك )

[٢] مولی : اسمی فاعلی ( اولی يولي ) ه ( ما )ی سەرەتای دێرەكەش موصولەيەو به مانای الذی دێت.

[٣] واته / حذف كردنی عائدی منصوب به وصف ، قسەی دانەريش مەبەست پێی ( والحذف عندهم كثير منجلي في عائد متصل .. )

[٤] واتا / فعلی تەواو.

[٥] واتا / ئەو جێناوەی دەبێته عائدو له حاڵەتی نصب دەبێت.

[٦] لەم ڕستەيەدا / ( الذي ) اسمه موصولەيەو جملەی ( ايّاه ضربْتَ ) صلەكەيەو ( ايّاهُ ) جێناوی سەربەخۆيەو عائدی اسمه موصولەكەيەو له محلی نصبی مفعول به مقدمه.

[٧] لەم ڕستەيەدا / عائدەكه بريتيه له جێناوی ( ه )ی لكاو به ( إنَّ )ەوه دروست نيه حذف كرێت هەر چەنده له محلی نصبی اسمی ( إنّ ) دايه ، چونكه منصوب نيه به فعل يان به وەصف ، بەڵكو منصوبه به حرف كه ( إنّ ) يه.

دروست نيه حذف كردنى عائد ئەگەر منصوب و لكاو بوو به فعلێكى ناتەواو ( ناقص )[١] ، وەكو ( جاء الذي كانَهُ زيدٌ )[٢]

* باسى حذف كردنى عائد له حاڵەتى جردا

١٠٤ – كذاك حذف ما بوصفٍ خفضا كانْتَ قاضٍ بعدِ امرٍ مِنْ قَضَى

١٠٥– كذا الذي جُرَّ بما الموصول جَرَّ كَ ( مُرَّ بالذي مررْت فهو بَرّ )[٣]

كاتێك لێبويەوە له قسەكردنى لەسەر جێناوى حاڵەتى رفع و نصب دەستى كرد به قسەكردن لەسەر جێناوى حاڵەتى جر ئەويش يان مجرورە به هۆى إضافەوە ، يان مجرورە بەهۆى حەرفى جرەوە[٤].

---

[١] فعلى ناقص بەو فعلانە دەڵێن كە له دوايانەوە جملەى اسمى ( مبتدا + خبر ) دێت، واتا له دوايانەوە فاعل نايە ، بۆيە پێيان دەوترێت ( ناقص ) چونكە به تەنها ناوێكى مرفوعى دواى خۆيان مانايان تەواو نابێت ، دواتر به تفصيل باسى فعله ناقصەكان دەكەين إن شاء الله.

[٢] لەم ڕستەيەدا / عائدەكە جێناوى ( ه )ى لكاوە به ( كان )ەوە و له محلى نصبى خبرى ( كان )يەو دروست نيه حذف كرێت چونكە منصوب بووە به فعلێكى ناقص.

[٣] كورتەى ماناى ئەم دوو دێڕەى ئەلفيه بەم شێوەيەيە : ( ١٠٤ ) هەروەها دروستە حذف كردنى جێناوى ( عائد ) له حاڵەتى جردا ئەگەر مجرور بێت به وەصف ، وەكو ( انتَ قاضٍ ) بێت له دواى فعلى أمرى ( قضى )ەوە ئەمە ئامارژەيە بۆ فەرموودەى خواى گەورە ﴿ فاقْض ما انت قاضٍ ﴾ له شەرحەكدا باسى ئەم ئايەتە دەكەين. (١٠٥) هەروەها دروستە حذف كردنى عائدى مجرور به مەرجێك مجرور بێت به حەرفە جەرێك كە اسمە موصولەكەى مجرور كردوە وەكو ( مُرَّ بالذي مررتُ فهوبر ) دواتر باسى ئەم نمونەيەش دەكەين ان شاء الله.

[٤] له باسى نيشانەكانى اسمدا جۆرەكانى ( جر ) مان باسكرد كە سێ جۆر بوون ، بەلاّم لێرەدا تەنها دووانيان لەگەڵ ( عائد ) دا بەكاردێن.

جا ئەگەر مجرور بێت بەهۆی إضافەوە ئەوە حذف ناکرێت[١] مەگەر مضافەکە اسمی فاعل بێت و بەمانای ئێستا و داهاتوو ( الحال والاستقال)[٢] بێت ، وەکو ( جاء الذی انا ضاربُه : الْأن ، أو غداً )[٣] دروستە بڵێیت : جاء الذي انا ضاربٌ ) بە حذف کردنی جێناوی ( ه ).

وە ئەگەر مجرور بێت بە غەیری اسمی فاعل یان بە اسمە فاعلێك بۆ حال واستقبال نەبێت وەکو ( جاء الذي انا غلامه[٤] ، أو انا مضروبه[٥] أو انا ضاربه بە امْسِ[٦] ) ئەوە دروست نیە جێناوە عائدەکە حذف کرێت،جا ئامـاژەی کرد دانەر بە وتەی ( كأنت قاضٍ )بۆ فەرموودەی خوای

---

[١] واتا / عائدەکەی لکاوە بە مضافەکەوە.

[٢] اسمی فاعل لە زمانی عەرەبیدا هەمان عملی فعلی مضارع دەکات ، جا ئەگەر اسمی فاعل ( أل )ی پێوە بوو وەکو ( الذاهب ، الضارب .. ) ئەوە بەبێ مەرج عمل دەکات ، بەڵام ئەگەر ئەلیف و لامی پێوە نەبوو – وەکو ئەوەی لێرەدا باس دەکرێت – ئەوە بەمەرجێك عمل دەکات بە مانای ئێستا و داهاتوو ( حال و استقبال ) بێت ، بەڵام ئەگەر بە مانای ڕابردوو ( ماضي ) بووە ئەوە عمل ناکات.

[٣] لێرەدا ( الآن ) ڕستەکە دەکاتە ( حال ) و ( غدا ) یش دەیکاتە ( استقبال ) بۆیە دروست نیە جێناوە عائدەکە حذف کرێت.

[٤] لەم ڕستەیەدا جێناوەکە مجروری ( غلام )ە و غلامیش اسمی فاعل نیە بۆیە ناتوانین عائدەکە حذف بکەین.

[٥] لەم ڕستەیەدا جێناوەکە مجروری ( مضروب )ە و مضروبیش اسمی فاعل نیە و اسمی مفعولە بۆیە دروست نیە عائدەکە حذف کەین.

[٦] لەم ڕستەیەشدا هەر چەندە جێناوەکە لکاوە و مجروری ( ضارب )ە ، وضاربیش اسمی فاعلە لەبەر ئەوەی بۆ ڕابردووە بۆیە دروست نیە جێناوە عائدەکەی حذف کرێت.

گەورە﴿فاقضِ ما أنتَ قاضٍ﴾[1] تقديرەكەى( ما أنتَ قاضيە )و جێناوى (ە)ى لكاو بە ( قاض ) حذف كراوە ،جا دانەر بە هێنانەوەى ئەم نمونەيە[2] بێنياز بوو لەوەى بڵێت دەبێت ئەو وصفەى عائدەكە مجرور دەكات اسمى فاعل بێت وبۆ ( حال و استقبال )ى ببێت.

هەروەها ئەگەر عائدەكە مجرور بوو بە حرف[3]،ئەوە دروست نيە حذف كرێت مەگەر هەمان ئەو حەرفە جەرەى عائدەكەى مجرور كردوە اسمە موصولەكەش مجرور كات وئەو دوو حەرەفە جەرەش[4]لە ( لفظ و معنى )دا وەكو يەك وابن وعاملى هەردوو حەرفەكەش[5]وەكو يەك وا بن لەڕووى

---

[1] ئايەتى (٧٢)ى سورەتى ( طه ) كورتەى ماناكەى : ئەم ڕستە قورئانيە ووتەى ساحيرەكانى فيرعەونە كاتێك موسڵمان بوون و باوەڕيان بە پێغەمبەر موسى – عليه السلام – هێنا ، لەبەر ئەوە فيرعەون هەڕەشەى توندى لێكردن ئەوانيش ووتيان هەرچيت لە دەست دێت بيكەو بڕيار بدە }.

إعرابى تەواوى ئەم ڕستەيە بەم شێوەيەيە: ف : استئنافية. اقضِ : فعل أمر مبني على حذف حرف العلة لأنه معتل الآخر وفاعله : ضمير مستتر تقديره ( أنت ). ما : اسم موصول مبني على السكون في محل نصب مفعول به. أنتَ : ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدا. قاضٍ / خبر مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة على الياء المحذوفة واصله ( قاضيٌ ).

الشاهد في هذه الآية / حذف الضمير – الهاء – وهو عائد الاسم الموصول لأنه مجرور باضافة اسم فاعل إليه، والتقدير (قاضيه).

[2] مەبەست لە نمونەى ( فاقض ما أنت قاض ) يە ، جا زۆر جار ابن مالك لە جياتى باسكردنى مەرجى شتەكان نموونەيەك دەهێنێتەوە و ئەو نمونەيە مەرجەكان لە خۆ دەگرێت.

[3] مەبەستى حرفى جرە.

[4] واتا / حرفى جرى سەر اسمە موصولەكەو حرفى جرى سەر جێناوەكە لكاوەكە كە دەبێتە عائد.

[5] وەكو پێشتر ئاماژەمان پێيكرد ( جار و مجرور ) دەبێت ( متعلق ) بێت بە فعل يان شتێك وەكو فعل وا بێت جا ئەو شتە دەبێتە عاملى ( جا رو مجرور )ەكە.

پێکهاتەی پیتەکانیانەوە،وەکو( مررْتُ بالذي مررْت به[1]،یان أنتَ مارٌ به[2] ) لێرەدا دروستە حذف کردنی جێناوی( ه )و دەڵێت( مررْتُ بالذي مررْت)[3]،خوای گەورەش دەفەرموێت ﴿ وَيَشْرَبَ مِمّا تشربون ﴾[4] واتا تشربون منه،هەروەها دەڵێت ( مررْتُ بالذي أنتَ مارٌ )[5]،واتا : مارٌ به. ووتەی شاعیریش دەڵێت:

ش٣٥/ وقَدْ كنتَ تخفي حُبَّ سمراء حقبةً فَبُحْ لاَنَ منها بالذى انت بائح.[6]

---

[1] لێرەدا دوو حرفی جر هەیە و هەردووکیان حەرفی بێی جەرن بۆ ( الصاق )ن وە عاملی هەردووکیشیان فعلی ( مَرَّ )ەیە.

[2] لێرەدا ( به ) جار و مجرورەو متعلقه به ( مارٌ ) كه اسمی فاعلەو لە فعلی ( مَرَّ )ەوە دروست کراوە ، بۆیە دروستە جێناوەکە عائدەکەی حذف کرێت.

[3] چونکە مەرجەکانی تێدایە.

[4] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لە ئایەتی ( ٣٣ )ی سورەتی ( المؤمنون ) کورتەی ماناکەی { وە دەخواتەوە لەوەی ئێوە دەیخۆنەوە } ئەمە ڕەخنەی بێ باوەڕانی گەلی ( عادە ) کە دەیانگرت لە پێغەمبەرەکەیان ( هود ) سەلامی خوای لەسەر بێت.

إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : و: حرف عطف. يشرب / فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة. وفاعله ضمير مستتر تقديره ( هو ). ممّا : ( أصله من+ما: جارو مجرور متعلقان ب (يشرب ). تشربون : فعل مضارع وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الافعال الخمسة و واو الجماعة في محل رفع فاعل الشاهد في هذه الاية : حذف العائد المجرور والتقدير ( مما تشربون منه ) لأنه دخل عليه حرف كالذي دخل على الموصول لفظا ومعنى.

[5] چونکە ( مارٌ ) و ( مَرَّ ) ئەصلی ماناکەیان یەکە و هەردوو حەرفە جەرەکەش بۆ ( الالصاق )ە.

[6] مانای ئەم دێڕە شیعرە : بێگومان تۆ دەتشاردەوە خۆشەویستی ( سمراء ) ماوەیەکی زۆر ، دەی ئاشکرای بکە ئەوەی دەتویست ئاشکرای بکەی ئیستا کاتیەتی.

واتا : انت بائعٌ بە.

جا ئەگەر دوو حرفە جرەکە جیاواز بوون ئەوە دروست نیە عائدەکە حذف کرێت وەکو ( مررْت بالذي غضبْتَ علیه ) لێرەدا دروست نیە حذف کردنی ( علیه ) هەروەها ( مررْتُ بالذي مررْت بە علی زیدٍ ) لێرەشدا درووست نیە ( بە ) حذف کرێت چونکە دوو حەرفەکە[1] مانایان جیاوازە چونکە حەرفی جری ( ب )ی سەر اسمە موصولەکە بۆ ( الالصاق )ە[2] و حەرفی جری (ب) یّ سەر ضمیرەکە بۆ ( السببیە ) ، هەروەها ئەگەر عاملی دوو جار و مجرورەکە جیاواز بوون ئەوە دروست نیە عائدەکە حذف کرێت وەکو (مررْتُ بالذي فرحْتُ بە ) لێرەدا دروست نیە حذف کردنی ( بە ).

ئەوانەی باسکران[3] هەموویان ئاماژە بۆ کراوە بە ووتەی ( کذا الذي جُرَّ بما الموصول جرّ ) واتا : حذف دەکرێت جێناوی عائد کە مجرور بێت بەو شتەی موصولەکەی پیّ مجرور کراوە ، وەکو ( مررْتُ بالذي مررْتَ فهو برٌّ ) واتا ( بالذي مررت بە ) جا دانەر بێنیاز بوو بەم نمونەیە[4] لە باسکردنی مەرجەکانی[5] باسکران.

---

بەڵگەی ئەم دێڕە : ( بالذي انت بائع ) حذف کردنی عائدی اسمە موصولەکەیە چونکە مجرورە بە حرفی جری هاوێنەی حرفە جری اسمە موصولەکە.

[1] مەبەست دوو حرفە جرەکەیە کە یەکێکیان دەچێتە سەر اسمە موصولەکەو ئەوی تریان دەچێتە سەر جێناوە عائدەکە.

[2] لە زمانی عەرەبیدا حەرفە جرەکان – زۆربەیان – هەریەکی چەن مانایەکیان هەیە ، جا حرفی جری ( بـ ) چەند مانایەکی هەیە لەوانە ( الالصاق ) واتا پێوەلکان. هەروەها (السببیە ) واتا : هۆکاربوون .... هتد.

[3] واتا مەرجەکانی حذف کردنی عائدی مجرور.

[4] واتا نمونەی ( مررْتُ بالذي مررتَ فهو برٌّ ).

[5] واتا مەرجەکانی حذف کردنی جێناوی عائدی مجرور. لێرەدا کۆتایی بەباسی جۆری چوارەمی ناوە ناسراوەکان هات إن شاء الله لە وانەی داهاتوودا دەچینە سەر جۆری پێنجەم

# جۆری پێنجەم لە ناوە ناسراوەکان
# النوع الخامس من المعارف
# ( المعرّف بأداة التعريف )[1]

١٠٦ – أل حَرْفُ تعريفٍ ، أو اللاّم فقط فَنَمطٌ عَرَّفْتَ قُلْ فيه ( النمط ).[2]

زانایـانی ڕێزمـانی عـەرەبی ڕایـان جیایـە دەربـارەی حـەرفی ناسـاندن (التعریف) لە ناوی ( الرجل ) و هاوشێوەکانی ، شێخی خلیل[3] دەفەرموێ: ئەوەی ناوەکە[4] دەکاتە ناسراوە بریتیە لە ئەلیف و لامەکە ، بەلاّم شێخی

---

[1] واتا ئەو ناوانەی کە کراون بە ناسراو بەهۆی حەرفی ناساندن ، کەواتە ( مُعَرَّف ) لە ئەصلدا نەناسراوە ( نكرة)یەو بەهۆی ئەلیف و لامەوە دەبێتە ناسراو ( معرفە ).

جا لە زمانی عەرەبیدا ئەلیف و لام سێ جۆرە: ( أ ) حەرفی تعریف ( ناساندن ) ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین. ( ب ) حەرفی زیاد کراو ( زائد ) دواتر باسی دەکەین. (ج ) اسمی موصول کە پێشتر باسمان کرد ، جا زۆرترین بەکارهێنانی ئەلیف و لام لە جۆری یەکەمە واتە ( حەرفی تعریفە ) کە ئەمیش دەبێتە دوو جۆر وەکو ابن عقیل باسی دەکات { أل العهدیە ،و ال الجنسیە }.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : ئەلیف و لام حەرفی ناساندنە ، یان لامەکە بە تەنها ، جائەگەر ناوی ( نمط ) کە ناوی فەرشە ، یان جۆرە قوماشێکە بکەیتە ناسراو بڵێ ( النمط ) واتە هەر ناوێکی نەناسراو بەهۆی ئەلیف و لامەوە دەبێتە ناسراو.

[3] شێخی خلیل ناوی تەواو ( خلیل بن احمد بن عمرو الفراهیدی ) ساڵێ (١٠٠) کۆچی لە دایك بووە کە دەکاتە (٧١٨) زاینی و ساڵی (١٧٠)ك کۆچی دوای کردووە و یەکێکە لە پێشەوا ناودارەکانی زمانی عەرەبی و دانەر و داهێنەری زانستی ( عروض )ەو یەکەم فەرهەنگی زمانی عەرەبی داناوە بە ناوی ( کتاب العین ) وە مامۆستای سیبویە بوو ... ڕەحمەتی خوایان لێبێت.

[4] واتا : ئەو ناوەی لە بنەڕەتدا نەناسراو بووە.

سیبویە دەفەرموێ : تەنها لامەکە ناوەکە دەکاتە ناسراو کەواتە همزەکە[١] لای خلیل همزەی قطعە[٢] ، ولای سیبویە همزەی وەصلەو هێنراوە بۆ ئەوەی بتوانین ووشە ساکنەکە[٣] دەربڕین.

جا ئەلیف و لامی ناساندن ( المُعرِّفة ) هەندێ جار بۆ شتێکی باسکراو و زانراوە ( العهد ) وەکو ( لقیتُ رجلاً فاکرمتُ الرجلَ )[٤] ، وە فەرموودەی خوای گەورە﴿ کما أرسلْنا إلى فرعون رسولاً ، فعصى فرعونُ الرسولَ...﴾[٥]،

---

[١] مەبەست لە همزە ئەلیفی سەرەتای ئەلیف و لامە، دیارە لای زۆرێك لە زانایان همزەو ئەلیف یەکن.

[٢]همزەی قطع بەم شێوەوە پێناسە کراوە ( هي التي في اول الكلمة ، وينطق بها في الابتداء والوصل ) واتا : لەسەرەتای ووشەوە دێت و هەموو کات دەخوێنرێتەوە بەلأم هەمزەی وصل لە سەرەتاوە دەخوێنرێتەوەو لە ناوەڕاستەوە ناخوێنرێتەوە.

[٣] چونکە لە زمانی عەرەبیدا سەرەتای ووشە نابێت ساکن بیت ، جا هەر ووشەیەك لەسەرەتاوە ساکن بێت ئەوە همزەی وەصلی بۆ دەهێنرێت بۆیە پێشی دەڵێین همزەی وەصل چونکە بەهۆیەوە دەگەینە سەر حەرفە ساکنەکەو دەیخوێنینەوە.

[٤] ئەلیف و لامی ( الرجل ) بۆ ( عهد )ە ، پێوەری ئەم جۆرە ئەلیف و لامەش ئەوەیە ئەو ناوەی ئەلیف و لامەکەی پێوەیە پێشتر باسکرابێت لە ڕستەکەدا.

[٥] ئەم دوو ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ( ١٥ و ١٦ )و سورەی ( المزمل ) ماناکەی {هەروەك پێغەمبەرێکمان نارد بۆ فیرعەون ، ئینجا فیرعەون سەرپێچی- ئەو پێغەمبەرەی کرد ...}

إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە: كما : ك : حرف جر للتشبيه. ما / مصدرية. ارسلْنا / فعل و فعل ، وما مع مادخل عليه في تأويل مصدر مجرور بالكاف والتقدير ( كإرسالنا )، إلى فرعون : جار و مجرور متعلقان بالفعل أرسلنا، رسولاً / مفعول به منصوب. فعصى : فـ : استئنافية. عصى / فعل ماضي مبني على الفتحة المقدرة للتعذر. فرعوُ : فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة. الرسول : مفعول به منصوب.

وجه الاستشهاد بهذه الآية : قوله ( الرسول ) فان الالف واللام فيه معرفة للعهد الذكري.

وه هەندیَ جار بۆ گشتگیری ئەو شتە دێت کە ئەلیف و لامەکەی پێوەیە (استغراق الجنس ) _ وەکو ﴿ إنَّ الانسان لفي خُسر ﴾[1] نیشانەی ئەم جۆرە ئەلیف و لامە ئەوەیە بگونجێت لە جێی ئەلیف ولامەکە ووشەی ( کل) دانرێت و ماناکەشی تەواو بێت ، هەروەها[2] بۆ ناساندنی حقیقەت و ناوەڕۆکی شتێك دێت وەکو ( الرجل خيرٌ من المراه ) واتە : حەقیقەتی پیاو باشترە لە حەقیقەتی ئافرەت[3].

جا ووشەی ( النمط )[4] جۆرێکە لە فەرش و کۆ ( جمع )کەی ( انماط )ە وەکو – سبب و اسباب – هەروەها ووشەی ( النمط ) بە مانای کۆمەڵێك خەڵك کە کاروباریان یەك بێت ، شێخی جوهری وای فەرمووە[5].

*　　　*　　　*

---

[1] ئایەتی ژمارە (٢)ی سورەی ( العصر ) کورتەی ماناکەی { بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندایە ... } إعرابی بەم شێوەیەیە : إنّ : حرف مشبه بالفعل . الانسان : اسم إن منصوب وعلامه نصبه الفتحة الظاهرة، لفی / ل / حرف توکيد. في : حرف جر . خسر : اسم مجرور ، والجارو والمجرور متعلقان بمحذوف خبر إنّ والتقدير ( إنّ الانسان واقعٌ لفی خسر ).

الشاهد في هذه الآية : ( الانسان ) الالف واللام فيه معرفة لاستغراق الجنس.

[2] واتە مانایەکی تر لە ماناکانی ئەلیف و لامی ناساندن.

[3] کەواتە مانای وا نیە هەموو پیاوێك چاکترە لە هەموو ژنێك ، چونکە ژنی وا هەیە (١٠٠) پیاو دێنێت.

[4] کە ابن مالك بە نمونە هێنایەوە.

[5] شێخی جوهری ناوی تەواوی ( اسماعيل بن حماد )ە و ناسراوە بە ( الجوهري ) یەکێکە لە پێشەوا ناودارەکانی زانستەکانی زمانی عەرەبی ساڵی ( ٣٩٢ ) کۆچی لە دایك بووە ، خاوەنی کتێبی ( الصحاح ) کە فەرهەنگێکی بەناوبانگە لە زمانی عەرەبیداو شێخی ڕازی پوختی کردۆتەوە بەناوی ( مختار الصحاح ) جا ابن عقيل مانای ووشەی ( النمط )ی لە کتێبی ( الصحاح )ەوە نەقڵ کردوە.

*** باسی ئەلیف و لامی زیادکراو**

**١٠٧- وقدْ تُزادُ لازماً : كالـــلاّتِ     والآنَ ، والـــذيـــن ، ثـــم الــلاّتِ**

**١٠٨- ولاضطرارٍ : كبنات الأوبر     كذا(وطبْتَ النفس يا قَيْسُ) السَّرِى[١]**

**دانەر لەم دوو دێڕەدا باسی ئەلیف و لامی زیاد کراو دەکات ، ئەویش – واتا ئەلیف و لامی زیاد کراو– دوو جۆرە : زیاد کراوی جێگیر ( زائدة لازمة )[٢] ، و زیادکراوی نا جێگیر ( غیر لازمة )[٣] ، پاشان نموونەی هێنایەوە بۆ زیاد کراوی جێگیر بە ووشەی ( اللات )[٤] کە ناوی بتێك بوو لە شاری مەککەی پیرۆز ، هەروەها ووشەی ( الآنَ )[٥] کە ئاوەڵفرمانی کاتی (ظرف زمان )ە و مبنیە لەسەر فتحە ، زانایان خیلافیان هەیە دەربارەی ئەلیف و لامی ( الان ) ، هەندێکیان پێیان وایە بۆ ناساندنی کاتی حازر**

---

[١] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیەیە : ( ١٠٧ ) هەندێ جار ئەلیف و لام زیاد کراوە بە جێگیر ( لازم )ی وەکو ئەلیف ولامی ( اللات و الآن و الذین و اللاّتي). ( ١٠٨ ) وە هەندێ جاریش زیاد کراوی جێگیر نیە و بۆ ناچارییە وەکو ئەلیف و لامی ووشە ( الاوبر ) هەروەها ووشەی ( النفس ).

[٢] مەبەست لە زیاد کراوی جێگیر ( زائدة لازمة ) ئەوەیە کە ئەو ئەلیف و لامە هیچ کاتێك لەو ناوە جیا نابێتەوە.

[٣] مەبەست لە زیاد کراوی نا جێگیر ( غیر لازمة ) ئەوەیە کە دەکرێت لەو ناوە جیا ببێتەوە و ناوەکەش بەبێ ئەلیف و لام بەکاردێت.

[٤] ( اللات ) ئەگەر لامەکەی ( شدە ) نەبێت ئەوە ناوی بتە ، بەڵام ئەگەر لامەکەی شدەی هەبێت ( اللّاتِ ) ئەوە کۆ ( جمع )ی ( التی )ەو اسمی موصولە کە پێشتر باسمان کرد.

[٥] زانایان خیلافیان هەیە دەربارەی ئەلیف و لامی ناوی ( الان ) وەکو ابن عقیل باسی کرد ، هەروەها خیلافیشیان هەیە دەربارەی ئەوەی ( الان ) معربە یان مبنیە؟ زۆربەی زانایان پێیان وایە مبنیە و هەندێکیشیان پێیان وایە معربە.

دێت وەکو ( مررْت بهذا الرجل )[١] چونکه ( الآن ) به واتای ئەم کاته ( حاڵی حازر ) دێت ، جا لەسەر ئەم بۆ چوونه[٢] ئەلیف و لامەکەی زیاد کراو نیه ، وه هەندێکی تر لە زانایان – لەوانه دانەر – پێی وایه ئەلیف و لامی ( الان ) زیاد کراوه ، وه مبنیه چونکه مانای حەرف لە خۆ دەگرێت کە بریتیه لە (لام الحضور )[٣] ، هەروەها نمونەی هێنایەوه دانەر بەناو ( الذين) و (اللات ) مەبەست پێیان ئەلیف و لامی سەر اسمه موصولەکانە ئەم قسەیەش لەسەر ئەوەی بڵێن ناساندنی اسمی موصول بەهۆی ( صلة )ەوەیە و ئەو کات ئەلیف و لامەکەی[٤] دەبێتە زیاد کراو ، ئەمەش[٥] بۆ چوونی کۆمەڵێکەو دانەریش ئەم بۆ چوونەی پەسەند کردوه ، بەڵام هەندێکیان پێیان وایه کە ناساندنی موصول بەهۆی ئەلیف و لامەوەیە ئەگەر موصولەکە ئەلیف و لامی پێوه بوو وەکو ( الذي ) بەڵام ئەگەر ئەلیف و لامی پێوه نەبووە ئەوە وا دادەنێین کە ئەلیف و لامی پێوەیە وەکو ( من وما )[٦] تەنها

---

[١] لەم ڕستەیەدا ( الرجل ) واتا ئەو پیاوەی ئێستا حازره.

[٢] واتا بۆ چوونی ئەوانەی دەڵێن ئەلیف و لامی ( الان ) زیاد کراو نیه.

[٣] چونکه هەر ناوێك مبنی بێت دەبێت لێکچونێکی هەبێت لەگەڵ حەرفدا ، جا ناوی ( الان ) له حەرفی لامی ئەلیف و لامی حضوری دەچێت بۆیە مبنیه ، هەندێکی تریش پێیان وایه هۆی مبنی بوونەکەی ئەوەیە مانای ئاماژه ( اشاره ) کردنی تێدایه واتا ئاماژه بۆ ئەم کاته ( هذا الوقت ).

[٤] واتا/ ئەلیف و لامی اسمی موصول

[٥] واتا / ئەو بۆ چوونه پێی وایه ناساندنی اسمی موصول بەهۆی صلەکەوەیه نەك بەهۆی ئەلیف و لامەوه.

[٦] ( من و ما ) اسمی موصولن و ئەلیف و لام وەرناگرن ، بەڵام وا دادەنرێت به (مقدر)ی ئەلیف و لامیان پێوەیه.

(ايٌ) نەبێت کە ناساندنەکەی بەهۆی إضافەکردنەوەیە ، کەواتە بەپێی ئەم بۆ چوونە[١] ئەلیف و لامی موصول زیاد کراو نیە ، جا حذف کردنی ئەلیف و لامی لە خوێندنەوەی ئەوانەی ئەم ئایەتەیان ﴿ صراط لَذين انعمت عليهم﴾[٢] بەبێ ئەلیف و لام ( الذين ) خوێندۆتەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە ئەلیف و لامەکە زیاد کراوە ، چونکە دەکرێت حذف کرابێت بە شاذی هەرچەندە بۆ ناساندیشە[٣] و هەروەکو چۆن حذف کراوە ئەلیف و لام لە قسەیان[٤] ( سلامُ عليكم ) بەبێ تنوينی ( سلام )و مەبەستیان ( السلام عليكم).

هەروەها ئەلیف و لامی زیاد کراوی ناجێگیر ( غیر اللازمة ) ئەوەیە کە – بە ناچاری – دەچێتە سەر ناوی عەلەم وەکو وتەیان لە وشەی ( بنات اوبر ) کە جۆرێکە لە دۆمەڵان ( بنات الاوبر )[٥] وەکو وتەی شاعیر :

---

[١] ئەو بۆ چوونەی پێی وایە ناساندنی اسمی موصول بەهۆی ئەلیف و لامەوەیە نەوەك بەهۆی صلەوە.

[٢] ئایەتی ژمارە ( ٧ )ی سورەی ( الفاتحە ) کورتەی ماناکەی { ڕێگای ئەوانەی چاکەت لەگەڵ کردون }

إعرابی تەواوی ئەم ڕستە قورئانیە بەم شێوەیەیە : صراط : بدل من ( الصراط ) – الواردة في الآية السابقة – منصوب وعلامة نصبه الفتحة وهو مضاف. لذين / اسم موصول مبني في محل جر مضاف إاليه. انعَمتَ / انعم / فعل ماضي مبني على السكون. تَ / ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل ، والجملة الفعلية ( انعمت ) صلة الموصول.

الشاهد في هذه الاية / ( لذين في قراءة من قراء بحذف ( ال ) منها ، وعدم اعتبار (أل ) ، المحذوفة هنا زائدة ، إذ يُحتمل ان تكون حذفت شذوذاً.

[٣] واتا ئەلیف و لامەکە مادام بۆ ناساندن بێت نابێت حذف بکرێت و بەڵام بە شاذی حذف بووە.

[٤] واتا / قسەی عەرەب.

[٥] ووشەی ( بنات اوبر ) لە بنچینەدا ئەلیف و لامی نیە و پێویستیشی پێ نیە چونکە خۆی ناسراو ( معرفە )ە.

ش٣٦ – ولَقَدْ جَنَيْتُكَ اكمُؤاً وعساقِلاً ولَقَدْ نَهَيْتُكَ عن بناتِ الاوبر[1]

جا ئەصلی وشەکە ( بنات أوبر )ە و ئەلیف و لامی بۆ زیاد کراوە و بەلام شێخی مبرد[2] وتویەتی ( بنات او اوبر عەلەم نیە ، کەواتە – ئەلیف و لامەکەی – لای مبرد زیاد کراو نیە.

هەروەها ئەلیف و لامی زیاد کراوە – بە ناچاری – دەچێتە سەر ناوی جیاکەرەوە ( التمیین)[3] ، وەکو وتەی شاعیر :

ش٣٧ – رأيْتُكَ لمّا انْ عرفت وجوهنا صددْتَ ، وطبتَ النفس يا قيسُ عن عمرو[4]

ئەصلی ( طبْتَ النفس ) ( طبْتَ نفساً ) بووە و ئەلیف و لامی زیاد کراوی چۆتە سەر، ئەمەش لەسەر ئەو بۆ چوونەی کە دەڵێت تمییز دەبێت

---

[1] مانای ئەم دێڕە بەم شێوەیەیە : بێگومان بۆم چینیوی دۆمەلانی چاك و ناوازە ، وە لێم قەدەغەکردی دۆمەلانی خراپ.

بەڵگە ( شاهد )ی ئەم دێڕە : وشەی ( بنات الاوبر ) ئەلیف و لامی زیاد کراو چۆتە سەری و چونکە خۆی ناوێکی ناسراوە و عەلەمە.

[2] شێخی مبرد ناوی تەواوی ( محمد بن یزید بن عبدالاکبر ) یەکێکە لە پێشەوا ناودارەکانی زمانی عەرەبی و زانستەکانی ، ساڵی ٢١٠ ك لە شاری بصرە لە دایك بووە و ساڵی ٢٨٦ لە شاری بغداد وەفاتی کردووە و کۆمەڵێك کتێبی ناوازەی لە دوای خۆی جێ هێشتووە ، خوای گەورە لێی خۆشبێت و دەرەجەی عالی بکات.

[3] التمییز : بریتیە لە ناوێکی نەناسراو ( نكرة ) کە دێت بۆ ڕوونکردنەوەی نادیاریەك کە هەیە ، بۆیە بە کوردی وتومە ( ناوی جیاکەرەوە ) چونکە شتێکی پێش خۆی ڕوون و جیا دەکاتەوە لە شتی تر.

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە شیعرە بەم شێوەیەیە : شاعیر سەرکۆنەی کەسێك دەکات بەناوی قیس و دەڵێت : بینیتم کاتێك ئێمەت ناسی پشتت هەڵکرد لە هاوەڵەکەوت کە عەمرەو دڵت خۆش کرد بە دەست کەوتی جەنگ و تۆڵەت سەندەوە.

بەڵگەی ئەم شیعرە : ( طبت النفس ) ئەلیف و لامی زیاد کراو چۆتە سەر وشەی (النفس ) و تمییزە ، دیارە تمییزیش دەبێت نكرە بێت.

نەناسراو ( نکرة ) بێت و نابێت معرفە بێت ئەمەش بۆ چوونی بەصریەکانە، بەڵام لای کوفیەکان دروستە تمییز ناوی ناسراو ( معرفة ) بێت ، کەواتە ئەم ئەلیف و لامە[١] لای کوفیەکان زیاد کراو نیە ، جا بۆ ئەو دوو دێڕەی[٢] هێنامانەوە ، ئامارژەی کرد دانەر بە ووتەی ( کنبات الاوبر )و ووتەی (وطبت النفس یا قیسُ السَّری [٣]).

*　　　*　　　*

١٠٩- وبعض الاعلام علیه دخلا　　للمح ما قَدْ کان عنه نُقلا

١١٠- کالفضْل ، والحارث ، والنعمان　　فذکْرُ ذا وحذفه سیان[٤]

پێشتر دانەر باسی ئەوەی کرد کە ئەلیف و لام بۆ ناساندن دەبێت و هەندێ جاریش زیادکراوە و قسەو باس دەبارەی ئەو دووانە پێشتر کرا ، پاشان لەم دوو دێڕەدا باسی ئەوە دەکات کە ئەلیف و لام هەندێ جار دێت[٥] بۆ

---

[١] واتا ئەلیف و لامی سەر ( تمییز ).

[٢] واتا شاهیدی ژمارە ٣٦ و ژمارەی ٣٧ی مەبەستە.

[٣] ووشەی ( السّری ) بە واتای نەجیب و پیاوی بەڕێز دێت و ابن مالك دێڕە شیعرەکەی خۆی پێ تەواو کردووە.

[٤] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیە ( ١٠٩ ) هەندێ لە ناوە عەلەمەکان ئەلیف و لام دەچێتە سەری بۆ ئامارژەکردن بەوەی کە ئەو ناوە وەرگیراو (منقول )ە لە سیفەتێکەوە. ( ١١٠ ) وەکو نموونەی ( الفضل ) و ( الحارث ) و ( النعمان ) و جا باسی ئەم ئەلیف و لامەو باس نەکردنی وەك و یەکن ( واتا ناوەکە بەبێ ئەلیف و لامەکەش ناسراوە ).

[٥] زانایان خیلافیان هەیە دەربارەی ئەم جۆرە ئەلیف و لامە – واتا ئەلیف و لامی ناوەکانی ( الفضل و والحارث والنعمان ) – زۆربەیان پێیان وایە کە زیادکراوی ناجێگیر ( زائدة غیر لازمة )یە ، بەڵام هەندێکیان پێیان وایە زیاد کراو نیە لەوانە – ابن عقیل – وەکو لە شەرحەکە ڕوون دەبێتەوە.

ئاماژەکردن بە سیفەت مەبەست پێی ئەو ئەلیف و لامەیە دەچێتە سەر ئەو ناوە عەلەمانەی کە وەرگیراون ( الاعلام المنقولة )[١] لەو شتانەی بگونجێت ئەلیف و لام بچێتە سەری ، وەکو ( حَسَنٌ ) دەڵــێـــیــت ( الحسن )[٢] ، جا زۆرتر وایە ئەم ئەلیف و لامە دەچێتە سەر ئەو ناوانەی وەرگیراون لە سیفەتەوە وەکو ( حارث ) دەڵێیت ( الحارث )[٣] ، وە هەندێ جار دەچێتە سەر ئەو ناوەی وەرگیراوە لە چاووگ ( مصدر)ەوە ، وەکو (فَضْلٌ)[٤] دەڵێیت ( الفضل ) هەروەها دەچێتە سەر ئەو ناوەی وەرگیراوە لە ناوی ڕەگەز (اسم جنس ) کە چاووگ ( مصدر ) نەبێت وەکو ( نعمان ) دەڵێیت (النعمان )[٥] کە لە بنچینەدا ناوی خوێنە ، کەواتە دروستە ئەلیف و لام بچێتە سەر ئەم سیانە[٦] بە پێی ئەصل و بنەڕەتەکەیان وە دروستیشە حذف کرێت بە پێی ئێستایان[٧] .

جا ئاماژەی کرد بە ووتەی ( للمحِ ما قَدْ كانَ عنهُ نُقِلا ) بۆ ئەوەی کە سوودی ئەم ئەلیف و لامە بۆ ئەوەیە کە بزانرێت ئەم ناوانە وەرگیراون و نەقڵ کراون لە صفە یان شتێك مانای صفەی تێدا بێت[٨] .

---

[١] پێشتر لە باسی ( العلم ) دا باسی علمی منقولمان کرد.

[٢] ووشەی ( الحسن ) صفەی مشبە هەیە.

[٣] ( الحارث ) اسم فاعلی ( حرث ) بە مانای کێلان و کاری کێلاندن دێت.

[٤] فضل : چاووگ ( مصدری )ی فعلی ( فَضَلَ – يَفضُلُ )ە ، بەمانای ڕێز و بەخشش دێت.

[٥] واتا : ووشەی نعمان لە ئەصلدا ناوە بۆ خوێن و دواتر کراوەتە ناو بۆ کەسی سوورە ، دواتریش بەکارهاتووە بۆ غەیری سوورەش.

[٦] واتا : سەر هەر سێ ناوی ( الفضل و والحارث و والنعمان ).

[٧] واتا : ئەمانە لە بنەڕەتدا ناوی عەلەم نین بەڵکو صفەتن کە صفەتیش بن دروستە ئەلیف و لام بچێتە سەریان ، بەڵام دواتر کراونەتە ناوی عەلەم کە عەلەمیش دروستە ئەلیف و لامیان پێوە نەبێت چونکە عەلەم بۆ خۆی ناسراوە.

[٨] صفە وەکو ( فضل و حارث ) ئەوەش کە ماناکەی صفەی تێدایە وەکو ( نعمان) کە مەبەست پێی صفەتی سوورەیە ( الحمرة ).

پوختەی قسان: ئەگەر مەبەست لەو ناوە وەرگیراوە لە سیفەت و هاوێنەی بۆ ئەوە بێت کە کراون بە ناو بەمەبەستی گەشبینی بە ناوەڕۆك و مانای ئەو صفەتە ئەوە ئەلیف و لامی زیاد کراوی بۆ دێنیٚ وەکو دەڵێیت (الحارث) بە ڕوانین بۆ ئەوەی کە ناونراو پێی گەشبینی بووە بەو مەبەستەی بژێت و کێڵاٚن بکات[1] ، هەروەها هەموو ئەو ناوانەی تر کە مانایەك لەخۆ دەگرن کە بەزۆری صفەن ، وەکو ( فضل ) و هاووێنەی فضل ، بەلاٚم ئەگەر مەبەست ئەمە نەبوو[2] ، بەڵکو مەبەست ئەوە بوو کە ئەم ناوانە عەلەمن ئەوە ئەلیف و لام ناخەیتە سەری ، بەڵکو دەڵێیت: فضل و حارث و نعمان ، کەواتە ئەلیف و لام چوونە سەریان مانایەك دەگەیەنن کە بەبیٚ ئەو ئەلیف و لامە ئەو مانایانە نیە ، بۆیە ئەم ئەلیف و لامە زیاد کراو نیە بە پێچەوانەی قسە ئەوانەی وایان ووتووە[3] هەروەها باس کردن و باس نەکردنی ( حذف ) ی یەکسان نین هەروەکو دانەر وای فەرمووە ، بەڵکو باس کردن و باس نەکردنی ( الحذف والاثبات ) پەیوەندی هەیە بەو دوو حاڵەتەی کە باسکران کە بریتین لەوەی ئەگەر ئاماژە بکرێت بۆ ئەصل و بنەڕەت ئەوە ئەلیف و لام دێنین بەلاٚم ئەگەر ئاماژە ( لمح ) نەکرێت بۆ ئەصلٚ و بنەڕەتیان ئەوە ئەلیف و لام ناهێنین[4].

١١١- وقَــدْ يصير علـماً بالـــــغلـبة   مضافٌ أو مصحوب أل كالعقبة

---

[1] چوونکە وەك ووتمان ( الحارث ) اسمی فاعلی ( حَرَثَ يَحْرُثُ )ە.

[2] واتا / مەبەست گەشبینی و لەبەر چاو گرتنی مانای ئەو صفەتانە بوو.

[3] واتا / قسەی زۆربەی زانایان کە فەرموویانە ئەم ئەلیف و لامە زیاد کراوە ، لەوانە ابن مالك – ڕەحمەتی خوایان لێبێت .

[4] تێبینی / ئەم جۆرە ناوانەی کە ئەلیف و لام وەردەگرن ( سماعی )ن و قیاسی نین ، واتا ئەوەی کە عەرەب بەکاری هێناوە هەر ئەوەندە بەکاردێت بۆیە دروست نیە بچێتە سەر هەموو ناوێکی عەلەمی تر.

١١٢- وحذفَ ال ذي- إنْ تُنادِ أوتُضن  أوجب ، وفي غيرهما قَدْ تَنْحَذِف[١]

جۆرێك لە جۆرەكانی ئەلیف ولام[٢] ئەوەیە كە بۆ زاڵكردنی ئەو ناوە بێت كە لە دوایەوە دێت بۆ كەس و شتێكی تایبەت وەكو ( المدينة ) و (الكتاب) ئەم دوو ناوە لە ڕاستیدا دەبێت مەبەست پێیان هەموو مەدینەیەك و هەموو كتێبێك بێت ، بەڵام زاڵ بووە بەكارهێنانی ناوی ( المدينة ) بۆ مەدینەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، هەروەها ناوی ( الكتاب ) بۆ كتێبەكەی سیبویە[٣] - ڕەحمەتی خوای لێبێت - تەنانەت وای لێهاتووە كە ئەم دوو ناوە[٤]

---

[١] كورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیەیە ( ١١١ ) هەندێ جار ناوێك دەبێتە عەلەم بەهۆی تایبەت بەكارهێنانی بۆ یەك شت و زاڵبوونی بەسەر ئەوشتەدا ، جا ئەمیش واتا ( العلم بالغلبه ) دوو جۆرە یەكێكیان بەهۆی إضافەوە- وەكو ابن عمرو ابن مسعود وابن مالك ... ، ئەوی تریشیان بەهۆی ئەلیف و لامەوە وەكو( العقبه) كە لە ئەصلدا ناوە بۆ هەموو ڕێگەیەكی سەخت بەڵام تایبەتە بەو جێگەی كە نزیك شاری مەككەیە. ( ١١٢ ) جا حذف كردنی ئەم ئەلیف و لامە لە كاتی بانگكردن و إضافەدا واجبە و بەڵام جگە لەم دوو حاڵەتە دەكرێت لە حاڵەت و جێگەی تریش حذف كرێت ... وەكو نمونەی هێناوەتەوە لەسەرەوە.

[٢] واتا ئەلیف و لامی زیاد كراو.

[٣] لای هەمووان ئاشكرایە كە دانەری زانستی نحو ( ابو الاسود الدؤلي )ە ، بەڵام دواتر خلیلی كوڕی ئەحمدی فراهیدی علمی نحوی ڕێكخست و بابەتەكانی كۆكردەوە ، دوای ئەویش خوێندكاری بلیمەت و زیرەكی (سیبویە) علمی نحوی لە مامۆستاكە ی كە ( خلیل )ە وەرگرت و دواتر توانیتی ئەم علمی نحوە ڕێك خات و بەڵگەو نمونە بۆ هەموو بابەتەكان دانێت لە كتێبەكەیدا ( كتاب سیبویە ) دواتر هەر زانایەك زانستی نحوی نووسیبێت سەرچاوەی نوسینەكە ( كتاب سیبویە ) بووە.

[٤] واتا ناوی ( المدينة ) و ناوی ( الكتاب ).

بووترێت جگە لە مەدینەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و کتێبی سیبویە هیچی تر نایاتە خەیاڵی بیسەردا.

جا حوکمی ئەم ئەلیف و لامە[١] ئەوەیە کە حذف ناکرێت مەگەر لەکاتی بانگ کردن ( النداء ) یان لەکاتی إضافەکردن وەکو ( یا صعقُ ) لە ناوی ( الصعق )[٢] دا ، وە وەکو ( هذه مدینةُ رسول الله ﴿ﷺ﴾ وە هەندێ جاریش حذف دەکرێت لە غەیری بانگکردن و اضافەدا بە شاذی ، بیسراوە لە قسەی عەرەب ( هذا عیوقُ طالعا )[٣] ئەصڵەکەی ( العیوق ) کە ناوی ئەستێرەیە.

وە هەندێ جار ناوی عەلەمی زۆر بەکارهات و زاڵبوونی بەسەر شتێکدا بەهۆی إضافە کردنەوە پەیدا دەبێت ، وەکو ابن عمرو ابن عباس و ابن مسعود ئەم ناوانە زاڵبووە بەسەر عەبدولاکاندا ( العبادلة )[٤] نەوەکو کوڕانی تری عمرو عباس و مسعود ، هەرچەندە ئەوانی تریش کوڕیانن ،

---

[١] – واتا ئەلیف و لامی ناوی ( المدینة والکتاب ) و هاو وێنەکانیان.

[٢] – ( الصعق ) لە ئەصلی زماندا واتە کەسێك کە هەروە تریشقەی بەرکەو تبێت ، دواتر تایبەت کراوە بە ( خویلدی کوڕی نوفەیل ) کە عادەتی وابووە نانی خەڵکی دەداو رۆژێك با هەڵدەکاتە ناو مەنجەڵەکانی و جنێو بە باکە دەدات ، خوای گەورەش هەورە تریشقەیەکی لێدەدات دواتر ناوی ( الصعق ) زاڵبووە و بووە بە عەلەم بۆ خویلدی کوڕی نوفەیل.

[٣] – واتا / ئەوە ئەستێرەی ( عیوق )ە دەرچووە ، جا لێرەدا ( عیوق ) ئەلیف و لامەکەی لێکراوەتەوە و بانگ کراو نیە و اضافەش نەکراوە ئەمەش شاذە.

عیوق : ناوە بۆ هەرشتێك کە رێگر و بەربەست بێت ، بەڵام دواتر تایبەت کراوە بۆ ناوی ئەستێرەیەکی گەورەرە.

[٤] – ووشەی ( عبادلة ) کۆ ( جمع )ی ( عبدل ) کە وەرگیراو داتاشراوە لە نا (عبدالله)ەوە ، یان لە ئەصلدا ( عبد ) بووە و لامێکی بۆ زیاد کراوە.

بەلأم ئەمانە[1] زاڵبووە بەكارهێنیان بە وان و تەنانەت ئەگەر بوترێت ( ابن عمر ) جگە لە عبدالله كەسی تریانە نایەتە خەیاڵی هەروەها ( ابن عباس ) و (ابن مسعود )یش – ڕەزای خوایان لێبێت – جا ئەم إضافەكردنە بۆ ئەم ناوانە لێی جیا نابێتەوە نەلە بانگكردن ( النداء ) وە لە هیچ كاتێكی تردا وەكو ( یا ابن عمر )[2].

---

[1] – واتا ( ابن عمرو ابن عباس وابن مسعود ) دەكرێت بە هەموو كوڕێك لە كوڕانی عمر بوترێت ( ابن عمر ) بەلأم بەهۆی زاڵبوون ( غلبة ) تایبەت بوو بە بە ( عبدالله )ەوە هەروەها ئەوانی تریش.

[2] – لێرەدا ابن عمر بانگكراو ( منادی ) یەو هیچی لێ حذف نەبووە، لێرەدا كۆتایی بەباسی ناوە ناسراوەكان هات،إن شاءالله وانەی ئاینده دەچینە سەر مبتدأ و خبر

## الابتداء[1]

باسی مبتدا و جۆرەكانی:

١١٣. مبتدا زيدٌ ، وعاذرٌ خبر إنْ قُلتَ (زيدٌ عاذرٌ من اعتذر)

١١٤. واوّلٌ مبتدأٌ ، والثاني فاعلٌ اغنى في (اسارٍذان)

١١٥. وقِسْ ، وكأستفهام النفي ، وقَدْ يجوزُ نحو (فائزٌ اولوا الرشدا)[2]

---

(١) زانايانی نحو عادەتيان وايە دوای ئەوەی باسی جۆرەكانی كلام دەكەن و يەكەم جۆريش كە إسمە باسمان كرد ، دواتر باسی ناوە ناسراوەكان دەكەن ، دوای ئەوە دێينە سەر ئەو ووشانەی پێيان دەوترێت (المرفوعات) زۆربەيان لەناو مرفوعاتدا باسی (مبتدا) يان (الابتدا )پێش دەخەن و هەندێكيشيان باسی (الفاعل) پێش دەخەن -جالێرەدا (إبن مالك) شوێن دەستوری شێخی سيبويهی كەوتووە ڕەحمەتی خوايان لێبێت . لەوەی مبتدای پێش فاعل باس كردووە .

جا ووشەی (الابتداء ) چاوگ (مصدر) ە بەواتای دەست پێكردن ، وەهەندێ لە زانايان ووتويانە (باب المبتدأ و الخبر) . ووشەی مبتدا اسمی مفعولە بەواتای دەست پێكراو دێت و (خبر) يش واتا هەواڵ يان سيفەتێك كە دێت بۆئەو ناوە دەست پێكراوە و لەێزمانی زمانی كورديدا دەوترێت (نيهاد و گوزارە) بەلاّم ئێمە لەكاتی وەرگێڕان و لێكدانەوەدا دەڵێن مبتدا و خبر .

تێبينی : ئەو باسانەی پێشووتر دەربارەی ناو (اسم) بوو بە پێی سادەی (إفرادی) بەلاّم لێرە بەدواوە باسی ناوە بە پێی لێكدراوی (تركيبی) لەگەڵ غەيری خۆيدا .

(٢) كورتەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفيە بەم شێوەيە : (١١٣) ناوی زيد مبتدايە و ناوی (عاذر) يش خبرێتی ئەگەر بڵێيت (زيدٌ عاذرٌ من اعتذر ) واتە زيد قبوڵ دەكات پاساو (عذر) ی ئەو كەسەی پاساو دێنێتەوە ، ئەمەش نموونەيە بۆ جۆری يەكەمی مبتدا وەكو ابن عقيل ڕوونی دەكاتەوە (١١٤) يەكەم ووشەی ڕستەكە مبتدايە و دووەمی فاعلی مبتداكەيە و لە جێی خبری مبتداكە دادەنيشێت وەكو نموونەی (اسارٍ ذان) ئايا ئەو دووانە شەو ڕەون ؟ ئەمەش نموونەيە بۆ جۆری دووەمی مبتدا .

دانەر باسی ئەوە دەکات کە مبتدا دوو جۆرە : مبتدایەك خبری هەیە و مبتدایەك فاعلی هەیە و ئەو فاعلە لە جێی خبرەکە دادەنیشێ ، نموونەی یەکەم وەکو (زیدٌ عاذِرٌ من اعتذر) مەبەست لەم جۆرەش ئەوەیە کە مبتداکە وەصفێك نیە لە خۆی گرتبێت ئەوەی لە جۆری دووەمدا باسی دەکەین ، کەواتە (زیدٌ) : مبتدایە (عاذرٌ) خەبەرێتی و (من اعتذره) دەبێتە مفعول بۆ (عاذر)[1] . نموونەی جۆری دووەم (أسارٍ ذان) هەمزەکە بۆ پرسیارکردن (استفهام)ە ، (وسارٍ)[2] : مبتدایە و ذانِ: فاعلی ساریە و لە جێی خەبەرەکەیەتی ، جا قیاس دەکرێتە سەر ئەمە[3] ، هەر شتێك وەکو ئەم وابێت ئەویش بریتیە لە : هەموو وەصفێك[4] کە (استفهام)

---

(١١٥) جا قیاس کە هاو وێنەی (أسارٍ ذان) واتە : هەرکاتێك مبتدا وصف بوو . واتا اسمی فاعل یان اسمی مفعول بوو . استفهامی لەپێشەوە بوو ، وە وەکو استفهام وایە نەفی واتە دروستە لە پێش وەصفەکەوە نفی بێت ، وەهەندێ جار دروستە بەبێ هاتنی استفهام ونفی لە پێش وەصفەکەوە وەکو (فائزٌ اولوا الرشد) واتە براوەن خاوەنی ژیرییەکان . لێرەدا (فائز) اسمی فاعل و مبتدایە و (( اولوا )) فاعلێتی و جێی خەبەرەکەی گرتووە .

[1] چونکەعاذر اسمی فاعلە و اسمی فاعلیش عملی فعلەکەی دەکات ، واتا وەکو (یعذر) وایە ، یعذر فعلە و پێویستی بە (فاعل و مفعول بە)یە چونکە فعلێکی تێپەڕ (معتدی) ە . کەواتە (مَنْ) لە ڕستەکەدا اسمی موصولە وفی محل نصب مفعول بە ل (عاذر) .

[2] ووشەی (سارٍ) لە ئەصلدا (ساریٌ) بووە واسمێکی منقوصە بۆیە دروستە یایەکەی حذف کرێت و بکرێتە تنوینی کسر ، لە کاتی اعرابیشدا دەڵێین : مبتدا مرفوع و علامة رفعه الضمة المقدرة علی الیاء المحذوفة .

[3] واتا سەر ڕستەی (أسارٍ ذانِ) .

[4] پێشتر باسمان کرد وەصف بریتیە لە اسمی فاعل و اسمی مفعول و صفەی مشبە و صیغەی مبالغە کە وەرگیراو (مشتق)ن لە مصدرەوە

یان (نفی) لە پێشیوە بێت[١] وەکو : أقامٌ الزیدان[٢] ، وما قائمٌ الزیدان[٣] ، جا ئەگەر وەصفەکە استفهام یان نفی لە پێشەوە نەبوو ئەوە نا بێتە مبتدا لای بەصریێکان جگە لە ئەخفەش[٤] ، هەروەها دەبێت ئەو وەصفە فاعلەکەی ناوی ئاشکرا (ظاهر)[٥] بێت وەکو نموونە هێنرایەوە، یان جێناوی سەربەخۆ (ضمیر منفصل) بێت وەکو (أقامٌ انتما)[٦]، هەروەها دەبێت[٧]

---

[١] ئەمە مەرجی یەکەمە بۆ جۆری دووەمی مبتدا .

[٢] لێرەدا :أ: حرف استفهام . قائمٌ : مبتدا مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة . الزیدان : فاعل ل (قائم) مرفوع وعلامة رفعه الالف لأنه مثنی . وقد سد مسد الخبر .

[٣] ما قائمٌ الزیدان : وەکو ڕستەی پێشووتر إعراب دەکرێت ، جیاوازییەکەی ئەوەیە لە پێش مبتداکەوە نفی هاتووە

[٤] واتا / مبتدا ئەگەر وەصف بێت مەرجی یەکەمی ئەوەیە استفهام یان نفی لە پێشەوە بێت ، بەڵام ئەمە لای ئەخفەش و کوفییەکان مەرج نیە.

[٥] مەبەست لەناوی (ظاهر) ئەوەیە کە جێناو (ضمیر) نەبێت .

[٦] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە : أ :حرف استفهام لا محل لها من الإعراب. قائمٌ : مبتدا مرفوع و علامة رفعه الضمة الظاهرة . انتما : ضمیر منفصل مبني في محل رفع فاعل ل (قائم) وقد سدّ مسد الخبر .

[٧] ئەمەش مەرجی چوارەمە . کەواتە جۆری یەکەمی مبتدا هیچ مەرجی نیە ، بەڵام جۆری دووەم چوار مەرجی هەیە کە بریتین :

أ. دەبێت مبتداکە وەصف بێت

ب . دەبێت مبتداکە پشت ببەستێت بە استفهام یان نفی واتا استفهام ونفی لە پێشەوە بێت ، ئەوەش مەرجە لای بەصریێکان جگە لە ئەخفەش وەلای کوفیێکانیش مەرج نیە .

ج . دەبێت فاعلی ئەم مبتدایە اسمێکی (ظاهر)یان جێناوێکی سەربەخۆ بێت واتا نابێت جێناوێکی نادیار (مستتر) یان لکاو (متصل) بێت

ء . دەبێت بە مبتداکە و فاعلەکەی مانای ڕستەکە تەواو بێت و پێویستی بەناوی تر نەبێت .

مانـای ڕسـتەكەش بەهۆی فـاعلی ئـەو مبتدايـەوە تـەواو بێـت ، جـا ئەگـەر مانای ڕستەكە تـەواو نـەبوو ئـەوە وەصفەكە نابێتـە مبتدا وەكـو (أقـامٌ ابـواه زيدٌ) لێرەدا

زيدٌ : مبتدايە و دواكـەوتووە قـائم : خـبرەو پـێش كـەوتووە ، ابـواه : فـاعلی قـائمـە ، لێـرەدا دروسـت نيـە (قـائم) ببێتـە مبتـدا چـونكە بەتـەنها لەگـەڵ فاعلەكـەی ماناكـە تـەواو نابێـت و ناوترێـت (أقـائمُ أبـواه) وقـسە كـە تـەواو بێـت[1] ، هـەروەها دروسـت نيـە وەصـفەكە ببێتـە مبتـدا ئەگـەر فاعلەكـەی جێنـاوێكی نادیـار بێـت ، كەواتـە ناوترێـت (مـا زيـدٌ قـائمٌ ولا قاعـدٌ) لـەم ڕستەيەدا (قاعد) نابێتە مبتدا و جێنـاوە ناديارەكـەش[2] ببێتە فاعل جێی خبر بگرێت ، چونكە جێناوەكـە سـەربەخۆ نيە ، ، هەرچەندە ئـەم بابەتـه[3] خيلافی تێدايە ، هەروەها هيچ جياوازی نيە ئەگەر استفهامەكە[4] بەحرف بێت وەكو نموونەمان هێنايەوە ، يان بەناو (الاسم) بێت وەكو (كيف جالسٌ العمرانِ)[5] ؟ ، هەروەها جياوازی نيە ئەگـەر نەفييەكـە بـە حـەرف بێـت وەكـو

---

[1] ماناكەی دەبێتە (ئايا دايك و باوكی بەپێوەن) ديار نيە دايك و باوكی كێ مەبەستە و ئەو كەسەی جێناوی (ابواه) ی بۆ دەچێتەوە باس نەكراوە ، ئەميش دروست نيە .

[2] چونكە (قاعد) لە جێی (يعقد) ە و فاعلێكی مستتری هەيە تقديرەكەی (هُو) يە .

[3] واتا/ بابەتی ئەوەی فاعلی اسمە فاعلەكە جێناوی ناديار (ضمير مستتر) بێت ، دواتر ابن عقيل باسی دەكات .

[4] ئەمە قسەكردنە لەسەر مەرجی دووەمی جۆری دووەم لە مبتدا ، كە بريتی بوو لەوەی استفهام يان نفی لە پێش وەصفەكەوە بێت .

[5] لەم ڕستەيەدا :كيف: اسم استفهام مبني على الفتح في محل نصب حال . جالسٌ : مبتدا مرفوع وعلامة رفعه الضمة . العمران : فاعل لـ(جالس) مرفوع وعلامة رفعه الالف لأنه مثنى . وقد سد مسد الخبر . لەم ڕستەيەدا (كيف) اسمی استفهامە وەكو حرفی استفهام هەمان عەمەل دەكات .

نموونە هێنرایەوە ، یان بە فعل بێت وەکو ( لیسَ قائمٌ الزیدانِ ) لێرەدا لیس : فعل ماضی ( ناقص )ەو قائم : اسم ( لیس ) یەو ، الزیدان : فاعلی (قائم)ەو لە جێی خبری ( لیس) یە ، هەروەها دەڵێیت : ( غیرُ قائمٍ الزیدانِ ) غیر : مبتدایە ومضافە بۆ لای ( قائم ) قائمیش مضاف إلیە مجرورە ، والزیدان فاعلی قائمەو لە جێی خبری ( غیر )وە ، چونکە مانای ئەم ڕستەیە[1] (غیر قائم) وەکو (ماقائم) وایە ،وە وەکو ووتەی شاعیریش :

ش٣٨ / غیرُلاهٍ عداك فاطرح اللهوَ ولا تغترْ بعارضِ سلْمِ[2]

لەم دێرەشعرەدا (غیر) مبتدایە و(لاهٍ)[3] ومضاف الیە مجرورە و وعِداك فاعلی (لاهٍ) وە لەجێی خەبەری (غیر)ە ، هەروەها وەکو ووتەی

ش٣٩ / غیر ماسوفٍ علی زمنٍ ینقضي بالهَمِّ و الحزنِ[4]

---

[1] واتە ڕستەی (غیر قائمٌ الزیدان) لەگەڵ ڕستەی (ما قائمٌ الزیدان) لە ڕووی ماناوە وەکو یەکن بەڵام (غیر) اسمە و بۆ نفی بەکارهاتووە .

[2] پوختەی مانای ئەم دێرە شعرە بەم شێوەیەیە : بێگومان بێ ئاگا نین دوژمنەکانت کەواتە بێ ئاگا مەبە و واز لە بێ ئاگیی بێنە فریو مەخۆ بە ئاشتییەکی کاتی . بەڵگەی ئەم دێرە شعرە (غیر لاهٍ عداك) لێرەدا (لاه) اسمی فاعلە و (عداك) فاعلێتی و جێی خەبەری (غیر) ی گرتووە .

[3] ووشە (لاهٍ) اصلەکەی (لاهي) بووە و ناوێکی منقوصە لە فعلی (لها - یلهو) ەوە وەرگیراوە و بەواتای غافڵ بوون و بێ ئاگا بوون دێت ، وإعرابیشی بەم شێوەیەیە : لاهٍ: مضاف إلیە مجرور و علامة جره الکسرة المقدرة علی الیاء المحذوفة .

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش بەم شێوەیەیە : نابێت کەسی ژیر و عاقڵ . پەشیمان بێت لەسەر ڕۆژگارێك کە ساتەکانی بە غەم و خەفەت کۆتایی هاتوون . بەڵگەکەی : (غیر ماسوف علی زمن) لێرەدا (علی زمن) (نائب فاعلی) (مأسوف)ە . چونکە مأسوف اسمی مفعولەو پێویستی بە نائب فاعلە جێی خبری (غیر) گرتۆتەوە .

لێرەدا (غیر) مبتدایە و ماسوف : مجرور بەهۆی إضافەوە واتە (مضاف الیە)یە علی زمن : جار و مجرورە لەشوێنی (نائب فاعل)ی ماسوف[1] وە جێی خبری (غیر) ەی گرتۆتەوە .

جا شێخی ئەبو الفتحی ئیبن جنی[2] پرسیاری إعرابی ئەم دێڕەی لە کوڕەکەی کرد ئەویش دڵنیا نەبوو لە إعراب کردنەکەی و بەگومان بوو لێی و سەری سوڕما[3] .

ڕاو بۆچونی بەصرێکان . جگە لە ئەخفەش . ئەوەیە ئەم وەصفە[4] نابێتە مبتدا مەگەر پشتی بەستبێت بە نفی یان استفهام ، بەلام ئەخفەش و کوفێکان[5] ئەمەیان بەمەرج نەگرتووە ، بۆیە پێیان دروستە بڵێیت (قائمٌ الزیدان)

قائمٌ : مبتدایە و الزیدان : فاعلی قائمە وە لە جێی خەبەرکەیەتی ، جا بۆ ئەم ڕایەش [6] ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی (وقد یجوز نحو : فائزٌ أولوا الرشد) واتە : هەندێ جار دروستە بەکارهێنانی ئەم وەصفە بە مبتدا بێ ئەوەی لە پێشەوەی نفی یان استفهام هەبێت ، وە دانەر ووتویەتی کە سیبویە ئەمە[7] بە دروست دەزانێت بە لاوازی ، ئەوەی کە هاتووە لەم بارەوە ووتەی شاعیر :

---

[1] چونکە ووشەی (ماسوف) اسمی مفعولە و پێویستی بە نائب فاعلە .

[2] ابن جنی ناوی تەواوی عوسمانی کوڕی جنی یە و لەشاری موصلْ لە دایك بووە لە ساڵی ٣٣٠ ك ، یەکێکە لە پێشەواکانی زانستەکانی زمانی عەرەبی و ساڵی ٣٩٢ك لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە . خوای گەورە لێی خۆش بێت .

[3] مەبەستی ئەوە بووە زیرەکی کوڕەکەی . کە ناوی (غالی)ە بووە و زۆر زیرەك و وریا بووە . تاقیدەکاتەوە ئەویش تووشی دوو دڵی بووە .

[4] مەبەست پێی جۆری دووەمی مبتدایە کە لە سەرەتای (مبتدا و خبر) ەوە باسمان کرد .

[5] واتە بە مەرجیان گرتووە (وصف) کە مبتدا بێت نفی یان استفهام لە پێشەوە بێت .

[6] واتە ڕای کوفێکان و ئەخفەش .

[7] واتە ئەوەی کە وەصفەکە نفی یان استفهام لە پێشەوە نە بێت .

ش.٤٠/ فخيرٌ نحن عند النّاسِ منكم    اِذا الداعي المثوبُ قال : يالا[١]

لێرەدا خيرٌ مبتدايە ونحن : فاعلی (خير)[٢] ئەو لە جێی خەبەرەكەیەتی و لە كاتێكدا (خير) نە نفی ونە استفهام لە پێشێوە نەهاتووە ، هەروەها ووتەی شاعیریش لەم بابەتە دانراوە كە دەڵێت :

ش.٤١/ خبيرٌ بنو لِهْبٍ ، فلا تَكُ مُلْغيا    مقالةَ لِهبيِّ اِذا الطيرُ مَرَّتِ[٣] .

لێرەدا (خبيرٌ) مبتدايە و بنو لهب ، فاعلە و جێی خەبەرەكەی گرتۆتەوە ![٤]

١١٦. والثاني مبتدا ، وذا الوصف خَبَرْ    اِنْ في سوى الافراد طبقاً استقر[٥]

---

[١] مانای ئەم دێرە شیعرە بەم شێوەیەیە : ئێمە چاكتر و باشترین لای خەڵكی لە ئێوە، كاتێك لێقەوماو هاوار دەكات و یەخەی خۆی دادەرێت و داوای فریاكەوتن دەكات و دەڵێت فریای فڵان كەون

بەڵگەی ئەم دێرە شیعرە : (فخير نحن) لێرەدا خير وەصفەو بووە بە مبتدا و فاعلەكەشی جێی خبری گرتۆتەوە بە بێ ئەوەی نفی یان استفهام لە پێشێوە هاتبێت.

[٢] چونكە ووشەی (خيرٌ) لە ئەصلدا (أخير) ە واسمی تفضیلە وپێویستی بە فاعلە چونكە وەصفە .

[٣]ماناو بەڵگەی ئەم دێرە شعرەش بەم شێوەیە : لێزان و شارەزان نەوەی لهب . بەدەور و خولی باڵندەكان . كەواتە بەڕاست بزانە قسەیان كاتێك باڵندە ڕەت بوو و دەور و خولی كرد .

بەڵگەكەی : (خبيرٌ) وەصفە و كراوە بە مبتدا و فاعلی هەیە كە بریتیە لە (بنو) و لە جێی خەبەرەكەیەتی ، بەبێ ئەوەی نفی یان استفهام لە پێشێوە هاتبێت .

[٤] إعرابی تەواوی ئەم دێرە شیعرە و سەرجەم دێرە شیعرەكانی تر لە حاشیەی كتێبەكەدا . واتە شەرحی إبن عقیل . كە دانروای (محمد محی الدین عبدالحمید) بە تفصیل كراوە و پێویستە تەماشاكرێت بۆیە ئێمە اعرابی ناكەین .

[٥] كورتەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە بەم شێوەیەیە : دووەم بكە بە مبتدا . واتا فاعلی وەصفەكە . ، وە وەصفەكە بكە بە خبر . واتە خبری مقدم . ئەگەر لە جگە لەتاك بون (الإفراد) دا واتە لەدووان (تثنيه) وە كۆ (جمع) دا . وەكو یەك وابن .

وەصف لەگەڵ فاعلەكەیدا[١] یان وەكو یەكن لە ڕووی تاك بوون یان دووان بوون یان كۆ بوون[٢] یان وەكو یەكێك نین[٣] ئەویش[٤] دوو جۆرە : دروست و نادروست .

جا ئەگەر وەصفەكە و فاعلەكە وەكو یەك بوون لە تاك بوون (إفراد) دا وەكو(قائمٌ زیدٌ)[٥] ئەوە دوو إعرابی تێدا دروستە : یەكەمیان ئەوەیە وەصفەكە (قائم) مبتدا بێت و دوای وەصفەكەشی (زیدٌ) فاعلی بێت و جێی خەبەری گرتبێت .

دووەمیان : ئەوەیە دوای وەصفەكە مبتدای (مؤخر)[٦] بێت و وەصفەكەش خەبری مقدم بێت لەسەر ئەم اعرابەشە[٧]

---

[١] چونكە وەكو ووتمان وەصف بریتیە لە (اسم الفاعل ، اسم المفعول ، صفة المشبهة ، صيغة المبالغة ، (فعل التفضيل) ئەمانە هەموویان عملی فعلەكەیان دەكەن وەكو نەحوێكان دەڵێن (یعمل عمل فعله) واتە : چۆن فعل پێویستی بە فاعل یان نائب فاعل هەیە و زۆر جاریش پێویستی بە مفعول هەیە ئەمانیش بەهەمان شێوەن .

[٢] واتە هەردوكیان تاك بن وەكو (قائمٌ محمدٌ) یان دووان بن وەكو (قائمان محمدان) یان كۆ بن وەكو (قائمون محمدون)

[٣] واتە یەكێكیان تاك بێت و ئەوی تریان دووان یان كۆ بێت ، بەزۆریش وایە وەصفەكە تاك بێت وەكو لە شەرحەكەدا ڕوون دەبێتەوە.

[٤] واتە : ئەوەی وەك یەك نین (غیر المطابق).

[٥] لێرەدا (قائمٌ) وەصفەكەیە چونكە اسمی فاعله و (زیدٌ) یش فاعلەكەیەتی

[٦] ئەصڵ وایە مبتدا لەسەرەتاوە بێت . چونكە مبتدا واتە دەست پێكراو . بەڵام هەندێ جار لە زمانی عەرەبیدا دوا دەكەوێت و پێی دەوترێت (مبتدأ مؤخر) دواتر باسیان دەكەین بە تفصیل إن شاء الله تعالی .

[٧] واتە إعرابی دووەم .

فــــــه‌رمـــــــووده‌ی خـــــوای گه‌وره ﴿ اراغِبٌ انْتَ عن آلهتي یاإبراهیم﴾[١] لێره‌دا دروسته (أراغبٌ)[٢] مبتدا بێت و (انت)[٣] فاعلی بێت و جێی خبری گرتبێته‌وه ، هه‌روه‌ها دروسته (أنتَ) مبتدا بێت و دواكه‌وتبێت و (اراغبٌ) خبر بێت و پێش كه‌وتبێت .

جا له‌م ئایه‌ته‌دا إعرابی یه‌كه‌م[٤] باشتر و چاكتره ، چونكه ووته‌ی (عن آلهتي) معمولی (راغب)ه[٥]، كه‌واته له‌سه‌ر إعرابی یه‌كه‌م به‌ین نه‌كراوه‌ته

---

[١] ئایه‌تی (٤٦) سوره‌تی (مریم) مانا و اعرابی ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه به‌م شێوه‌یه‌یه (باوكی ئیبراهیم له‌ وه‌لامی كوره‌كه‌یدا ووتی . ئایا تۆ واز له په‌رستراوه‌كانی من دێنی ئه‌ی ئیبراهیم .... )-

-إعرابی ته‌واوی ا: حرف استفهام مبني على الفتح لا محل لها من الإعراب . راغبٌ : خبر مقدم مرفوع . انْتَ : ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدا مؤخر . عن آلهتي : جار و مجرور . وآلهة : مضاف . ي ضمير متصل مبني في محل جر مضاف اليه . يا حرف نداء . ابراهيم : منادى مبنى على الضم في محل النصب . به‌ڵگه‌ی ئه‌م ئایه‌ته لێره‌دا : له ڕسته‌ی (اراغبٌ انت) دروسته ئه‌وه‌ی ووتمان و ئه‌وه‌ش بڵێی (راغب) مبتدایه و (انت) فاعلێتی و جێی خه‌به‌ره‌كه‌ی گرتووه . چونكه وه‌صفه‌كه و فاعله‌كه هه‌ردووكیان مفردن . هه‌رچه‌نده لای زۆربه‌یان له ڕووی مانه‌وه ئه‌م اعرابی دووه‌مه ده‌بێت بكرێت بۆ ئایه‌ته وه‌كو ابن عقیل ڕوونی ده‌كاته‌وه.

[٢] ووشه‌ی (راغب) اسمی فاعله و له فعلی (رَغِب) وه‌رگیراوه ، ئه‌م فعله ئه‌گه‌ر له دوایه‌وه حرفی جری (عن) هات ئه‌وه به مانای پشتێكردن و وازهێنان دێت ، به‌لام ئه‌گه‌ر له دوایه‌وه حرفی جری (في) هات (رغب فيه) ئه‌وه به‌مانای حه‌ز لێبوون دێت .

[٣] انت بۆ خۆی جێناوی سه‌ربه‌خۆیه و مبنیه له محلی رفعدا .

[٤] واته إعرابی ئه‌وه‌ی وه‌صفه‌كه كه (راغب) ه مبتدا بێت و (انت) فاعلی بێت و جێی خبری گرتبێت .

[٥] پێشتر باسی ئه‌وه‌مان كرد له زمانی عه‌ره‌بیدا (جارو مجرور) په‌یوه‌ندی (تعلق) ده‌به‌ستێت به فعل یان هاوشێوه‌ی فعل (وه‌كو اسمی فاعل و اسمی مفعول ... هتد) وه

نێوان عامل و معمول به شتێك كه پەیوەندی بەم عامل و مەعمولەوە نیه ، چونكه(انت) به پێی ئەم إعرابه دەبێته فاعلی (راغب) و ئەو كاته پەیوەندی به راغبەوە هەیه و نابێته ووشەی بێگانه بۆی [١] ، بەلآم لەسەر إعرابی دووەم[٢] دروست دەبێت بوونی ووشەی بێگانه له نێوان عامل و مەعمولەكەدا ، چونكه (انت) پەیوەندی به (راغب) ەوە نامێنێت لەسەر ئەم إعرابه لەبەرئەوەی دەبێته مبتدأ و (راغب) هیچ عملێكی تێدا نەكردووه ، چونكه (راغب) دەبێته (خبر) و خبریش عمل له مبتدا ناكات لەسەر ڕای بەهێز و ڕاست[٣] .

جا ئەگەر وەصفەكه و فاعلەكەی وەكو یەك بن له دووان بوون (تثنیة)دا وەكو (أقائمان الزیدان) یان له كۆ (جمع) دا وەكو (أقائمون الزیدون) لەم حاڵەتەدا ئەوەی دوای وەصفەكه[٤] دەبێته مبتدا[٥] وه وەصفەكەش دەبێته خبری مقدم ، ئەمەیه مانای ووتەی دانەر (دووەم ناوی دووەمی ڕستەكه .

---

ئەو شتەی جار و مجرورەكه تعلّقی پێوەیه دەبێته عاملی جارو مجرورەكەش ، جا لێرەدا جارومجرور (عَنْ آلهتي) متعلقه به (راغب) چونكه راغب اسمی فاعله و دەبێته عاملی (عن آلهتي) و ئەویش دەبێته معمولی .

[١] ووشەی بێگانه (اجنبی) ئەوە یەك دوو ووشه له ڕستەكەیدا بن و هیچ پەیوەندی كار لەیەك كردن (عمل) لەنێوانیاندا نەبێت .

[٢] واتا إعرابی ئەوەی (انت) مبتدای مواخر بێت (راغب) خبری مقدم بێت .

[٣] پوختەی قسەكه ئەوەیه : بۆیه ڕای دووەم دروست نیه له ئایەتی (اراغب انت .... ) چونكه (راغب) عامله و معمولەكەی دووشته (انت) فاعلێتی و (عن آلهتي) جارو مجروره و مفعول به غیر صریحه بۆی ، كەواته دەبێت (أَنْتَ) جگه له فاعلی (راغب) إعرابی تری بۆ نەكرێت كه له مەعمولێتی راغبی بخات.

[٤] ئەوەی دوای وەصفەكه واتا (الزیدان) یان (الزیدون) .

[٥] واتا مبتدای مؤخر

مبتدایه و وەصفەکەشی - کە ناوی یەکەمی ڕستەکەیە خبرە - تاکۆتایی دێڕەکە) واتە : دووەم کەناوی دووەمی دوای وەصفەکەیە - مبتدایە و ، وەصفەکەشی خبرێتی و پێش کەوتوو . ئەگەر هەردووکیان وەکو یەك بن لە جگە لەتاك بوون (الافراد) واتە لە دووان بوون و کۆبوون دا (التثنیة و الجمع) ئەمەش [١] ڕای زۆر و باوی زمانی عەرەبیە ، وە دروستە لەسەر ڕای (أکلوني البراغیث)[٢] وەصفەکە مبتدا بێت و دوای خۆی فاعلی بێت و جێی خۆی بگرێت.

بەڵام ئەگەر وەصفەکەو فاعلەکەی وەکو یەك نەبن ئەوە دەبێتە دوو جۆر : نادروست و دروست وەکو پێشر ووتمان ، نموونەی نادروستە کە (اقائمان زیدٌ) و (اقائمون زیدٌ) ئەم جۆرە ڕستانە ڕاست نیە و دروست نیە[٣] ، وە

[١] واتائەوەی کە دوای وەصفەکە مبتدای مؤخر بێت و وەصفەکەش خبری مقدم بێت.

[٢] ئەم ڕستەیە (أکلوني البرغیث) کێچەکان خواردمیان کراوەتە نازناوێك بۆ ڕایەك لەو ڕایانەی کە پێی دروستە فعل کاتێك فاعلەکەی دووان (مثنی) یان وەکو (جمع) بێت ، جێناوی دووان یان کۆ بلکێنی بە فعلەکەوە و بڵێ (قاما الرجلان) یان (قاموا الرجال) ئەمەش ڕاوبۆچوونی طائیەکانە کە پێچەوانەی ڕای زۆرینە (جمهور)ی عەرەبە ، چونکە فعل فاعلەکەی مفرد بێت یان مثنی یان جمع دەبێت بەیەك شێوە بەکاربێت و دەڵێیت (قام الرجل) و (قام الرجلان) و (قام الرجال) و نابێت دەستکاری بکرێت و بکرێتە دووان یان کۆ ، جا ئەگەر وای لێ هات ئەوکات دروست نیە اسمی فاعلەکە عمل بکات لەو ناوەی دوای خۆی بۆ نموونە (قائمان الزیدان) الزیدان نابێتە معمولی قائمان چونکە قائمان دەستکاری صیغەکەی کراوە و کراوەتە دووان ، بۆیە دەبێت (قائمان) خبری مقدم بێت و (الزیدان) مبتدای مؤخر بێت .

[٣] بۆیە دروست نیە چونکە ناتوانرێت وەصفەکە (قائمان) و (قائمون) بکرێتە خبری مقدم چونکە جیاوازە لە مبتدا کە لە ڕووی تاك و دووان و کۆ بوونەوە ، هەروەها دروست نیە وەصفەکە ببێتە مبتدا چونکە وەصف دەبێت وەکو فعل بێت نابێت نیشانەی دووان و کۆی پێوە بێت لەسەر قسەی زۆرینە وەکو باسکرا.

نموونـەی دروسـتە کـە (اقـائم الزیـدان) و (أقـائمٌ الزیـدون) لـەم حاڵەتـەدا پێویستە وەصفەکە مبتدا بێت و ناوەکەی تری دوای خۆیشی فاعل بێت و جێی خبری گرتبێت.

*باسی عاملی مبتدا و خبر

١١٧. ورفعوا مبتدأ بالابتداء كذاك رفعٌ خبرٍ بالمبتدأ[١]

ڕاوبۆچـوونی سـیبویە و زۆرینـەی بەصـرێکان ئەوەیـە کـە مبتـدأ مرفوعـە بەهۆی دەست پێکردن الابتدا[٢] ەوە و خبریش مرفوعە بە مبتداکە . کەواتە عاملی مبتدأ مانایە (معنوی)[٣] ئەویش بریتیە لەوەی کە ناوەکە[٤] خالیە لە عاملیە لفظیە ئەصلیەکان[٥] کە زیادکراو نین و هاوشێوەی زیادکراویش

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیە : مرفوعیان کردووە عەرەب مبتدأ لەبەر ئەوەی لە سەرەتای ڕستەوە دێت . واتا ئەوشتەی مبتدای مرفوع کردووە مانایەو لفظ نییە . هەروەها مرفوع بوونی خبریش بەهۆی مبتداوەیە واتا عاملی خبر مبتدایە، وەکو لەشەرحەکەدا ابن عقیل ڕوونی دەکاتەوە .

[٢] مەبەست لە دەست پێ کردن ووشەی یەکەمی هەموو ڕستە (جملە) یەکە .

[٣] پێشتر باسمان کرد کە زۆربەی ووشەکان: زۆربەی ووشەکان پێویستیان بە عاملە و عاملیش دوو جۆرە: لفظي : ئەوەیە کە دەنوسرێت و دەخوێنرێتەوە ئەمەش زۆرترین عاملەکانە ، جا عاملی لفظي دەبێتەوە بە دوو جۆر : یاسادار (قیاس)ە کە ئەمانیش (٧) عاملن ، بێ یاساو بیستراو (سماعی) ئەمانیش (٩) عاملن دووەم جۆری عامل (عامل معنوی)یە ئەمەش بریتیە لەوەی کە نانوسرێت و ناخوێندرێتەوە ، جا عاملی معنوی لە زمانی عەرەبیدا دووانن أ . عاملی مبتدأ لێرەدا باسی دەکەین ب عاملی فعلی مضارعي مرفوع کە لە باسەکانی هاتووەدا باس دەکەین . إنشاء الله.

[٤] ناوەکە مبتدأ بێت .

[٥] لە زمانی عەرەبیدا عاملی لفظي دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر (لە ڕووی ئەصلْ بوون و زیادکراو بوون) أ. عاملی أصلی : ئەوەیە کە عمل دەکات لەدوای خۆی و ماناشی

نین[1] جا خۆ پارێزراو لە بە (زیادکراو نەبێ لە هاو وێنەی (بحسبك درهم)[2] لێرەدا حسبُك :مبتدایە چونکە خالیە لە عاملی ئەصڵی هەرچەندە عاملی زیادکراوی پێوەیە ، هەروەها خۆ پارێزرا بە (( هاوشێوەی زیادکراو )) لە وێنەی(رَبَّ رجلٍ قائمٌ) لێرەدا رجل : مبتدایە و قائمٌ خەبەرە بۆی ،بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کەناوێك عطف کرێتەوەسەری[3]مرفوع دەبێت وەکو:( رُبَّ رجلٍ قائمٌ وامراةٌ)[4]

هەروەها عاملی خبر لفظیە ، ئەویش بریتیە لە مبتدا[5] و ئەمەش ڕاوبۆچوونی سیبویە – ڕەحمەتی خوای لێبێت – ڕای کۆمەڵێکی تر[6] وایە

هەیە : ب . عاملی زیاد کراو ئەوەیە کەمانای نیە بەلاَم عمل دەکات لە ناوەکەی دوای خۆی دەکات لە لفظە کەیدا . ج . هاو وێنەی زیادکراو (شبیه بالزائد) مانای هەیە و عمل لە دوای خۆی لە لفظە کەیدا بەلاَم (تعلق) نا بەستێت بەشتێکەوە ، ئەم-جۆرەش تایبەتە بۆ حەرفی جری (رُبَّ و لعلَّ ولولا) . دواتر لە باسی حرفی جردا بە تفصیل باس دەکرێن .

(1) هاوشێوەی زیادکراو (شبیه بالزائد) مەبەست پێی ئەو حەرفەجەرەیە کەمانای هەیە و تعلق نابەستێت بە عاملەوە ، بەزۆریش حرفی جری (رُبّ) بۆ ئەمە بەکاردێت ، هەندێ جاریش بەکەمی حەرفی (لعلَّ ولولا) ئەگەر بکرێنە حەرفی جر .

(2) لەم ڕستەیەدا (حسبك) مبتدایە و عاملی پێوەیە کە حرفی جری (ب) بەڵام ئەم عاملە هیچ دەورێکی نیە چونکە زیاد کراو(زائد) ە .

وە (حسبك) إعرابی تەواوی بەم شێوەیە : مجرور لفظاً مرفوع محلاً وهو مبتدا .

(3) واتا : سەر اسمە مجرورەکەی دوای ( رُبَّ ).

(4) لەم ڕستەیەدا ووشەی ( امراةٌ ) عطف کراوە بۆ ناوی ( رجل ) هەرچەندە ناوی ( رجل ) بە لفظ مجرورە بەلاَم لە محلدا مرفوعەو مبتدایە بۆیە ناوێك عطف کرێتەوە سەری مرفوع دەبێت بە پێی محەلەکەی .

(5) واتا : مبتدا خبری مرفوع کردوە ، دیارە مبتداکەش عاملێکی لفظیە.

(6) ئەو کۆمەڵە زانایەش بریتیە لە ( اخفش و ابن السراج و الرماني )

کە عاملی مبتداو خبر بریتیە لە دەست پێکردن ( الابتداء ) کەواتە عاملی هەردووکیان معنویە . هەروەها وتراوە : مبتدا مرفوعە بە دەست پێکردن ( الابتداء ) ، خبریش مرفوعە بە ابتداء و مبتداکە.

هەروەها وتراوە : یەکتریان مرفوع کردوە ، واتا خبر مبتدا مرفوع دەکات و مبتداش خبر مرفوع دەکات[١]، جا ڕاست ترین و جوانترینی ئەم بۆچوونانە بۆچوونی سیبویەیە – کە ڕای یەکەم بوو –[٢] ئەم خیلافەش[٣] هیچ سوودی نیە.

* * *

[١] بە پێی ئەم بۆ چوونە مبتداو خبر هەردووکیان عاملی یەکترن و معمولیشن بۆ یەکتر ، ئەمەش ڕاوبۆچوونی کوفیەکانە.

[٢] ئەوەی کە وتمان عاملی مبتدا معنویە و عاملی خبریش لفظیة کە بریتیە لە مبتدا.

[٣] واتا / خیلاف لە عاملی مبتداو خبردا ، پوختەی خیلافەکەش چوار بۆچوون بوو کە باس کرا.

* پێناسەی خبر

١١٨- والخبرُ : الجزء المتّمُ الفائده كاللهُ بَرٌّ والأيادي شاهده[١]

دانەر پێناسەی خبری کردوە بەوەی کە بریتیە لە بەشی تەواوکەری مانای قسەو ڕستەکە[٢]، جا ڕەخنە دێتە سەری بەوەی فاعلیش وایە[٣] وەکو ( قَامَ زيدٌ ) لێرەدا ڕاستە بڵێین زیدٌ ماناو قسەی ڕستەکەی تەواو کردوە ، هەروەها ووتراوە لە پێناسەی خبردا : بریتیە لەو بەشەی کە لەگەڵ مبتدادا قسەو ڕستەی تەواو ڕێکدەخەن ، ئەم پێناسەیەش ڕەخنەی فاعل نایاتە سەری ، چونکە فاعل لەگەڵ مبتدادا حملەو قسە پێك ناهێنێت بەڵکو لەگەڵ فعلدا جملە پێکدێنێت ، پوختەی ئەمە ئەوەیە کە دانەر پێناسەی خبری کرد بە شتێك کە لە خبر و غەیری خبریشدا هەیە ، دیارە پێناسەش تایبەت بێت بە پێناسەکراو .

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : خبر : بریتیە لە بەشی تەواوکەری ماناو مەبەستی قسەو ڕستەکە – وات خبر لەگەڵ ناوە مبتداکەدا مانایەك تەواو دەکەن و- -هەردووکیان دەبنە قسەیەکی تەواو ، وەکو نمونەی : ( اللهُ بَرٌّ ) واتا – خوا چاکەکارە – ئەم ڕستەیە پێکهاتووە لە مبتدایەك ( الله ) و خبرێك ( بَرٌّ ) ، هەروەها نمونەی ( الأيادي شاهدة ) واتا – نازو نیعمەتەکانی خوای گەورەش بەڵگەن لەسەر چاکەکاری خوای گەورە. لەم ڕستەیەشدا ( الأيادي ) مبتدایە و ( شاهدة ) خبرە. تێبینی : ووشەی ( الأيادي ) کۆ ( جمع ) ی ( يَدٌ ) ، جا ووشەی ( يَدٌ ) ئەگەر جمعەکەی ( ايادي ) بێت ئەوە بە مانای نیعمەتەکان دێت ، بەڵام ئەگەر جمعەکەی ( ايدي ) بێت ئەوە بە مانای هێز ( قوة ) و دەستەکان دێت.

[٢] واتا / ناو بە تەنها مانای نیە تاوەکو خبرێکی بۆ دەهێنرێت ، جا بەهۆی خبرەوە قسەو ڕستە دروست دەبێت.

[٣] واتا / فاعلیش بریتیە لە بەشی تەواوکەری قسەو مانا ، بۆیە پێناسەکە ڕەخنەی هاتۆتە سەر.

## * باسی جۆرەکانی خبر و مەرجەکانیان

١١٩- ومفرداً يأتي، ويأتي جملةً     حاويةً معنى الذي سيقت لَه

١٢٠- وَإنْ تكُنْ إيّاه معنىً اكتفى     بِها كنطقي: الله حسبي وَكَفى[١]

خبر دابەش دەبێت بۆ[٢]: تاك (مفرد) و ڕستە(جملە)، جا دواتر باسی مفرد دەكەین. خبری جملە یان لەماندا لەگەڵ مبتدا یەكن یان یەك نین[٣]. جا ئەگەر خبرەكە لە مانادا مانای مبتدای تیا نەبوو ئەوا پێویستە لەناو جملەی خبرەكەدا (رابط)[٤] ێك هەبێت، بۆ ئەوەی ئەو جملەیە ببەستێتەوە بە مبتداكەوە، جا (رابط)یش چەند

---

[١] كورتەی مانای ئەم دوو دێڕە: (١١٩) خبری مفرد هەیە و خبری جملەش هەیە ، جا ئەوەی جملەیە لەخۆ دەگرێت مانای ئەو شتەی بۆ هاتووە – واتا ئەو خبرەی جملەیە لەخۆ دەگرێت شتێك دەگەڕێتەوە بۆ مبتداكە و پێی دەوترێت رابط.

(١٢٠) بەڵام ئەگەر ئەو جملەی خبرەی مانای لەگەڵ مبتداكە یەك بێت ئەوا پێویستی بە – رابط – نیە، وەكو ڕستەی (نطقي: الله حسبي وَكَفى) واتا قسەی من: خوام بەسە، دواتر اعرابی ئەم ڕستەیە دەكەین انشاءالله.

[٢] لەزمانی عەرەبیدا خبر بەشێوەیەكی گشتی سێ جۆرە: (أ) مفرد وەكو: الله غَفورٌ. (ب) جملە: ئەمیش دوو جۆرە: ١- جملەی اسمی. وەكو(الإسلام رايَتُهُ عاليةٌ). لێرەدا ڕستەی (رايَتُهُ عالية) جملەیەكی اسمی یە و دەبێتە خبر بۆ مبتدای یەكەم كە (الاسلام)ە.   ٢- جملەی فعل وەكو ﴿واللهُ يَهدي مَنْ يَشاءُ﴾.

(ج) شبە جملە: ئەمەش دوو جۆرە: ١- جار و مجرور. وەكو (الحمد لله). ٢- ظرف. وەكو (القلم فوقَ الكتاب). دواتر باسی ئەم جۆرانەش دەكەین انشاءالله.

[٣] واتا/ ئەگەر خبر جملە بێت، ئەو جملەیە جاری وا هەیە لەگەڵ مبتداكەدا یەك شتە، وەكو دواتر نموونەی بۆ دێنینەوە، وە جاری واشی هەیە – كە ئەمەش زۆرترە- مانای جملەكە لەگەڵ مبتداكە جیاوازە.

[٤] وشەی (الرابط) اسمی فاعلە و بەمانای (پەیوەندیكار) دێت واتا شتێك پەیوەندی لەنێوان دووشتدا دروست دەكات، جا لێرەدا مەبەست ئەوەیە هەركاتێك خبر جملە بوو –اسمی یان فعلی- پێویستە ئەو جملەیە شتێكی تێدا بێت ببەستێتەوە بە مبتداكەوە، جا ئێمە ووشەی (الرابط) بەكاردێنن لەكاتی شەرح كردندا.

شتێکە: (١) یان جێناوێکە دەگەڕێتەوە بۆ مبتداکە وەکو (زیدٌ قامَ ابوهُ)[١]، وەهەندێ جار جێناوەکە نادیارە وەکو (السَّمنُ مَنَوانِ بِدرهم)[٢] تقدیرەکەی (منوان منه بدرهم)[٣].(٢) یان ئاماژە (إشارە) کردنە بۆ مبتداکە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿وَ لِباسُ التَّقوی ذلِكَ خَیرٌ﴾[٤]. لە خوێندنەوەی(قراءة)ی ئەوانەی کە ووشەی (لباس) بە مرفوعی ئەخوێننەوە[٥].

---

[١] لەم ڕستەیەدا: زیدُ/ مبتدا مرفوع. قام/ فعل ماضي. ابوه/ فاعل مرفوع وعلامة رفعه الواو لأنه من الأفعال الخمسة، وهو مضاف. ه/ في محل جر مضاف اليه.

لێرەدا جملەی (قام ابوه) دەبێتە خبری (زیدُ)، لەناو جملەکەدا جێناوی (ه) رابطه و دەگەڕێتەوە بۆ زید.

[٢] ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە اعراب ئەکرێت: السمن/ مبتدا اول مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة. منوان/ مبتدا ثاني مرفوع وعلامة رفعه الألف لانه مثنى. بدرهم/ جار و مجرور متعلق بمحذوف، خبر لمبتدا الثاني. والمبتدا الثاني وخبره في محل رفع خبر لمبتدا الأول. والرابط بينهما محذوف والتقدير (منوان منه). واتای ئەم ڕستەیە (ڕۆن دوو هۆقەی بە درهەمێکە). ووشەی (منوان) دووان (مثنى)یە و مفردەکەی (مناً) جۆرە کێشانەیەکە لە کۆندا بەکار هاتووە.

[٣] – واتا لەم ڕستەیەدا خبری مبتداکە جملەیەکی اسمیە و رابطی نێوانیان بریتیە لە ضمیرێکی حذف کراو.

[٤] ئەم ڕستە قورئانییە بەشێکە لە ئایەتی (٢٦)ی سورەتی (الأعراف)ە، ماناکەی (..... بەڵام پۆشاکی پارێزکاری و ترسان لەخوا ئەوە چاکترە .....) اعرابی ئەم ڕستەیە: لباس/ مبتدا اول مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، وهو مضاف. التقوى/ مضاف اليه مجرور وعلامة جره الكسرة المقدرة على الالف منع من ظهورها التعذر. ذلك/ إسم إشارة مبني في محل رفع مبتدا ثانٍ. خيرٌ/ خبر المبتدا الثاني مرفوع بالضمة . وجملة (ذلك خير) في محل رفع خبر للمبتدا الأول. بەڵگەی ئەم ڕستەیە: لێرەدا خبر بریتیە لە جملەیەکی اسمی (ذلك خیر) وە پێویستە رابطیکی هەبێت و بگەڕێتەوە بۆ مبتداکەی، (رابط)ەکەشی بریتییە لە اسمی اشارە (ذلك)

[٥] چونکە هەندێ لە خوێنەرانی قورئان(القراء) ووشەی (لباس)یان بە مرفوعی خوێندۆتەوە، بەو شێوەیەی باسمان کرد،هەندێکی تریان بە منصوب خوێندویانەتەوە

(٣) یان دووباره بوونەوەی مبتداکەیه به هەمان لفظی خۆی، ئەمەش زیاتر بۆ ئەو شوێنانەیه کە باسەکە ناڕەحەت و قورس بێت وەکو فەرموودەی خوای گەورە ﴿الحآقّة ما الحآقّة﴾[1] وە ﴿القارعةُ ما القارعة﴾[2]، وە هەندێ جاریش بەکار دێت[3] بۆ غەیری باسی ناڕەحەتی و قورسی، وەکو (زیدٌ ما زیدٌ).(٤) یان خبرەکە گشتیەو مبتداکەش لەخۆ دەگرێت، وەکو (زیدٌ نِعمَ الرجل)[4]. بەلاَم ئەگەر ئەو جملەیەی دەبێتە خبر لەگەڵ مبتداکە مانایان یەك بێت ئەوا پێویستی بە رابط نییە. ئەمەیە مانای وتەی (ئەگەر جملەکە لەگەڵ مبتداکە مانایان یەك بێت .... تا کۆتایی دێڕەکە)[5]، واتا: ئەگەر ئەو جملەیەی دەبێتە خبر بۆ مبتدایەك هەمان شت بێت لەگەڵ مبتداکە ئەوا

---

-و عطفیان کردۆتەوە بۆ سەر ووشەی (لباساً) کە لەسەرەتای ئایەتەکەوە هاتووە، ﴿قَد أنزَلنا عَلَیکُم لِباساً یوارِي ....﴾

[1] الحآقّة: ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت، و ناوی سوڕەتێکە لە قورئان، مانای ئەم دوو ئایەتەی سەرەتای سوڕەتەکەش (الحآقة: ڕۆژی دوایی کە حەقو ڕاستی تێدا دەچەسپێت، چی بێت ئەو ڕۆژە؟!) اعرابی بەم شێوەیەیە: الحآقّة/ مبتدا اول مرفوع بالضمة. ما/ اسم استفهام مبني في محل رفع خبر المبتدا الثاني المكرر. الحاقة/ مبتدا ثاني مكرر مرفوع بالضمة. وجملة (ما الحآقة) في محل رفع خبر للمبتدا الأول. الشاهد في هذه الآية:لێرەدا خبری مبتداکە جملەیەکی اسمیە کە بریتیە لە (ما الحآقّة) و رابطی نێوانیان بریتیە لە دووبارە بوونەوەی لفظی مبتداکە.

[2] ئەم ڕستەیەش وەك پێش خۆی وایە، (القارعة) واتا ڕۆژی داچڵەکێنەر، یەکێکی ترە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی.

[3] واتا: دووبارەبوونەوەی لفظی مبتداکە.

[4] اعرابی ئەم ڕستەیەش بەم شێوەیەیە: زید/مبتدا مرفوع. نعم/ فعل ماضي جامد مبني على الفتح. الرجل/ فاعل مرفوع. والجملة الفعلية (نعم الرجل) في محل رفع خبر ل(زید). لێرەدا خبری مبتداکە جملەیە و رابطی نێوانیان بریتیە لەوەی کە زید بە شێکە لە (الرجل)، چونکە (الرجل) واتا: هەرچی پیاو هەیە، زیدیش بەشێکە لە پیاوان.

[5] واتا دێڕی ژمارە (١٢٠)ی ئەلفیەکە پێشتر مانامان کرد.

پێویست بە رابط ناکات لە نێوانیان، وەکو وتەی (نطقي الله حسبي)، لێرەدا نطقي: مبتدای یەکەمە. ناوی پیرۆزی(الله): مبتدای دووەمە. حسبي: خبرە بۆ مبتدای دووەم. وە مبتدای دووەم و خبرەکەی پێکەوە دەبنە خبر بۆ مبتدای یەکەم، بێنیازیشە لە رابط، چونکە وتەی (الله حسبي) بریتیە لە مانای (نطقي)[1]، هەروەها (قَولی لاإله إلا الله)[2]

*** باسی خبری مفرد**

١٢١- والمفرد الجامدُ فارغ، وَ إنْ     يُشتَقَّ فهوَ ذو ضميرٍ مُستَكِن[3].

پێشتر قسە کرا دەربارەی خبر ئەگەر جملە بێت، بەڵام ئەگەر خبر مفرد بێت ئەوە: یان جامدە یان مشتقە[4]، جا ئەگەر جامد بوو ئەوە دانەر باسی ئەوە

---

[1] واتا: قسەی من بریتیە لە خوای گەورەم بەسە(الله حسبي) کەواتا (الله حسبي) لەگەڵ (نطقي) یەك شتن، بۆیە لە ڕستەی (الله حسبي) کە دەبێتە خبر بۆ (نطقي) هیچ رابط یێك نییە.

[2] ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە اعراب ئەکرێت: قولی/ مبتدا مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة على الياء للمناسبة. وجملة (لا اله الا الله) في محل رفع خبر. جملەی (لا اله الا الله) بەم شێوەیە اعراب ئەکرێت: لا/ نافية للجنس. إله/ اسم لا مبني على الفتح في محل النصب. وخبر (لا) محذوف تقديره موجود. الا/ حرف استثناء. الله/ بدل من الضمير المستكن في الخبر المقدر. دیارە جملەی (لا اله الا الله) لە ڕوی اعرابەوەقسەی زۆر لەسەرە و دواتر لەباسی (لا النافية للجنس) شتێکی لێباس ئەکەین انشاء الله. لێرەشدا (قولی) لەگەڵ (لا اله الا الله) یەك شتن.

[3] پوختەی مانای ئەم دێرەی الفیە بەم شێوەیەیە: خبری مفرد ئەگەر جامد بێت – واتا ناوێك بێت صفە نەبێت و وەرنەگێراو (غیر مشتق) بێت– ئەوا ئەو خبرە خالیە لە جێناو (ضمیر)، بەڵام ئەگەر وەرگێراو (مشتق) بێت، ئەو لە خۆ دەگرێت جێناوێکی نادیار کە دەگەڕێتەوە بۆ مبتداکە.

[4] پێشتر باسمان کرد جامد ئەو ناوانەن نەگۆڕن و لە فعل و مصدرەوە وەرنەگیراون، بەڵام مشتق بە پێچەوانەوە، جا ناوە مشتقەکان لێرەدا تەنها بریتین لە (اسم الفاعل و اسم المفعول و الصفة المشبهة و اسم التفضيل و الصيغة المبالغة).

دەکات کە خالیە لە جێناو (ضمیر) وەکو (زیدٌ اخوكَ)[١]. بەڵام هەریەك لە شێخی (الکسائی و الرمانی)[٢] پێیان وایە خبری مفردی جامد جێناو لەخۆ دەگرێت وتقدیری ڕستەی (زیدٌ اخوك) لای ئەوان[٣]: (زیدٌ أخوك هو)، بەڵام بەصریەکان دەڵێن: مفردی جامد یان مانای مشتق لە خۆ دەگرێت یان نا، جا ئەگەر مانای مشتقی لە خۆ گرتبوو وەکو (زیدٌ اسدٌ)[٤] واتا، شجاع: ئازایە، ئەوە جێناو لەخۆ دەگرێت، بەڵام ئەگەر مانای مشتقی لەخۆ نەگرتبوو ئەوا جێناویش هەڵناگرێت وەکو ئەو نموونەیەی هێنرایەوە[٥]، بەڵام خبری مفرد ئەگەر مشتق بێت ئەوا دانەر باسی کرد کە جێناو لە خۆ دەگرێت وەکو (زیدٌ قائمٌ)[٦] واتا: ئەو (هو)، ئەمەش بە مەرجێك خبرە مشتقەکە ناوێکی ئاشکرا (ظاهر)ی مرفوع نەکردبێت[٧]. ئەم حوکمەش[٨]

---

[١] لێرەدا: اخوك/ خبر مرفوع وعلامة رفعه الواو لأنه من الاسماء الستة. جا (اخو) ناوێکی جامدە بۆیە هیچ جێناوێکی لەخۆ نەگرتووە کە بگەڕێتەوە بۆ مبتداکە.

[٢] الرمانی: ناوی تەواوی (علی بن عیسی بن علی) و ناسراوە بە (الرّمانی) یەکێکە لە زانا ناودارەکانی زانستەکانی ڕێزمانی عەرەبی، ساڵی ٢٩٦ك لە دایك بووە، و ساڵی ٣٨٤ك کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی نزیکەی (١٠٠) کتێب و دانراوە.

[٣] واتا لای کسائی و رمّانی.

[٤] لەم ڕستەیەدا (اسدٌ) خبرە و جامدە بەڵام بە مانای شتێك دێت کە مشتقە کە ئەویش (شجاع)ە ، دیارە ناوی (شجاع) صفەی مشبهەیە.

[٥] مەبەست لە نموونەی (زیدٌ اخوك) کە ناوی (اخو) جامدە و مانای مشتق لە خۆ ناگرێت.

[٦] لەم ڕستەیەدا (قائم) خبرە و اسمی فاعلە، کەواتا پێویستی بە فاعلە، بۆیە جێناوێك مرفوع دەکات کە (هو)ەیە

[٧] دواتر ابن عقیل بۆ خۆی باسی ئەم حاڵەتە ڕوون دەکاتەوە، وە مەبەست لە ناوی ئاشکرا، واتا: جێناو نەبێت.

[٨] واتا: حوکمی ئەوەی کە خبری مفرد ئەگەر مفرد بێت جێناو لەخۆ دەگرێت.

تەنها بۆ ئەو ناوە مشتقانەیە کە وەك فعل وان، وەکو (اسم الفاعل و اسم المفعول و صفة المشبهة و اسم التفضیل)، بەلأم ئەو ناوە مشتقانەی وەکو فعل نین[١]، ئەوە جێناو (ضمیر) لە خۆ ناگرن، ئەوانیش وەکو (اسماء الالة)[٢] وەکو ناوی (مفتاح) کە وەرگیراو (مشتق)ە لە (الفتح)ەوە، بەلأم جێناو لە خۆ ناگرێت، جا ئەگەر بڵێیت (هذا مَرمَی زید) ئەوا جێناوی تێدا نییە، هەروەها ئەو ناوە مشتقانەش لەسەر وەزنی (مَفْعَل)ن و مەبەست پێیان کات و شوێن (الزمان و المکان)ە وەکو (مَرمی) کە وەرگیراوە لە (الرَّمي)[٣] جێناو لە خۆ ناگرێت، جا ئەگەر بڵێین (هذا مَرمی زیدٍ)[٤] و مەبەست شوێن یان کاتی هاویشتنەکەی بێت ئەوە خبرەکە[٥] لێرەدا مشتقە، بەلأم جێناو لە خۆ ناگرێت، هەروەها ناوی مشتق کە وەکو فعل وابێت، کاتێك جێناو لە خۆ دەگرێت، ئەگەر ئەو ناوە ناوێکی ئاشکرای

---

[١] مەبەست ئەوەیە لەو ڕووەوە وەکو فعل نین، کە عملی فعل ناکەن، چونکە ناوە مشتەقەکان، لە زمانی عەرەبیدا هەموویان عملی فعل ناکەن، بەڵکو تەنها (اسم الفاعل و اسم المفعول و صفة المشبهة و اسم التفضیل و صیغة المبالغة) عملی فعل دەکەن، واتا پێویستیان بە فاعلە و هەندێ جاریش بە مفعولیش.

[٢] اسماء الآلة: بە کوردی واتا: ناوی ئامێرەکان، جا لە زمانی عەرەبیدا، اسم الاله دوو جۆرە: یەکێکیان: جامدە، واتا سماعین و یاسای دیاریکراویان نییە وەکو (القلم، السیف، السکین، ....). دووەمیان: ئەوەیە مەبەستە لێرەدا، مشتقە واتا قیاسیە و یاسای دیاریکراوی هەیە و حەوت وەزنی هەیە کە ئەمانەن (مِفعال، مِفعَل، مَفعَلة، فاعِلة، فاعول، فَعّالة، فِعّال).

[٣] (الرَّمي) چاووگە و بەمانای (هاویشتن) دێت.

[٤] لەم ڕستەیەدا (مَرمی) اسمی مکان یان زمانە ومشتقە بەلأم جێناوی لەخۆ نەگرتووە، چونکە اسمی زمان و مکان عملی فعلەکەیان ناکەن.

[٥] مەبەست پێی (مرمی)یە لە ڕستەی (هذا مرمی زیدٍ).

مرفوع نەکردبێت، جا ئەگەر ناوێکی ئاشکرای مرفوع کردبووئەوا جێناو لە خۆ ناگرێت، ئەمەش وەکو (زیدٌ قائمٌ غلاماه )[١] لێرەدا غلاماه/ مرفوعە بە (قائم) بۆیە (قائم) جێناو لە خۆ ناگرێت.

پوختەی ئەوەی باسکرا: خبری مفرد ئەگەر جامد بێت ئەوا، بەرەها (مطلق)ی جێناو لە خۆ دەگرێت لای کوفیەکان، بەڵام لای بەصرییەکان، جێناو لە خۆ ناگرێت مەگەر بە مشتق لێکبدرێتەوە (تأویل بکرێت)[٢]، هەروەها خبری مفرد ئەگەر مشتق بێت ئەوا جێناو لە خۆ دەگرێت و هەڵدەگرێت، بە مەرجێك ئەو خبرە مشتقە ناوێکی ئاشکرا مرفوع نەکات و لەو جۆرە مشتقانەش بێت کە عملی فعل دەکەن، وەکو (زید منطلق)[٣] واتا: ئەو (هو)، جا ئەگەر مشتقەکە لەوانەبوو کە وەکو فعل وان ئەوا جێناو هەڵناگرێت وەکو (هذا مفتاح) و (هذا مَرمی زید).

---

[١] اعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە: زیدٌ/ مبتدا مرفوع وعلامة رفعه الضمة. قائمٌ/ خبر مرفوع. غلاماه/ فاعل لـ(قائم)، مرفوع وعلامة رفعه الالف، لأنه مثنى وهو مضاف. ه/ ضمیر متصل مبنی في محل جر مضاف اليه. لێرەدا (قائم) خبرە و مشتقە بەڵام جێناو لە خۆ ناگرێت، چونکە ناوێکی ئاشکرای مرفوع کردووە کە (غلاماهُ)یە.

[٢] وەکو (زیدٌ اسدٌ) کە بە شجاع لێك دەدرێتەوە.

[٣] لێرەدا (منطلق) اسمی فاعلە و مشتقە بۆیە عملی فعلەکە (انطلق) دەکات و پێویستی بە فاعلە و فاعلەکەشی (هو)ەیە.

**١٢٢- وابرزنه مطلقا حيث تلا ما ليس معناهُ له مُحَصلا[١]**

**ئەگەر خبری مشتق هات بۆ مبتداکەی خۆی[٢] ئەوە واجبە جێناوەکە نادیار (( مستتر )) بێت وەکو (( زیدٌ قائم )) وتا (( هو )) جا ئەگەر ئەو جێناوەت ئاشکرا کردوو ووتت (( زیدٌ قائم هو )) ئەوە سیبویە دوو إعرابی تێدایە[٣] بە دروست دەزانێت : یەکەمیان : (( هو )) دەبێتە توکیدی جێناوە نادیارەکەی لە (( قائم )) دایە[٤]، دووەمیان : (( هو )) ببێتە فاعلی ((قائم))[٥] ئەمە بۆ حاڵەتێکە کە خبرەکە بۆ مبتداکە هاتبێت.**

**بەڵام ئەگەر خبرە متشتقەکە بۆ مبتداکە نەهاتبێت[٦]– ئەمەش بە مەبەستی ئەم دێڕە –[٧] لەم کاتەدا واجبە جێناوەکە ئاشکرا بکرێت بە ڕەهایی و ئەگەر دڵنیا بووین لە لێتێکنەچوون ، یان دڵنیا نەبووین[٨] جا نمونەی**

---

[١] کورتەی مانای ئەم ئەم دێڕە ئەلفیە : واجبە جێناوەکە – واتا جێناوی مرفوعی خبرە مشتقەکە – ئاشکرا بکەیت بە ڕەهایی ئەگەر خبرەکە هات ، بۆ غەیری مبتداکە ، واتا ئەگەر خبرەکە صفەتی مبتداکەی نەبوو بەڵکو صفەتی شتێکی تر بوو لە ڕستەکەدا وەك نمونە دێنینەوە.

[٢] واتا ئەگەر خبرە مشتەقەکە صفەتی مبتداکە بوو وە صفەتی ناوێکی تر نەبوو.

[٣] واتا / جێناوی ( هو ) ئەگەر ئاشکرا ( إبراز ) کرێت لە ڕستەکەدا ئەوە دوو إعرابی تێدا دروستە.

[٤] واتا / لەم کاتەدا فاعلی ( قائم ) ( هو )یەکی مستترەو ( هو ) ئاشکراش دەبێتە توکید بۆی.

[٥] واتا / لەم حاڵەتەدا ( قائم ) فاعل مستتری نیە.

[٦] بەڵکو بۆ ناوێکی تر هاتبێت لە ڕستەکەدا ، واتا لەم حاڵەتەدا ڕستەکە دوو ناوی تێدایە و خبرەکەش گونجاوە بۆ هەردووکیان بەڵام مەبەست ئەوەیە بۆ ناوی یەکەم نەهاتووە.

[٧] واتا / دێڕی ژمارە ( ١٢٢ ).

[٨] واتا / ئەو جێناوە ( هو ) دەگەڕێتەوە بۆ پێش خۆی جا ئەگەر لە پێش خۆی دوو ناوی نێر (مذکر ) هەبوون ئەوە لێتێکچوون ( التباس ) ڕوو دەدات ، بەڵام ئەگەر لە پێش ( هو ) ناوێکی مذکر هەبوو لەگەڵ ناوێکی مؤنث ئەوە لێتێکچوون ڕوو نادات ، وەکو نمونە دێنینەوە.

ئەوەی دڵنیـــــاین لە ڕوو نــــــەداین لێتێـــــك چـــــوون (( زیدٌ هندٌ ضـاربُها هـــــو ))[1] ، وە نمونەی ئەوەی دڵنیا نین لە لێتێکچوون ئەگەر جێناوەکـە نـەبێت (( زیـدٌ عمـروٌ ضـاربهُ هـو ))[2] و کەواتـە لـە هـەردوو حاڵەتەکەدا واجبە جێناوەکە ئاشکرا بکرێت لای بەصرێکان ، ئەمەیە مانای وتـەی دانـەر (( جێناوەکـە ئاشـکرا بکـە بـە ڕەهـایی)) واتـا : ئەگـەر دڵنیـا بووین لە لێتێکچوون یان دڵنیا نەبووین ، بەڵام لای کوفیەکان دەڵێن ئەگـەر دڵنیـا بـووین لـە لێتێـك نەچـوون ئـەوا هـەردوو حاڵەتەکـە[3] دروسـتە وەك نمونـەی یەکـەم کـە بریتیـی بـوو لـە (( زیـدٌ هنـدٌ ضـارِبها هـو)) جـا ئەگـەر ویستت (( هـو )) ئاشـکرا دەکـەیت و باسـی دەکـەیت ، وە ئەگـەر وویسـتت ((هو )) ناهێنیت و ئاشکرای ناکەیت ، بەڵام ئەگەر دڵنیـا نـەبووین لـە لێتێك

---

[1] مانای ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە : زید لە هندی داوە ، لێرەدا لێتێکچوون ڕوونادات چونکە فاعلی ( ضارب ) ( هو ) یە بۆ ( زید ) دەگەڕێتەوە نەوەك بۆ ( هند ).

[2] ئەم ڕستەیەش واتا : زید لە عمری داوە ،جا ئەگەر جێناوی ( هو ) نەبوایە ئەو کات نەمان دەزانی( زید)لە عمری داوە یان عمر لەزیدی داوە،بەڵام بەهۆی جێناوی(هو) دەزانین( زید )لە عمری داوە جا إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە:

زیدٌ : مبتدا اول مرفوع. عمروٌ : مبتدا ثانٍ مرفوع. ضاربُ : خبر ل ( عمرو ) مرفوع وهو مضاف. / ـه / ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف إلیه و الجملة الاسمیة ( عمرٌ ضاربه ) في محل رفع خبر مبتدا لأول. هو : ضمیر منفصل مبني في محل رفع فاعل لـ( ضارب ) لەم ڕستەیەدا ( ضاربُ ) خبری عمرۆو صفەتە بۆ ( زید ) واتا ( زیدٌ ) لێدەرەو ( عمرو ) لێدراوە ، ئەمەش بەهۆی جێناوی ( هو ) دەزانین. کەواتە لێرەدا صفەکە ( ضارب ) خبرە بۆ غەیری مبتداکە و ئەمەیە مانای ( جَری علی غیر مَنْ هُولَهُ ) واتا صفەکە بووە بە خبر بۆ غەیری مبتداکە.

[3] هەردوو حاڵەت واتا / ئاشکراکردنی جێناوی ( هو ) و ئاشکرا نەکردنی.

چوون ئەوە واجبە جێناوەکە ئاشکرا بکەین وەکو نمونەی دووەم[١] چونکە ئەگەر جێناوەکە نەهێنیت و بڵێیت (( زیدٌ عمرٌ ضاربە )) دەکرێت بکەر (فاعل)ی لێدانەکە ( زید ) بێت ، وە دەکرێت ( عمرو ) بێت ، جا کاتێك جێناوەکەت هێناو ووتت ((زیدٌ عمروٌ ضاربهُ هو)) لێرەدا بکەری لێدانەکە تایبەت دەبێت بۆ (( زیدٌ )).

جا دانەر لەم کتێبەدا[٢] ڕاو بۆچوونی بەصرێکانی هەڵبژاردووە و پەسەند کردووە ، بۆیە ووتی (( وابرزنهُ مطلقا )) واتا / ئەو جێناوە باس و ئاشکرا بکە بە ڕەهایی ترسی لێتێکچوون هەبوو یان نا ، بەلام لە غەیری ئەم کتێبەدا[٣] ڕاو بۆچوونی کوفێکانی هەڵبژاردووە، وە ئەوەی لە عەرەبدا بیستراوە و هاتووە بۆچوونی کوفیەکانە لەوانە ووتەی شاعیر کە دەڵێت :

ش٤٢ / قومي ذُرا المجد بانوها وقد علمتْ بكنه ذلك عدنان وقحطان[٤]

تەقدیری ڕستەکە : بانوهاهُمْ ، لێرەدا جێناوی ( هم ) حذف کراوە لەبەر ئەوەی دڵنیاین لە لێتێکنەچوون.

---

[١] نموونەی دووەم واتا ( زیدٌ عمروٌ ضاربه هو ).

[٢] لە کتێبی ئەلفیەدا.

[٣] لە کتێبی ( الكافية ) دا مەبەستە.

[٤] مانای ئەم دێڕە شیعرە : گەلەکەم گەشتونەتە چڵەپۆپەی بەرزی و گەورەی بنیاتیان ناوە بێگومان بەم ڕاستیە دەزانن هەموو عەرەبە عەدنانیەکان و عەرەبە تحطانیەکانیش بەڵگەی ئەم دێڕە : ( بانوها ) خبرە بۆ مبتدای دووەم کە ووشەی ( ذرا ) یە ، جا (بانوها ) خبرێکی مشتقە چونکە اسمی فاعلە ، وە ( بانوها ) بۆتە خبر بۆ غەیری مبتداکە ، جا بۆیە جێناوەکەی ئاشکرا نەکردووە و نەیوتووە ( بانوهاهُمْ ) چونکە (بانو) صفەتە بۆ قومەکە نەوەك بۆ ( ذرا المجد ) چونکە قومەکە بنیات نەری گەورەی و بەرزین نەوەك چەڵەپۆپەکە ( ذُرا ) ئەمەش ڕاوبۆچوونی کوفێکانە.

* باسى خبرى (( شبه جملە )).

١٢٣- واخبروا بظرف او بحرف جر   ناوين معنى (( كائنٍ )) أو ((استقر))[(١)]

پێشتر باسكرا كە خبر دەكرێت تاك (( مفرد )) بێت ، وە دەكرێت ڕستە ((جملە )) بێت ، جا دانەر لەم دێڕەدا باسى ئەوە دەكات كە خبر دەكرێت ئاوەڵفرمان (( ظرف )) جار و مجرور بێت[(٢)] ، وەكو (( زيدٌ عندك )) و (( زيدٌ في الدار )) جا هەريەكە لە ظرف و مجرور پەيوەست (( متعلق ))ن بە حذف كراوێكى واجب[(٣)] كۆمەڵێك لە زانايان - لەوانە دانەر - پێيان دروستە ئەوە حذف كراوە[(٤)] دەكرێت ناو (( اسم )) بێت يان كردار (( فعل )) بێت

---

(١) كورتەى ماناى ئەم دێڕە ئەلفيە : خبريان داوەتەوە لە مبتدا بە ظرف و جارومجرور و لە كاتێكدا تقديريان كردووە ماناى ناوى ( كائن ) يان ڕستەى ( استقر ) واتا : دەكرێت ئەو ظروف و جارومجرورە متعلق بن بەيەك ناوى مفردەوە كە ( كائن ) يان (مستقر) يان ( موجودٌ ) يان ( حاصلٌ )ە ، وە دەكرێت متعلق بن بە جملەيەكى فعليەوە كە ( استقَر ) يان ( يستقرّ ) يان ( كان ) يان ( يكونُ ) بێت.

(٢) وەكو پێشتر ووتمان ( خبر ) سىٚ جۆرە ( أ ) مفرد ( ب ) جملە ( ج ) شبە جملە جا شبە جملە واتە ظرف و جار و مجرور.

(٣) زانايان دەربارەى لێكدانەوەى خبرى ( ظرف و جار و مجرور ) سىٚ بۆ چوونيان هەيە : ( أ ) هەندێكيان دەڵێن ظرف و جار و مجرورەكە بۆ خۆيان خبرن و پێويستيان بەوە نيە بڵێين ( متعلق )ن بە حذف كراوێكەوە

( ب ) هەندێكيشيان دەڵێن ظرف و جارومجرور بۆ خۆيان خبر نين بەڵكو پەيوەست ( متعلق )ن بە حذف كراوێك ئەو حذف كراوە دەبێتە خبر. ( ج ) هەندێكى تريان پێيان وايە ظرف و جارومجرور لەگەڵ حذف

كراوەكەدا هەر دووكيان پێكەوە دەبنە خبر ، جا ڕاى بەهێزيش بريتيە لە ڕاى دووەم وەكو ابن مالك ئاماژەى پێكردووە.

(٤) ئەمە لەسەر ڕاى دووەم. وەكو باسمان كرد.

وەکو (( کـائِنٌ )) یـان (( اسْتَقَرَّ )) جا ئەگـەر بلّێـی ظـرف و جـارومجرور کە متعلقە بـە (( کـائن ))ەوە ئەوە دەبێتە جۆری خبری مفـرد ، وە ئەگەر بلّێین متعلقە بە (( استقرَّ ))ەوە ئەوە دەبێتە جۆری خبری جملە.[1]

جا زانایانی نحو خیلافیان هەیە دەربارەی ئەمە[2] ، ئەخفەش پێی وایە کە ئەم جۆرە بەشێکە لـە خبری مفـرد ، وە هەریەك لـە ظـرف و جار و مجـرور متعلق بە حذف کراوێك ، ئەو حذف کراوەش اسمی فاعلە وە تقدیرەکەشی دەبێتـە (( زیـدٌ کـائنٌ عنـدك ، یـان ، مُستقِر عنـدك ، یـان ، في الـدار )) ئـەم ڕایەش دراوەتە پالْ شێخی سیبویە.

هەروەها وترِاوە[3] کە ظرف و جارو مجرور بەشێکن لە خبری جملە وە هەریەکەیان متعلقە بە حذف کراوێك کە بریتیە لە فعل ، تقدیرەکەش دەبێتە (( زیدٌ اُستَقَرَّ ، یان یستقرُّ– عندك ، یان في الدار )) ئەم ڕایەش پاڵدراوە بۆ لای زۆرینـەی (( جمهـور ))ی بەصـرێکان هـەروەها بـۆ لای سـیبویەیش[4] ، هەروەها وتراوە[5] : دروستە ئەم جۆرە خبرە دانرێت لە جۆری مفرد و ئەو کاتە حذف کراوەکە (( مستقر )) و هاوێنەکانی بێت[6] ، وە دروستە دانرێت

---

[1] واتا / ئەگەر حذف کراوەکە تقدیر کرێت بە ناوێکی مفرد ئەوە دەبێتە خبری مفرد ، وە ئەگەر تقدیری کرێت بە جملە ئەوە دەبێتە خبری جملە.

[2] واتا دەربارەی ئەوەی کاتێك لە دوای مبتداکەوە ظرف یان جارومجرور بێت.

[3] ئەمە بۆ چوونی دووەمە.

[4] واتا / بۆ چوونی دووەم و بۆ چوونی یەکەمیش هەردووکیان ڕاکەی خۆیان پاڵداوە بۆ لای شێخی سیبویە.

[5] ئەمەش دەبێتە ڕای سێهەم دەربارەی خبر کاتێك ظرف و جارومجرور بێت.

[6] مەبەست لە هاوشێوەکانی ( مستقر ) بریتیە لە ( کائن ) و ( موجود ) و ( حاصل ) کە وەرگیراون لە فعلەکانی ( استقرَّ وکان وجِد وحصل ) کە پێیان دەوترێت ( الافعال العامة ) واتە مانای ئەم فعلانە گشتین و تایبەت نین بۆیە حذف کراون.

لە جۆری خبری جملە ئەو کات حذف کراوەکە کە دەبێتە (( یستقر )) و هاوماناکانی[١] ئەمەش ڕاوبۆچوونی دانەرە کە فەرمووی (( ناوین معنی کائن أو استقر ))[٢].

هەروەها شێخی (( ابوبکر بن السراج ))[٣] پێی وایە کە ظرف و جارومجرور بەشێکی سەربەخۆن و نەلەجۆری مفردن وە نە لەجۆری جملەن و ئەم بۆ چوونەی ((ابن السراج )) فقێکەی (( ابو علی الفارسی ))[٤] لێی گێڕاوەتەوە لە کتێبی ((الشیرازیات)) دا[٥]

جا قسەو ڕای ڕاست پێچەوانەی ئەم بۆ چوونەیە[٦] وە ظرف جارومجرور متعلقن بە حذف کراوێك کە (( واجب الحذف ))ە[٧] ، وە هەندێ جاریش ئەو حذف کراوە بە شاذی باسکراوە ، وەکو ووتەی شاعیر :

---

[١] کە بریتی بوون لە چوار فعلەکە { استقرَّ وکان وحصل و وجد }.

[٢] واتا ابن مالك پێی دروستە حذف کراو مفرد بێت وەکو ( کائن ) یان جملە بێت وەکو ( استقَّر ) کە پێکهاتووە لە فعل و فاعلێکی مستتر.

[٣] ناوی تەواوی : (( محمد بن السری ))ە وە ناسراوە بە ابوبکر ابن السراج یەکێکە لە کەڵە پیاوانی زانستەکانی ئەدەب و زمانی عەرەبی و خاوەنی کتێبی ( الاصول في النحو )ە ساڵی ٣١٦ کۆچی وەفاتی کردووە. خوای گەورە دەرەجەیان عالی بکات.

[٤] ناوی تەواوی : (( الحسن بن أحمد بن عبدالغفار ))و ناسراوە بە (( ابو علی الفارسی )) ساڵی ٢٨٨ك لە وولاتی فارس لە دایك بووە ، وە یەکێکە لە فەقێ زیرەکەکانی ( ابن السراج ) ، دواتر چۆتە شاری بەغداو بووە بە یەکێك لە گەورە زانایانی زانستەکانی زمانی عەرەبی ، ساڵی ٣٧٧ ك لە بغداد کۆچی دوای کردوە. خوای گەورە لێیان خۆشبێت.

[٥] ابو علی الفارسی چەند کتێبێکی نوسیەوە و ناوی ناوە بەناوی ئەو شارانەی لێی بووە لەوانە کتێبی ( المسائل الشیرازیات ) کە لە شاری شیراز نوسیوێتی ، هەروەها کتێبەکانی {الحلبیات و البغدادیات و البصریات و والدمشقیات و العسکریات } ی داناوە.

[٦] واتا پێچەوانەی بۆچوونەکەی (ابن السراج)کە پێی وایە ظرف و جارومجرور بۆ خۆیان دەبنە خبر.

[٧] ( واجب الحذف ) مەبەست پێی ئەوەیە کە دروست نیە ئاشکرا بکرێت بە هیچ شێوەیەك مەگەر بە شاذی ، بەلاّم ( جائز الحذف ) ئەوەیە کە دەتوانی ئاشکرای بکەیت و دەتوانین حذفی بکەیت.

ش٤٣ / لَكَ العِزُّ إنْ مولاك عَزَّ وإنْ يَهُنْ فأنْتَ لدى بحبوحة الهون كائن[1]

جا هەروەکو چۆن واجبە عاملی ظرف و جارومجرور حذف کرێت – ئەگەر خبر بن – ئەوە بەهەمان شێوە واجبە حذف کرێت– ئەگەر (( صفەش )) بن وەکو (( مررْت بر جلٍ عندك ، أو في الدار ))[2] ، هەروەها ئەگەر (( حال )) یش بن وەکو (( مررْت بزيدٍ عندك ، أو في الدار ))[3] ، هەروەها ئەگەر ((صلە)) ش بن وەکو (( جاء الذي عندك ، أو في الدار ))[4]، بەلاّم واجبە لە کاتێکدا دەبنە ( صلە ) حذف کراوەکەیان فعل بێت ، تقدیرەکەشی دەبێتە (( جاء الذي استقرَّ عندك ، أو في الدار )) بەلاّم کاتێك صفەو حال بن ئەوە حوکمیان وەکو حوکمی خبر وایە کە پێشتر باسکرا. [5]

* * *

[1] مانای ئەم دێرە شیعرە بە کوردی : تۆ سەربەرزی مادام گەورە و نزیکی تۆ سەر بەرز بێت ، بەلاّم ئەگەر ئەو بێ رێزو سووك بێت ئەوە تۆش لەناو جەرگەی سەر شۆڕیدا دەبیت.
بەڵگەی ئەم دێرە / ووشەی ( كائن ) باسکراوە کە ظرفی ( لدى ) متعلقە پێوەی و بووە بە خبری ( انت ) ، ئەم باسکردنەش بۆ عاملی ( ظرف ) شاذەو پێچەوانەی یاسایە.

[2] لێرەدا ( عند ) ظرفەو ( في الدر ) جارومجرورەو هەردووکیان دەبنە صفە بۆ رجل ، چونکە ( رجل ) ناوێکی نەناسراوە و ( نكرە ) یە.

[3] لەم ڕستەیەدا ( عندَ وفي الدار ) دەبنە ( حال ) بۆ زید چونکە ( زيد ) ناوێکی ناسراو ( معرفە ) یە.

[4] پێشتر باسمان کرد کە ( صلە ) دەکرێت جملە بێت یان شبە جملە بێت لە دێری ژمارە ( ٩٣ ) ی ئەلفیەدا.

[5] واتا دەکرێت ( متعلق ) بن بەناوێکی مفرد ( كائن ) وە دەکرێت ( متعلق ) بن بە جملە کە ( استقرَّ ).

١٢٤- ولا يكونُ اسمُ زمانٍ خبراً عن جُثَّةٍ ، وإنْ يُفِدْ فأخبرا[١]

ئاوەڵفرمانی شوێن (( ظرف مكان )) دەبێتە خبر بۆ لاشە (( الجثة ))[٢] وەکو (( زيدٌ عندك )) هەروەها دەبێتە خبر بۆ مانا (( المعنى ))[٣] وەکو (( القتالُ عندك )) بەڵام ئاوەڵفرمانی کاتی (( ظرف الزمان )) دەبێتە خبر بۆ مانا جا ظرفەکە منصوب بێت یان مجرور بێت بە حرفی جری (( في )) وەکو : ((القتالُ يومَ الجمعة ، أو في يوم الجمعة ))[٤] ، بەڵام ظرفی زمان نابێتە خبر بۆ لاشە (( الجثة )) دانەر فەرموویەتی : ئەگەر مانا نەدات ئەوە دروست نیە وەکو (( زيدٌ اليومَ ))[٥] ، ئەمەش بۆ چوونی کۆمەڵێك زانایە لەوانە دانەر ، بەڵام جگە لەمان پێیان وایە بە هیچ شێوەیەك دروست نیە ظرفی زمان ببێتە خبر بۆ لاشە ، جا ئەگەر شتێکی وا هاتبێت[٦] ئەوە دەبێت تأویل

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیەیە : دروست نیە ناوێك کە بۆ زمان و کاتە ببێتە خبر بۆ شتێك کە لاشە ( الجثة )یە – واتا / شتێکی قەبارەدارو هەست پێکراو ، بەڵام ئەگەر مانای هەبوو ئەوە دروستە خبری پێبدرێت، واتە : ئەگەر مانای دەدا ئەو ظرفی زمانە ئەوە دروستە بکرێتە خبر.

[٢] مەبەست لە ( الجثة ) واتە شتێك کە بەر هەست ( ملموس ) بێت و قەبارەی دیاری کراو بێت ( الجسم ) ، وەکو : محمد وزيد و خۆر و مانگ و گوڵ و ....هتد.

[٣] مەبەست لە مانا شتێکی نادیارو معنویەو بەرهەست نیە و قەبارەی دیاریکراوی نیە وەکو : القتال ، العلم ، المال ، ...

[٤] ئەم ڕستەیە إعرابی بەم شێوەیەیە : القتال : مبتدا مرفوع. يومَ / ظرف زمان منصوب على الظرفية متعلق بمحذوف خبر ، وهو مضاف. الجمعة : مضاف إليه مجرور. هەروەها (( في يوم الجمعة )).

[٥] لەم ڕستەیەدا ( اليوم ) بوە بە خبری ( زيد ) زیدیش ناوی لاشەیە بۆیە دروست نیەو ماناشی نیە.

[٦] واتا / ئەگەر ڕستەیەك هاتبێت لە زمانی عەرەبیداو خبرەکەی ظرفی زمان بێت بۆ ناوێکی لاشە ئەوە دەبێت تأویل کرێت.

کرێت[١] ، وەکو قسەیان[٢] : اللیلـةَ الهـلالُ ، والرطـبُ شـهريْ ربيـع ، تقدیرەکەیان دەبێتە : طلوعُ الهلالِ الليلة[٣] ، ووجودُ الرطبِ شهريْ ربيع[٤]، ئەمەش ڕاو و بۆچوونی زۆرینەی بەصریێکانە ، بەڵام کۆمەڵێك لە زانایان– لەوانە دانەر– پێیان دروستە ظرفی زمان ببێتە خبر بۆ لاشە بەبێ هیچ شاذییەك بە مەرجێك مانای هەبێت[٥] ، وەکو ( نحن في يومٍ طيب ، وفي شهرِ

---

[١] تاویل : واتا / لادانی مانای ئەو ناوە بۆ شتێکی تر ( صرف اللفظ عن معناه الظاهر إلى معنى آخر ).

[٢] واتا / قسەی عەرەب.

[٣] واتا / ڕستەی الليله الهلال : لەسەر قسەی هەندێ لە زانایان – لەوانە دانەر – دەڵێن ڕستەیەکی تەواوە و مانای هەیە والليله : دەبێتە ( ظرف زمان منصوب على الظرفية الزمانية وهوشبه جملة متعلق بمحذوف خبر مقدم ) والهلال : دەبێتە ( مبتدأ مؤخر مرفوع) بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێ ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە تەواو نیەو ئەصلەکەی بریتیە لە ( طلوع الهلال الیلة ) لێرەدا ( الیله ) کە ظرفی زمانە دەبێتە خبر بۆ (طلوع) کە لاشە نیە و نابێتە خبر بۆ ( الهلال ) چونکە ( هلال ) لاشەیەو مانا نیە.

[٤] لەم ڕستەیەشدا ( شهري ) کە ظرفی زمانە بۆتە خبر بۆ ( وجود الرطب ) نەوەك بوبێتە خبر بۆ ( الرطب ) چونکە رطب قەبارەی هەیەو بەر هەستە واتا ( جثة ) یە دروست نیە خەبەرەکەی ظرفی زمان بێت.

[٥] زاناکان دەڵێن لە سێ حاڵەتدا دروستە ظرفی زمان ببێتە خبر بۆ لاشە ( الجثة ) ئەوانیش بریتین لە :

أ – ئەگەر ظرفە زمانەکە وصف کراو بێت یان إضافە کراو بێت وەکو : نحنُ في يومٍ طيبٍ ، ونحنُ في زمنٍ خيرٍ وبركة.

ب– ئەگەر مبتداکە ( مضاف اليه ) بێت بۆ مضافێکی حذف کراو ، وەکو : الليلة الهلال ، الرطب شهري ربيع.

ج– ئەگەر ئەو ناوی لاشە ( جثة )یە لە ناوی مانا ( اسم المعنى ) بچێت لەو ڕووەوە کاتێك هەبێت و کاتێکی تر نەبێت یان وەرزێك هەبێت و وەرزێکی تر نەبێت وەکو : الوردُ ( مبتدأ ) صيفاً (خبر ) ، القطنُ ( مبتدأ ) سبتمبر ( خبر ).

كذا )[1] بۆ ئەمەش ئاماژەی كرد دانەر بە ووتەی ( ئەگەر مانای هەبوو ئەوە دەكرێتە خبر ) كەواتە ئەگەر مانای نەبوو ئەوە دروست نیە وەكو ( زیدٌ یومَ الجمعة )[2]

* * *

* مبتدا پێویستە ناسراو ( معرفة ) بێت بەلأم لە هەندێ حاڵەتدا دروستە نەناسراو ( نكره ) بێت :

١٢٥- ولا یجوز الابتـــدا بالنـــكرة مالمْ تُفِدْ : كعندَ زیدٍ نمرةٌ

١٢٦- وهل فتی فیكم ؟ فماخلٌ لـــنا ورجلٌ من الكرام عنـــدنا

١٢٧- ورغبةٌ في الخیر خیرٌ ، وعمـــل برٍ یزینُ ، ولیقس مالم یُقَلْ.[3]

ئەصل و بنچینە لە ( مبتدا ) دا ئەوەیە كە ناسراو ( معرفة ) بێت ، وە هەندێ جار دەكرێت نەناسراو ( نكرة ) بێت ، بەلأم بە مەرجێك كە مانا

---

[1] لەم دوو ڕستەیەدا خبرەكە ظرفی زمانە بۆ شتێك كە لاشەیە ، بەلأم بەر حاڵەتی یەكەمی سێ حاڵەتەكە دەكەوێت كە باسمان كرد.

[2] لێرەدا ( زیدٌ ) مبتدایە و ناوی لاشەیە ، (یوم الجمعة) ظرفی زمانەو دروست نیە ببێتە خبر.

[3] مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیەیە : (١٢٥) دروست نیە مبتدا ناوی نەناسراو بێت و مەگەر مانا بگەیەنێت : وەكو ئەم حاڵەتانەی باسی دەكەم (١) وەكو (عند زیدٍ نمره ) واتا لای زیدە پۆشاكاكە. واتا – مبتدا دوا دەكەوێت و خبرەكە ظرف و جارو مجرور بێت و پێش كەوێت.

١٢٦- هەروەها حاڵەتی دووەمی وەكو ( هل فتیً فیكم ؟ ) واتا ئایا گەنجێكتان تێدایە؟ هەروەها حاڵەتی سێ یەم وەكو ( ما خلٌ لنا ) واتا : دۆستمان نیە ، هەروەها حاڵەتی چوارەم وەكو ( رجلٌ من الكرام عندنا ) واتا پیاوێكی بەڕێز لای ئێمە.

١٢٧-هەروەها حاڵەتی پێنجەم وەكو ( رغبةٌ في الخیر خیرٌ ) واتا : حەز بوون لە چاكە چاكەیە ، هەروەها حاڵەتی شەشەم وەكو ( عملٌ برٍ یزین ) واتا : كرداری چاك خاوەنەكەی جوان دەكات . جا ابن عقیل باسی ئەم نموونانەی ابن مالك دەكات.

بگەیەنێت ، جا مانا گەیاندنیش پەیدا دەبێت بەیەكێك لەو شتانەی كە دانەر باسی شەشی كرد :

یەكەم : ئەگەر خبر پێشی كەوێت ، لە كاتێكدا ئەو خبرە ظرف یان جارو مجرور بێت وەكو ( فِي الدرِ رَجُلٌ )[١] وە وەكو ( عِند زيدٍ نمرة )[٢] ، جا ئەگەر خبر پێشكەوێت و بەلاّم ظرف و جار و مجرور نەبێت ئەوە دروست نیە وەكو ( قائمٌ رجلٌ )[٣].

دووەم : ئەگەر ئەو ناوە نەناسراوە[٤] لە پێشیەوە پرسیاركردن ( استفهام ) هاتبێت ، وەكو ( هَلْ فتىً فيكم )[٥].

سیٰ یەم : ئەگەر لە پێش ناوەنەناسراوەكە ( نفي ) هاتبێت وەكو ( ما خلٌ لنا )[٦]

چوارەم : ئەگەر ناوە نەناسراوەكەی كە بۆتە مبتدا وەصف كراو بێت وەكو ( رجلٌ من الكرام عندنا )[٧].

---

[١] لەم ڕستەیەدا ( رجلٌ ) مبتدایە نەناسراوە بۆیە دروستە چونكە خبرەكەی جارو مجرورەو پێشكەوتوە كە ( فی الدار ).

[٢] لێرەشدا ( نمرةٌ ) مبتدای مۆخرەو نەناسراوە ، چونكە خبرەكەی ( عند)یەو ظرفە.

[٣] لێرەدا ئەم ڕستەیە دروست نیە چونكە ( قائم ) خبرە و پێشكەوتووە نە ظرفە و نە جارو مجرورە.

[٤] واتا : ئەو ناوە نەناسراوە كە دەبێتە مبتدا دەبێت لە دوای پرسیار كردنەوە هاتبێت.

[٥] لەم ڕستەیەدا ، ووشەی ( فتى ) نكرەیەو بووە بە مبتدا لەبەر ئەوەی حرفی استفهام ( هل ) لە پێشیەوە هاتووە.

[٦] لەم ڕستەیەدا ، ( خِلٌّ ) نەناسراوە و بووە بە مبتدا چونكە لە دوای نفی ( ما ) وە هاتووە.

[٧] لێرەشدا ( رَجُلٌ ) نكرەیە بووە بە مبتدا چونكە وەصف كراوە بە ( من الكرام) جا زانایان دەڵێن مەبەستی ابن مالك لە ڕستەی ( رجلٌ من الكرام عندنا ) ئیمامی نەوەویە كە یەكێك بووە لە فەقیٰ زیرەك و چاكەكانی ابن مالك – ڕەحمەتی خوایان لێبێت–

پێنجەم : ئەگەر ناوە نەناسراوە مبتداکە عامل بێت وەکو ( رغبةٌ في الخير خيرٌ)[١]

شەشەم : ئەگەر إضافە کراو بێت وەکو ( عملُ برٍّ يزين )[٢]

ئەم شەش حاڵەتە ئەوە بوو کە دانەر لەم کتێبەدا[٣] باسی کردووە ، بەڵام غەیری دانەر[٤] ئەم حاڵەتەیان گەیاندۆتە نزیکە (٣٠) حاڵەت ( یان زیاتر لە سی حاڵەت ) ئەم شەش حاڵەتە باسکرا لەگەڵ :

حەوتەم : ئەگەر ناوە نەناسراوەکەی بۆتە مبتدا (شرط)[٥] بێت وەکو ( مَنْ يقم اقُمْ )[٦].

---

[١] لەم ڕستەیەدا ( رغبةٌ ) ناوێکی نەناسراوە و بووە بە مبتدا چونکە مصدەرەو عملی فعل دەکات ، واتا وەکو ( رَغِبَ ) کە فعلەکەیەتی پێویستی بە فاعل هەیە کە لێرەدا مستترە هەروەها پێویستی بە (مفعول بە ) هەیە کە مفعول بە فعلی رغب بە زۆری وایە جارو مجرورە ، لێرەشدا ( في الخير ) جارو مجرورەومفعول بە غیر صریحە بۆ رغبةٌ.

[٢] لەم ڕستەیەشدا ( عمل ) نکرەیە و إضافە کراوە بۆ لای ( برّ ) بۆیە دروستە ابتدای پێبکرێت.

[٣] واتا / لە کتێبی ئەلفیەدا.

[٤] ئیمامی سیواطي لە کتێبی ( همع الهوامع ) دا باسی بیست و پێنج خاڵی کردووە ، هەروەها شێخ ئەشمونی لە شەرحەکەیدا باسی (٢٥) حاڵەتی کردووە.

[٥] ( شرط ) کە کوردیەکەی دەبێتە مەرج یەکێکە لە شێوازەکانی قسەکردن ، جا لە زمانی عەرەبیدا ئەدەواتی شرط دوو جۆرن (أ) جۆرێکیان عمل ناکات تەنها بۆ شرطە (أدوات شرط غير جازمة ) ئەوانیش حەوتن ئەمانەن { إذا ، لو ، لولا ، لوما ، امّا ، كلّما، كيف }.(ب) جۆری دووەم عەمەل دەکەن لە دوای خۆیان کە دوو فعلی مضارع مجزوم دەکەن ( ادوات شرط جازمة لفعلين مضارعين ) ئەمانیش دوانزەن { إنْ و إذْما} ئەم دوانە حەرفن {مَنْ ، وما ، ومهما ، متى ، ايّان ، اينَ ، انّى ، حيثما ، ايُّ ، كيفما } ئەم دەیەش هەموویان اسمن و هەموویان مبنين جگە لە ( ايُّ ) کە معربە.

[٦] لەم ڕستەیەدا ( مَنْ ) دەبێتە : اسم شرط مبني في محل رفع مبتدا ، ( يقم ) فعل مضارع مجزوم ب ( مَنْ ) وعلامە جزمه السكون وفاعله ضمير مستتر تقديره ( هو ) وجمله الشرط ( يقم ) في محل رفع خبر ، و ( اقم ) فعل و فاعل وهو جواب الشرط.

هەشتەم : ئەگەر وەڵام بێت ، وەكو ئەوەی پێت بووترێت : مَنْ عندك ؟ تۆش لە وەڵامدا بڵێی : ( رجلٌ ) تقدیرەكەی دەبێتە ( رجلٌ عندي )[١]

نۆیەم : ئەگەر گشتی ( عام ) بێت وەكو : ( كُلٌّ يَموتُ )[٢]

دەیەم : ئەگەر مەبەست پێی جۆرێتی ( التنويع ) بێت وەكو ووتەی شاعیر :

ش٤٤/ فأقبلْتُ زحفاً على الركبتين فَثَوْبٌ لبستُ ، وثوابٌ أجرُّ[٣]

لێرەدا ووشەی ( ثوبٌ ) مبتدایە ( لبسْتُ ) فعل و فاعلە دەبێتە خەبری ، هەروەها ( ثوبٌ أجُرّ ) بەهەمان شێوەیە.

یانزەهەم:ئەگەر نزا ( دعاء ) بێت وەكو ﴿ سلامٌ على إلِ ياسين ﴾[٤]

دوانزەهەم : ئەگەر مانای سەرسوڕمان ( التعجب ) لە خۆ گرێت وەكو ( ما أحْسَنَ زيداً )[٥]

---

[١] واتا / رجلٌ : نكرەیەو بۆیە دروستە مبتدا بێت چونكە وەڵامی پرسیارە.

[٢] لەم ڕستەیەدا ( كلّ ) مبتدایە و نكرەیە لەبەر ئەوەی گشتیە و هەمووان دەگرێتەوە، و ( يَمُوتُ ) جملەیەكی فعلیەو دەبێتە خبری ( كُلٌّ ).

[٣] – مانای ئەم دێرە شیعرە بە كورتی : خێرا هاتم بە ڕێ كردن لەسەر ئەژنۆكانم ، پۆشاكێكم پۆشی و پۆشاكێكی ترم ڕادەكێشا.

بەڵگەی ئەم دێرە : دووجار ووشەی ( ثوبٌ) بەكار هاتووە بە نەناسراوی (نكرة) چونكە مەبەست پێی جۆرێتی ( التنويع )ە ، واتا دوو جۆر پۆشاكی پۆشی بوو.

[٤] ئایەتی ژمارە (١٣٠)ی سورە ( الصافات ) كورتەی ماناكەی {سڵاو لەسەر پێغەمبەر ئیلیاس– عليه والصلاه والسلام– بێت } ووشەی ( إل ياسين ) لەگەڵ ( إلياس ) یەك شتن ، إعرابی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیەیە : سلامٌ : مبتدا مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة ، وجاز الابتداء به مع إنه نكرة لأنه تضمن معنى الدعاء. على إل ياسين : جارومجرور متعلق بمحذوف خبر.

[٥] لێرەدا ( ما ) بەم شێوەیە إعراب دەكرێت : نكرة تامة مبني على السكون في محل رفع مبتدا والتقدير – شئٌ عظيم احسن زيداً – ، وە ڕستەی ( احسن زيداً ) كە پێكهاتووە لە ( فعل و فاعل و مفعول ) في محل رفع خبر ، دواتر لە بابەتی (التعجب ) بە تفصيل باس دەكرێت – إن شاء الله.

سیازدەهەم : ئەگەر لە جێی ناوێکی وەصف کراو دانیشتبێت وەکو ( مؤمنٌ خیرٌ من کافرٍ )[١]

چواردەهەم: ئەگەر بچوکراو بێت(مصغر )[٢] وەکو ( رُجَیْلٌ عندنا ) چونکە بچووك کردنەوەی ناو مانای وەصف کردنی تێدایە وەتقدیری جملەکەش دەبێتە ( رجُلٌ حقیرٌ عندنا )[٣]

پانزەهەم : ئەگەر مانای کورتکردنەوەی شتێك لەسەر شتێك ( الحصر ) لە خۆ گرێت وەکو (شَرٌّ اهَرَّ ذا نابٍ)[٤] ، وشیٌ جاء بك ) تقدیری ئەم دوو ڕستەیە ( ما اهرَّ ذا نابٍ إلاّشرٌ ، وما جاء بك إلاّ شئٌ ) لەسەر یەکێك لە دوو قسەی زانایان[٥] ، وە لەسەر قسەی دووەم تقدیرەکە دەبێتە ( شرٌّ عظیمٌ اهرَّ

---

[١] لەم ڕستەیەدا ووشەی ( مؤمنٌ ) نەناسراوە و بووە بە مبتدا چونکە صفەتە بۆ موصوفێکی حذف کراو و تقدیرەکەشی دەبێتە ( عبدٌ مؤمنٌ ).

[٢] پێشتر باسی ( تصغیر )مان کرد ، کە ووتمان ئەوەیە ناوێك بچووك کرێت بەوەی بکرێتە سەر وزنی ( فُعَیْلٌ ).

[٣] لە زمانی عەرەبیدا تصغیر بۆ چەن مەبەستێك دەکرێت یەکێك لەوانە سوو کردنی کەس و شتەکەیە ( التحقیر ). وەکو ئەم نمونەیەی ئێرە ، دواتر لە بابەتەکانی کۆتاییدا باسی ( تصغیر ) و مەبەستەکانی بە تفصیل دەکرێت – إن شاء الله

[٤] ئەمە یەکێکە لە پەندەکانی زمانی عەرەب و ماناکەی ( تەنها شەڕو خراپەیەك سەگەکەی هێناوەتە حەپەو وەڕین ) ئەم پەندە دەهێنرێتەوە ، کاتێك هەست بە دەرکەوتنی نیشانەی شەڕو خراپە بکرێت ( یضربُ فی ظهور أمارات الشر ومخایله ).لەم ڕستەیەدا ووشەی ( شرٌّ ) نکرەیەو بووە بە مبتدا چونکە مانای کورت هەڵهاتن (الحصر) لە خۆ دەگرێت واتا : تەنها شەڕو خراپەیەك ) هەروەها ڕستەی ( شئٌ جاء بك )ش بەهەمان شێوە.

[٥] – دیارە زانایان دوو بۆچوونیان هەیە دەربارەی ڕاڤەکردنی ئەم دوو ڕستەیە : هەندێکیان دەڵێن ماناو تەقدیرەکەی بەم شێوەیە ( ما اهرَّ ذا نابٍ إلاّ شرٌّ ) وە ڕستەکەی دیکەش ( ما جاء بك إلاّشئٌ ) لەسەر ئەم ڕاڤەیە دەبێتە ( حصر ) کراو (محصور ).–

ذانابٍ ، وشئٌ عظيم جاء بِكَ ) جا لەسەر ئەم قسەیەیان ئەم نموونەیە[1] دەچێتە ناو ئەو جۆرەی کە دروست بوو مبتدا نکرە بێت مادام وەصف کراو بێت[2] چونکە وەصف لەوە گشتی ترە کە ئاشکرا یان نا ئاشکرا (مقدر ) بێت ، جا وەصفەکە لێرەدا نادیار ( مقدر )ە[3]

شازدەهەم : ئەگەر لە دوای واوی حالیەوە[4] بێت ، وەکو ووتەی شاعیر :

ش٤٥/ سَرَيْنا ونجمٌ قد أضاء ، فمُذْ بدا مُحيَّاكَ أَخْفَى ضوؤهُ كُلَّ شارق[5]

حەڤدە : ئەگەر عطف کراو بێت بۆ سەری ناوێکی ناسراو ( معرفة ) وەکو (زيدٌ ورجلٌ قائمانِ)[6]

---

-هەندێکیشیان دەڵێن : ماناو تقديرەکەی بەم شێوەیەیە : ( شرٌ عظيم اهرٌ ذا نابٍ ) وە ڕستەی دیکەش ( شئٌ عظيمٌ جاء بك ) لەسەر ئەم ڕاڤەیەش دەبێتە جۆری وەصف کراو ( موصوف ).

[1] واتا نمونەی ( شَرٌّ اهرٌ ذا نابٍ ) و ( شئٌ جاء بك ).

[2] واتا لەسەر ئەم قسەیە دەبێتەوە بە جۆری چوارەم.

[3] واتا / وەصفی ( عظيمٌ ) کە حذف کراوە لە هەردوو ڕستەی ( شيٌ اهرٌ ذانابٍ ) و (شئٌ جاء بك ).

[4] واوی حاڵ ئەوەیە کە لە دوایەوە جملە دێت ، بەوەش دەناسرێتەوە ئەگەر ( إذ الظرفية ) لە جێی دانرێت تەواو و دروست دەبێت ، دواتر لە بابەتی ( الحال ) بە تفصيل باسی دەکەین إن شاء الله.

[5] مانای ئەم دێڕە بەم شێوەیەیە : شەو ڕەویمان کرد لە کاتێکدا ئەستێرەیەك ڕووناکی دەدا ، جا لەو کاتەدا ڕووخساری تۆ دەرکەوت پرشنگی ڕوخسارت هەموو ڕووناکیەکانی شاردەوە. بەڵگەی ئەم دێڕە شیعرە : ووشەی ( نجمٌ ) نکرەیە و بووە بە مبتدا لەبەر ئەوەی لە دوای واوی حالیەوە هاتووە.

[6] لەم ڕستەیەدا ( رجلٌ ) مبتدایەو ناوێکی نەناسراوە بەڵام عطف کراوەتە سەری ناوێکی ناسراو کە ( زيدٌ )ە.

هەژدە : ئەگەر عطف کراو ( معطوف ) بێت بۆ سەر وەصف کراو (موصوف) ێك وەکو ( تميميٌ ورجلٌ في الدار )[1]

نۆزدە : ئەگەر عطف کرابێتەوە بۆ سەری ناوێکی وەصف کراو ( موصوف ) وەکو ( رجلٌ وامرأةٌ طويلةٌ في الدار )[2]

بیست : ئەگەر ناوێکی نادیار ( مبهم ) بێت ، وەکو ووتەی ئیمرؤلقەیس :

ش٤٦ / مُرَسَّعَةٌ بَيْنَ ارْساغهِ    به عَسَمٌ يبتغي ارْنبا[3]

بیست و یەك : ئەگەر بکەوێتە دوای ووشەی ( لولا )[4] وەکو ووتەی شاعیر:

ش٤٧ / لولا اصطبارٌ لأوْدى كلُّ ذي مقةٍ    لَمَّا استقلّتْ مطاياهُنَّ للظّعن[5]

---

[1] لەم ڕستەیەشدا ( رجلٌ ) مبتدایەو ناوێکی نەناسراوە بەڵام عطف کراوەتە سەر وەصف کراوێك کە ( تميميٌ )ە.

[2] لێرەشدا ( رجلٌ ) مبتدایەو ناوێکی نەناسراوە ، بەڵام عطف کراوەتەوە بۆ سەر ناوێکی وەصف کراو کە بریتیە لە ( امرأةٌ طويلةٌ ).

[3] مانای ئەم دێڕە شیعرە بەم شێوەیەیە : ئەمی پیاوێك ئەکات – ئەو نوشتە ئەکاتە مەچەکی ، لە کاتێکدا دەست و مەچەکی گیرو گەواڵەو بە دوای کەروێشك دا دەگەڕێت – واتا پاشماوەی کەروێشك دەکاتە دەستی چونکە بیرو باوەڕیان وابووە کە جنۆکەکان نیزیکی کەروێشك ناکەونەوە. بەڵگەی ئەم دێڕە شیعرە : ووشەی ( مرسعةٌ ) مبتدایەو نکریە چونکە بۆ کەسێکی نادیارەو بە نادیاریش باسی کردوە.

[4] لە زمانی عەرەبیدا ( لولا ) بۆ سێ شت بەکاردێت : (ا) حرف امتناع لوجود واتا ڕوونەدانی شتێك لەبەر بوونی شتێکی تر. (ب) حرف عرض و تحضيض ( هاندن و هەڵنان ). (ج) حرف التوبيخ والتنديم ( سەرکۆنە کردن و پەشیمان بوون ).

[5] مانای ئەم دێڕە شیعرە بەم شێوەیەیە : ئەگەر صەبر و ئارامی نەبوایە – لەسەر جیابوونەوە لە خۆشەویست – ئەوە تیا دەچوو هەموو خاوەن خۆشەویستیەك- کاتێك خۆشەویست بنەو باری دەپێچایەوەو باریان دەرکرد.بەڵگەی ئەم دێڕە: ووشەی ( اصطبارٌ )نەناسراو ( نكرة )یەو بووە بە مبتدا چونکە لە دوای (لولا) هاتوە.

بیست و دوو : ئەگەر بکەوێتە دوای حەرفی فای پاداشت ( فاء الجزاء )[١]
وەکو ووتەیان ( إنْ ذَهَبَ غيرٌ فَعَيْرٌ في الرباط )[٢]

بیست و سێ : ئەگەر لامی ابتداء بچێتە سەر ناوە نەناسراوەکە ، وەکو (لرجلٌ قائمٌ)[٣]

بیست و چوار : ئەگەر لە دوای ( كَمْ )ی[٤] خبریەوە بێت ، وەکو ووتەی :

ش٤٨/ كمْ عمةٌ لك يا جريرُ وخالةٌ فَدْعاءُ قَدْ حَلَبَتْ عليَّ عشاري[٥]

---

[١] حەرفی ( فاء ) لە زمانی عەرەبیدا لە ڕووی ماناوە بۆ حەوت مانا بەکاردێت کە بریتین لە{(ا) حرف عطف. (ب) استئناف. (ج)رابط جواب الشرط. (د) سببي. (ه) تعليل. (و) زائد لتحسين اللفظ. (ز) فعل امر ( فِ ) } جا ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە جۆری سێهەمە کە بۆ وەڵامدانەوەی پاداشتی مەرجێك ( جزاء جواب الشرط ).

[٢] ئەم ڕستەیە پەندێکە لە پەندەکانی پێشینان ( مَثَلٌ من الامثال ، ماناکەی { ئەگەر گوێ درێژێك بڕوات ئەوە گوێدرێژێکی تر بەستراوەتەوە } ئەم پەندە بەکاردێت و وە دەهێنرێتەوە بۆ ڕازیبوون بە حازر و گوێنەدان بەوەی کە ڕۆشتوە ( يُضْرَبَ في الرضا بالحاضر وترك الغائب ). لەم پەندەدا ووشەی ( فعيرٌ ) ناوێکی نکرەیەو دەبێتە مبتدا لەبەر ئەوەی لە دوا فای پاداشت و وەڵامەوەیە.

[٣] لێرەدا ( رجلٌ ) ناوێکی نەناسراوە و دروستە ببێتە مبتدا لەبەر ئەوەی لامی ابتدای چۆتە سەر ، لامی ابتدا بریتیە لەو لامەی کە تەنها لە سەرەتای ڕستەوە دێت و بۆ توکید کردن و بەهێزکردنی قسەکە.

[٤] ووشەی ( كمْ ) لە زمانی عەرەبیدا بۆ دوو مانا بەکاردێت (ا) پرسیارکردن ( استفهامية ) کە بۆ پرسیار کردن لە ژمارەیەکی نادیار بەکاردێت و مەبەست پێی دیاریکردنی پرسیار لێکراوە.
(ب) بۆ هەواڵ و خبردان ( خبرية ) کە بە مانای زۆر ( كثير ) دێت وەکو ئەوەی ئێرە.

[٥] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە شیعرە : ئەم دێڕە شیعرە شیعری فەرزدەقە کە قسە بە جریر دەکات و دەڵێت : زۆر و پورو ( عمة ) میمکت (خالە) هەیە ئەی جریر کە دەستیان گێڕ بووە لەبەر ئەوەی حوشتر دۆشی من بوون.
بەڵگەی ئەم دێڕە : ( عمةٌ ) مبتدایەو نکرەیە لەبەر ئەوەی لە دوای ( كم )ی خبریەوە کە بە مانای – زۆر دێت– هاتووە.

جا هەندێ لە زانایان ئەمەیان[١] گەیاندۆتە سی و ئەوەندە شوێن ، ئەوەی کە من[٢] باسم نەکرد لەو شوێنانە بۆ خۆم لامداوە و باسم نەکردوە ، چونکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوانەی کە باسم کرد[٣] ، یان ڕاست و دروست نین.

* باسی پێشکەوتنی خبر

١٢٨- والأصلُ في الاخبار انْ تؤخرا وجوّزوا التقديمَ إذْ لاضررا[٤]

یاساو بنچینە وایە کە مبتدا لە پێشەوە بێت و خبریش لە دوایەوە بێت ، لەبەر ئەوەی خبر وەصفە لە مانادا بۆیە شایانی دواکەوتنە وەکو وەصف[٥]، بەڵام دروستە خبر پێشبکەوێت ئەگەر لێتێکچوون ( اللبس ) ڕوونەدات وەکو ئەوەی کە دواتر ڕوونی دەکەینەوە ، کەواتە دەڵێین ( قائمٌ زيدٌ[٦] ، وقائمٌ أبوه زيدٌ[٧] ، وأبوه منطلق زيدٌ[٨] ، وفي الدار زيدٌ[٩] ، وعندك عمرٌ[١٠] )

---

[١] واتا : ئەو شتانەی وا دەکەن مبتدا نکرە بێت.

[٢] مەبەستی ئەوەیە لە سی و ئەوەندەیە تەنها بیست و چواری باس کردوە.

[٣] واتا ئەم سی و ئەوەندەیە زۆربەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بیست و چوارە حاڵەتەی باسی کردوە.

[٤] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیەیە : یاساو بنچینە لە خبردا ئەوەیە کە لە دوای مبتداوە بێت ، زانایان بە ڕەواو دروستیان داناوە پێشکەوتنی خبر ، ئەگەر زەرەر و لێتێکچوون ڕوو نەدات بەو پێشکەوتنە.

[٥] واتا / وەصف و سیفەتی شتێك دەبێت لە دوای وەصف کراوە وە بێت خبریش وایە.

[٦] لێرەدا ( قائمٌ ) خبرەو اسمی فاعلیشە کەواتە جۆرێکە لە صفە بۆیە دروستە پێشکەوێت چونکە ماناکەی دیارو ئاشکرایە.

[٧] ئەصلی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە ( زيدٌ قائمٌ ابوه ) زيدٌ : مبتدا خبر. قائمٌ : خبر مقدم مرفوع. أبو : فاعل ل(قائم).

[٨] ئەصلەکەی ( زيدٌ منطلق ابوه ) وەکو ڕستەکەی پێشووتر وایە.

[٩] لێرەدا ( في الدار ) جارو مجرور متعلق بمحذوف خبر مقدم. (زيدٌ) مبتدا مؤخر.

[١٠] (عندَك) ظرف مبني على الفتح متعلق بمحذوف خبر مقدم. (زيد) مبتدا مؤخر.=

جا هەندێ لە زانایان ووتویانە کە ڕاو بۆچوونی کوفیەکان لەسەر ئەوەیە دروست نیە پێشکەوتنی ئەو خبرەی لای بەصریێکان جائزە پێشکەوێت[1] بەلاّم ئەمە[2] قسەی تێدایە،چونکە هەندێك لە زانایان یەکدەنگی بەصریێکان و کوفیەکانیان نەقل کردوە لەسەر دروستێتی (في الدار زيدٌ)[3] کەواتە گێڕانەوەی نادروستێتی[4] لە کوفێکانەوە بە ڕەهایی قسەیەکی ڕاست نیە ، بەم شێوەیە ووتویانە هەندێکیان ، ئەمەش[5] قسەو باس هەڵدەگرێت و بەڵێ بە دروستی نازانن کوفیەکان پێشکەوتنی خبر لە وێنەی ( زيدٌ قائمٌ ، وزيدٌ قام أبوه ، وزيدٌ أبوه منطلق )[6] وە ڕاست ئەوەیە کە دروستە ، چونکە هیچ ڕێگرییەك نیە لەمە ، بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد بە ووتەی ( وجوّزوا التقديم إذ لاضررا ) کەواتە

---

-جا ابن عقيل پێنج نموونەی هێناوەتەوە بۆ پێشکەوتنی خبر ، یەکێکیان خبرەکەی مفردەو دووانیان جملەیەو دوانیشیان شبە جملەیە.

[1] واتا پێشکەتنی خبر لە وێنەی ( قائمٌ زيدٌ ) و ( قائمٌ ابوه زيدٌ ) و ( في الدار زيدٌ ) و ( عندك زيدٌ ) لەم ڕستانەو هاوشێوەکانیان دروستە خبر پێشبکەوێت لای بەصریێکان بەلاّم لای کوفیەکان دروست نیە.

[2] واتا / ئەمەی کە هەندێ لە زانایان ووتویانە کوفێکان ئەم جۆرە پێشکەوتنەی خبر بە دروست نازانن : واتا : ابن عقيل دەڵێت : هەندێ لە زانایان دەڵێن لای کوفیەکان دروست نیە خبر پێش بکەوێت لەو ڕستانەی باس کران ، دواتر ابن عقيل دەڵێت ئەم بۆچوونەش قسەی تێدایە.

[3] لەم ڕستەیەدا ( في الدار ) پێشکەوتووە چونکە جارو مجرورە.

[4] واتا / نادروستێتی پێشکەوتنی خبر بەسەر مبتدا.

[5] واتا / یەکدەنگی زانایانی کوفەو بصرە لەسەر دروستێتی ( في الدار زيدٌ ).

[6] پوختەی ئەوەی باسکرا ئەوەیە : لای کوفێکان دروست نیە خبر پێشکەوێت ئەگەر خبرەکەی مفرد یان جملە بێت بەلاّم ئەگەر خبر شبە جملە ( جارومجرور ظرف ) بێت ئەوە دروستە ، بەلاّم لای بەصریێکان دروستە خبر پێشکەوێت مادام لێتێکچوون ڕوو نەدات.

دەڵێیت : ( قائمٌ زیدٌ ) وە لەمەیە[١] قسەیان ( مشنوءٌ مَنْ یشنؤك )[٢] لێرەدا مَنْ : مبتدایە منشوءٌ : خبرەو پێشکەوتوە ، هەروەها دروستە ( قامَ أبوە زیدٌ)[٣] وەکو ووتەی شاعیر :

ش٤٩ / قَدْ ثکلتْ امُّهُ مَنْ کُنْتَ واحدَهُ وباتَ منتشباً في بُرْثُنِ الأسد[٤]

لێرەدا ( مَنْ کُنْتَ واحدَه )[٥] مبتدایە و دواکەوتووە ، و ڕستەی ( قد ثکلتْ امُّهُ ) خبرەو پێشکەوتووە ، هەروەها دروستە بڵێیت ( أبُوهُ منطلق زیدٌ )[٦] ، ووتەی شاعیریش لەمەیە[٧]

---

[١] واتا / پێشکەوتنی خبر ئەگەر خبرەکە مفرد بێت.

[٢] ئەم ڕستەیە یەکێکە لەو قسانەی لە عەرەبەوە بیستراوە و ماناکەی ( بوغزێنراوە ئەو کەسەی دەتبوغزێنێت ) ئەم ڕستەیە بەڵگەیە بۆ ئـــەوەی کە دروستـــە خبـر پێشبکەوێت ئەگەر مفرد بوو لێکچوونیش ڕوونەدات.

[٣] ئەمەش نمونەیە بۆ پێشکەوتنی خبر کاتێك خبرەکە جملەی فعلی بێت.

[٤] مانای ئەم دێرە شیعرە : بێگومان لە دەستی دایکی چووە ئەو کەسەی تۆ هاوڕێی تەنهایی بیت و وە دەکەوێتە چنگی شێر. واتا کەسێك پشت بەتۆ ببەستێت تیا دەچێت.

بەڵگەی ئەم دێڕە : ئەم دێڕە بەڵگەیە بۆ ڕای بەصرێکان کە دەڵێن دروستە خبر پێشبکەوێت ، لێرەدا جملەی ( ثکلت امُه ) جملەیەکی فعلیەو دەبێتە خبری مقدم ، وە ( مَنْ ) اسمی موصولەو لە مخلی رفعی مبتدای مؤخر دایە. إعرابی تفصیلی دێڕەکە لە کتێبەکەدا – واتا لە حاشیەی ابن عقیل دا کە دانراوی ( محمد محی الدین)ە – کراوە.

[٥] دیارە تەنها ( مَنْ ) مبتدایەو ( کنت واحدە ) دەبێتە صلە بۆی.

[٦] لێرەدا ( ابوە منطلق ) خبرەو پێشکەوتووە و جملەی اسمیە.

[٧] واتا / ئەم دێڕی ژمارە (٥٠)یە بەڵگەو نموونەیە لەسەر پێشکەوتنی خبر کاتێك خبرەکەی جملەی اسمی بێت.

ش ٥٠ / إلى مَلِكٍ مَا أُمُّهُ مِنْ مُحَارِبٍ     أَبُوهُ، وَلاَ كَانَتْ كُلَيْبٌ تُصَاهِرُهْ[١]

لێرەدا((أَبُوهُ)) مبتدایەو جملەی ((مَا أُمُّهُ مِنْ مُحَارِبٍ)) خبرە پێشكەوتووە. جا زانا ((الشريف أبو السعادات هبة الله بن الشجري[٢])) یەكدەنگی بەصریێكان و كوفیێكانی نەقل كردووە دەربارەی دروستێتی پێشكەوتنی خبر ئەگەر جملە بێت ، بەلاّم بۆ چوونەكەی ڕاست نیە، بێگومان پێشتر باسمان كرد كە كوفیێكان بەدروستی نازانن.

** ** **

*باسی ئەو شوێنانەی كە دروست نیە خبر پێشكەوێت :

١٢٩_ فَامْنَعْهُ حِينَ يَسْتَوِي الْجُزْآنِ     عُرْفًا وَنُكْرًا ، عَادِمَيْ بَيَانِ

١٣٠_ كَذَا إِذَا ما الْفِعْلُ كَانَ الْخَبَرَا     أَوْ قُصِدَ اسْتِعْمَالُهُ مُنْحَصِرَا

١٣١_أَوْ كَانَ مُسْنَدًا لِذِي لاَمِ ابْتِدَا     أَوْ لاَزِمِ الصَّدْرِكَمَنْ لِي مُنْجِدَا[٣]

---

[١] ئەم دێرە شیعرە شیعری فەرەزدەقە و مەدحی خەلیفە وەلیدی كوڕی عبدالملك دەكات و دەڵێت: هاتووم بۆ لای مەلیكێك كە دایكی باوكی لە هۆزی محارب نیەو لەگەڵ هۆزی (كلیب)یشدا ژن و ژن خوازی نەكردووە .

بەڵگەی ئەم دێرە: پێشكەوتنی خبر كە جملەی ( (مَا أُمُّهُ مِنْ مُحَارِبٍ)) بەسەر مبتداكەیدا كە بریتیە لە ((أَبُوهُ)) .

[٢] ئەم زانایە ناوی تەواوی ((هبة الله بن علي بن محمد))ناسراو بە ((أبو السعادات)) و یەكێكە لە پێشەوا ناودارەكانی زانستەكانی زمان و ئەدەب، ساڵی ٤٥٠ك لەشاری بغداد لە دایك بووە و ساڵی ٥٤٢ك لە هەمان شار وەفاتی كردووە..

[٣] مانای ئەم سێ دێرەی ئەلفیە بە كورتی: (١٢٩) دروست نیەو ڕێگە نەدراوە بە پێشكەوتنی خبر كاتێك هەركام لە مبتداو خبر وەكو یەك وابن لە ڕووی ناسراو بوون و نە ناسراو بوون و هیچ بەڵگەو نیشانەیەكیش نەبێت بۆ ڕوونكردنەوەو دیاریكردنی خبرەكە.

١٣٠) هەروەها دروست نیە خبر پێشكەوێت ئەگەر جملەی فعلی بێت ، هەروەها دروست نیە پێشكەوێت ئەگەر كورت كراو و كۆكراو (محصور) بێت.-

دابەش دەبێت _خبر بە پێی پێشکەوتنی بەسەر مبتدا و دواکەوتنی _ بۆ سێ جۆر : جۆرێك كە دروستە پێشکەوتن و دواکەوتنی ، کە پێشتر باسکرا[1] ، جۆرێکی تریان پێویستە خبر دواکەوێت و دروست نیە پێشکەوێت ، جۆرێکی تریشیان پێویستە خبر پێشکەوێت ((واجب التقديم)).

جا ئاماژەی کرد دانەر بەم چەند دێڕە بۆ جۆری دووەم کە پێویستە خبر دواکەوێت و نابێت پێشکەوێت ، جا لێرەدا باسی پێنج شوێنی کرد :

یەکەم: کاتێك هەر کام لە مبتدا و خبر ناسراو ((معرفه)) بن یان نەناسراو ((نكره)) بن و هەردووکیان بگونجێن بۆ ئەوەی ببنە مبتدا و هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیش نەبێت بۆ جیاکردنەوەی مبتداکە ، وەکو ((زیدٌ أخوك، وأفْضَلُ من زيدٍ افضلُ من عمرو[2])) لەم ڕستەیەو هاو وێنەکانیدا دروست نیە خبر پێشکەوێت ، چونکە ئەگەر خبر پێشخەیت و بڵێیت ((اخوك زيدٌ ، و افضل من عمروٍ افضل من زيدٍ)) ئەوە پێشخراوە[3] دەبێتە مبتدا و لە کاتێکدا تۆ دەتەوێت خبر بێت[4] ، ئەمە ئەگەر بەڵگە نەبێت لەسەر ڕوونی و

---

-(١٣١) هەروەها دروست نیە پێشکەوێت ئەگەر مبتداکە لامی ابتدای لەسەر بوو ، هەروەها ئەگەر مبتداکە لەو ناوانە بێت کە دەبێت لە سەرەتای ڕستەوە بێت و نابێت دواکەون ، وەکو (مَنْ لی مُنْجِدًا) واتا کێ فریاد ڕەسی منە؟ لەم ڕستەیەدا (مَنْ) مبتدایەو اسمی استفهامە و دەبێت لەسەرەتای ڕستەوە بێت و نابێت دواکەوێت.

[1] لە دێڕی ژمارە (١٢٨)ی ئەلفیەدا باسکرا ، لە وتەی ((وجَوَّزوا التقديم إذ لاضَرَرَا))..

[2] ڕستەی ((زيدٌ اخوك)) هەردووکیان ناسراوە (معرفة)ن ، بۆیە دروست نیە خبر پێشکەوێت ، هەروەها ڕستەی ((أفْضَلُ من زيدٍ أفْضَلُ من عمروٍ)) هەریەك لە مبتداكە ((أفْضَلُ من زيدٍ)) لەگەڵ خبرەکە ((أفْضَلُ من عمروٍ)) هەردووکیان نەناسراو ( نكرة) ن.

[3] پێشخراو واتا: (اخوك ) لە نموونەی یەکەمداو (افضل من عمروٍ) لە نموونەی دووەمدا.

[4] واتا / مەبەستت بێت (اخوك) و (افضل من عمروٍ) خبر بێت نە وەك مبتدا.

دیاری مبتدا و خبرەکە ، بەڵام ئەگەر بەڵگە هەبێت لەسەر ئەوەی کە پێشخراو خبرەو مبتدا نیە ئەوە دروستە، وەکو وتەی ((أبو یوسف أبو حنیفە [1])) ئەوە دروستە خبرەکە _ کە بریتیە لە أبو حنیفە _ پێشکەوێت چونکە دەزانرێت وە مەبەست ئەوەیە تشبیهی أبو یوسف بکەین بە أبو حنیفە، نەوەك تشبیهی أبو حنیفە بە أبو یوسف ، هەروەها وەکو وتەی شاعیر :

ش ٥١/ بَنُونَا بَنُو أَبْنَائِنَا، وبَنَاتُنَا بَنُوهُنَّ أَبْنَاءُ الرِّجَالِ الأَبَاعِدِ (٢) .

لێرەدا وتەی (بَنُونَـا ) خبرەو پێشخراوە ، وە (بَنُـو أَبْنَائِنَـا) مبتدایەو دواخراوە ، چونکە مەبەست ئەوەیە بڕیار بدات بەوەی کە نەوەی نەوەکانیان وەکو نەوەکانیان وان ، نەوەك بڕیاردات بەوەی نەوەکانیان وەکو نەوەی نەوەکانیان وان.

---

(١) ئیمامی ابو (حنیفە) ناوی (النعمان بن ثابت) ە و یەکێکە لە پێشەوایان و شەرعزانانی ئیسلام و خاوەنی مذهبی حەنەفیە و ساڵی ١٥٠ك کۆچی دوای کردووە ، (ابو یوسف) یش فەقێ و خوێندکاری ئیمامی ابو حنیفە یەو ناوی (یعقوب بن إبراهیم) ە و یەکەم کەسە کە مذهبی حەنەفی بڵاو کردۆتەوە و ناوبانگی (قاضی القضاة)ی لێ نراوە و ساڵی ١٨٢ك لە شاری بغداد کۆچی دوای کردووە.

جا لەم ڕستەیەدا (ابو یوسف) مبتدایەو (ابو حنیفە) ش دەبێتە خبر چونکە دەتەوێت بڵێیت ابو یوسف وەکو ابو حنیفە وایە.

(٢) کورتەی مانای ئەم دێڕە : ڕۆڵەی ڕۆڵەکانمان وەکو ڕۆڵەکانمان وان ، بەڵام نەوەی کچەکانمان ڕۆڵەی پیاوانی بێگانەن.

بەڵگەی ئەم دێڕە : پێشکەوتنی خبرە کە بریتیە لە (بَنُونَا) بەسەر مبتداکە کە بریتیە لە (بَنُو أَبْنَائِنَا) هەردووکیشیان ناوی ناسراون جا ئەمە دروستە چونکە دەزانین شاعیر دەیەوێت بڵێت ڕۆڵەی ڕۆڵەکانمان وەکو ڕۆڵەکانمانن.

دووەم: ئەگەر خبرەکە فیعلێك بێت و فاعیلەکەی جێناوێکی نادیار بێت کە دەگەڕێتەوە بۆ مبتداکە وەکو (زيدٌ قام) لێرەدا فعلی قام و فاعله مقدرەکەی خبرە بۆ (زيدٌ) وە دروست نیە پێشبکەوێت ، بۆیە ناوترێت (قام زيدٌ) وە (زيدٌ) مبتدای دواخراو بێت فعلەکەش (قام) خبری پێشخراو بێت ، بەڵکو (زيدٌ) دەبێتە فاعلی قام ، جا لەم کاتەدا (١)لەباسی مبتداو خبر دەردەچێت و دەبێتە باس و بابەتی فعل و فاعل ، بەڵام ئەگەر فعلەکە(٢) فاعلەکەی ناوێکی ئاشکرا (ظاهر) بوو _ وەکو (زيدٌ قام ابوهُ) دروستە پێشکەوێت و دەڵێت (قام ابوه زيدٌ) پێشتر باسی خیلافی زانایانمان باسکرد(٣)، هەروەها دروستە پێشکەوێت(٤) ئەگەر فعلەکە جێناوێکی ئاشکرا (ضمير بارز)ی مرفوع کردبێت وەکو (الزيدان قاما) لێرەدا دروستە خبرەکە پێشخەیت و بڵێت ، (قاما الزيدان) و (الزيدان) مبتدای مؤخر بێت و (قاما) خبری مقدم بێت ، بەڵام کۆمەڵێ لە زانایان ئەمەیان بە نادروست داناوە.

جا کە ئەمەت(٥) زانی ئەوە بۆت دەردەکەوێت کە ووتەی دانەر (كَذَا إِذَا ما الْفِعْلُ كَانَ الْخَبَرَا) مانای وایە هەر کاتێك خبر فعل بوو ئەوە بە ڕەهای (مطلقاً) دەبێت دواکەوێت و دروست نیە پێش کەوێت ، بەڵام وانیە بەڵکو کاتێك واجبە دواکەوێت ئەگەر فعلەکە جێناوێکی نا دیاری مرفوع کرد بوو، وەکو باسکرا .

---

(١) واتا کاتێك (قام زيدٌ) فعل و فاعل بن .

(٢) واتا / ئەو فعلەی دەبێتە خبر .

(٣) لە شەرح و ڕاڤەی دێڕی (١٢٨) ی ئەلفەیەدا باسکرا.

(٤) واتا خبر پێشکەوێت .

(٥) واتا / ئەوەی چ کاتێك دروستە فعل کە دەبێتە خبر پێش مبتداکەی بکەوێت و چ کاتێك دروست نیە .

سێ یەم: ئەگەر خبرەکە کورت هەڵهاتبوو[١] لە مبتداکە بە هۆی حەرفی (إنّما) وەکو (إنّما زيدٌ قائمٌ) کە یان بە حەرفی (إلا) ەوە وەکو (ما زيدٌ إلا قائمٌ) ئەمەیە مەبەست لە وتەی ((أَوْ قُصِدَ اسْتِعْمَالُهُ مُنْحَصِرَا)) کەواتە دروست نیە پێشکەوتنی (قائمٌ) بەسەر (زید) دا لەو دوو نموونەیە ، بەلاّم بە شازی هاتووە پێشکەوتن لەگەڵ (إلا) دا ، وەکو وتەی شاعر :

ش ٥٢/ فَيَارَبِّ هَلْ إلاَّ بِكَ النَّصْرُ يُرْتَجَى     عَلَيْهِمْ ؟ وَهَلْ إلاَّ عَلَيْكَ الْمُعَوَّلُ[٢]

ئەصلی ئەم ڕستەیە (وَهَلْ الْمُعَوَّلُ إلاَّ عَلَيْكَ) بەلاّم خبرەکەی پێشخستووە.

چوارەم: ئەگەر مبتداکە لامی دەست پێکردن (ابتداء) ی لەسەر بوو وەکو (لزيدٌ قائمٌ ) ئەمەش ئاماژەی بۆ کرا بە وتەی (أَوْ كَانَ مُسْنَدًا لِذِي لاَمِ ابْتِدَا(٣)) کەواتە دروست نیە پێشخستنی خبر بەسەر لامەکەدا ، بۆیە دروست نیە بڵێت (قائمٌ لزيدٌ) ، چونکە لامی ابتدا دەبێت لەسەرەتای ڕستەوە بێت ، بەلاّم بە شازی هاتووە پێشخستنی خبر بەسەر لامی ابتدا ، وەکو وتەی شاعیر :

---

(١) مەبەست لە کورت هەڵهاتن جێگیرکردنی شتێکە بۆ شتێك و لادانی لە شتی تر .
کە پێی دەوترێت (الحصر) جا لە زمانی عەرەبیدا (حصر) بە دوو حەرف دەکرێت :
أ_إنّما  ب_( إلا) کاتێك (نفی) لە پێشێوە بێت .

(٢) مانای ئەم دێرە شیعرە بە کورتی : ئەی پەروەردگارم سەرکەوتن بەسەریاندا تەنها لە تۆ چاوەڕوان دەکرێت ؟ وە پشت بەستن تەنها بە تۆیە ؟

بەڵگەی ئەم دێرە : پێشکەوتنی خبری حصر کراوە بە شازی لە هەردوو ڕستەی (بِكَ النَّصْرُ) و (عَلَيْكَ الْمُعَوَّلُ) ئەمە شازەو پێچەوانەی یاسایەو ئەصلەکەی (هَلْ يُرْتَجَى النَّصْرُ إلاَّ بِكَ) و (هَلْ الْمُعَوَّلُ إلاَّ عَلَيْكَ)

(٣) پێشتر مانای ئەم دێرانەمان کرد ، جا وشەی (مسند) زاراوەیەکی زانستی بلاغەیە مەبەست پێی (پاڵدراوە) جا لە زمانی عەرەبیدا بە (خبر) و بە (فعل) دەوترێت (المسند) و بە (مبتدا) و بە (فاعل) دەوترێت (المسند إليه) .

ش٥٣/ خَالِي لأنْتَ ، وَمَنْ جَرِيرٌ خَالُهُ    يَنَلِ الْعَلاَءَ وَيَكْرُمِ الأَخْوَالاَ[(١)]
لێرەدا (لأنْتَ)مبتدایەو دواخراوە و (خَالِي) خبرەو پێشخراوە.
پێنجەم: ئەگەر مبتداکە لەو ناوانە بوو کە دەبێت تەنها لەسەرەتای ڕستەوە بێت وەکو ناوەکانی پرسیار کردن (أسماء الإستفهام) .
وەکو (مَنْ لي منجدا) لێرەدا مَنْ[(٢)] : مبتدایەو ، و لی : خبرەو ، منجداً : (حال) ە ، و دروست نیە پێشخستنی خبر بەسەر (مَنْ) دا و ناڵێیت (لي مَنْ منجدا).
*باسی ئەو شوێنانەی کە پێویستە خبر پێشکەوێت (مواضعُ تقديمِ الخبرِ وجوباً)

| | |
|---|---|
| ١٣٢ _ وَنَحْوُ عِنْدِي دِرْهَمٌ وَلِي وَطَرْ | مُلْتَزَمٌ فِيهِ تَقَدُّمُ الْخَبَرْ . |
| ١٣٣_ كَذَا إِذَا عَادَ عَلَيْهِ مُضْـــمَـرُ | مِمَّا بِهِ عَنْهُ مُبِينًا يُخْبَرُ . |
| ١٣٤_ كَذَا إِذَا يَسْتَوْجِبُ التَّصْدِيرَا | كَأَيْنَ مَنْ عَلِمْتُهُ نَصِيرَا . |
| ١٣٥_ وَخَبَـرَ الْمَحْصُورِ قَدِّمْ أَبَدَا | كَمَا لَنَا إِلاَّ اتِّبَاعُ أَحْمَدَا .[(٣)] |

---

(١) کورتەی مانای ئەم دێرە : بێگومان تۆ خاڵمی ، هەر کەسێش جریر خاڵی بێت ، ئەوە بە دەست دێنێت ڕێزو گەورەی و ڕێزیش لە خاڵۆانی دەگرێت .
بەڵگەی ئەم دێرە : (خَالِي لأنْتَ ) لێرەدا (خَالِي) خبرەو پێشکەوتووە لە کاتێکدا مبتداکە لامی ابتدای لەسەرە ئەمەش شازەو پێچەوانەی یاسایە
(٢) إعرابی تەواوی (مَنْ) اسم استفهام مبني على السكون في محل رفع مبتدا.
(٣) پوختەی مانای ئەم چوار دێرەی ئەلفیە بەم شێوەیە : (١٣٢) لە وێنەی (عِنْدِي دِرْهَمٌ) واتا لامە درهەمێك و (لِي وَطَرٌ) هەمە پێداویستیەك ، پێویستە پیشکەوتنی خبر _ واتا ئەگەر خبر ظرف بوو وەکو (عِنْدِي) یان جار ومجرور بوو وەکو (لِي) و مبتداکەشی ناوێکی نەناسراو بوو هیچ بەڵگەیەکیش نەبوو بۆ پێشکەوتنی .
(١٣٣) هەروەها ئەگەر جێناوێك لکا بێت بە مبتداکەوەو بگەڕێتەوە بۆ بەشێك لە خبرەکە ، چونکە جێناو دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ناوێك لە پێش خۆی .-

ئامـاژه دەكـات بـەم چـەند دێـڕە بـۆ جـۆری سـێیەم ، ئـەویش بریتیـە لـە پێشكەوتنی خبر بە واجبی[1] ، جا دانەر باسی ئەوە دەكات كە واجبە خبر پێشكەوێت لە چوار شوێندا :

یەكەم : ئەگەر مبتداكە نەناسراو (نكرە) بێت و هیچ بەڵگەیەكیش نەبێت بۆ دروستی[2] تەنها پێشكەوتنی خبرەكە نەبێت ، خبرەكەش ظرف بێت یان جارومجرور ، وەكو (عندَك رجلٌ[3] ، و في الدار امرأةٌ[4]) لێرەدا پێویستە خبر پێشكەوێت و نابێت بڵێیت (رجلٌ عندك) و نابێت بڵێیت (امرأةٌ في الدار) جا زانایانی نحوو هەموو عەرەبیش یەكدەنگن لەسەر نادروستیی ئەمە[5]، بـۆ ئـەوەش ئامـاژەی كـرد بـە ووتـەی (وَنَحْـوُ عِنْـدِي دِرْهَـمٌ، وَلِـي وَطَـرْ

- (١٣٤) هەروەها ئەگەر خبرەكە لەو ناوانە بوو كە پێویستە لە سەرەتای ڕستەوە بێت وەكو (اينَ مَنْ عَلِمْتُهُ) واتا (كوا ئەو كەسەی من بە پیشتیوانم دەزانی ؟) لێرەدا (اينَ) خبری مقدمە و (مَنْ) مبتدای مؤخرە.

(١٣٥) هەروەها پێشخە خبری كورت هەڵهاتوو بۆ شتێك وەكو (مَا لَنَا إلاَّ اتِّبَاعُ أَحْمَدَ) واتا (ئێمە تەنها شوێنی ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) دەكەوین لەم ڕستەیەدا (اتِّبَاع) مبتدای مؤخرە و (لَنَا) جارومجرورە و متعلقە بە حذفكراوێك كە خبرە بۆ اتباع .

[1] پێشتر باسی دوو جۆرەكەی ترمان كرد.

[2] پێشتر لە دێڕی (١٢٥) ی ئەلفیەدا باسمان كرد دروست نیە مبتدا ناوێكی نەناسراو (نكرە) بێت مەگەر بەڵگەیەك هەبێت بیست وچوار بەڵگەشمان بۆ باس كرد، جا ئەگەر هیچ كام لەو بیست و چوارە نەبێت ئەوە واجبە خبر پێشكەوێت ئەگەر خبرەكە ظرف یان جارومجرور بێت.

[3] لێرەدا (رجلٌ) نكرەیەو دروست نیە ابتدای پێبكرێت بۆیە دواكەوتووە.

[4] في الدار جارومجرور متعلق بمحذوف خبر مقدم .(إمرأة) مبتدا مؤخر .

[5] واتا / ئەوەی كە دروست نیە نكرە ببێتە مبتدا بەبێ بەڵگەو پاساو.

دێڕەکـە[1] ، بـەڵام ئەگـەر نـاوە نەناسـراوە مبتداکـە بەڵگـەی هـەبوو بـۆ دەستپێکردنی[2] ئەوە هەردووکیان دروستە[3]، وەکو (رجلٌ ظريفٌ عندي) و (عندي رجلٌ ظريفٌ) [4]

دووەم : ئەگـەر مبتداکـە لـەخۆی گرتبێـت جێناوێـك کـە ئـەو جێنـاوە دەگەڕێتەوە بۆ شتێك کەلـە خبرەکـەدا هـاتووە ، وەکـو (في الـدار صاحبها) لێرەدا صاحبها : مبتدایەو جێناوەکەی پێوە لکاوە دەگەڕێتەوە بۆ (الـدار) کـە بەشـێکە لـە خبرەکە[5] ، لێـرەدا دروست نیـە خبرەکە دواکەوێت وەکـو (صـاحبها في الـدار) بـۆ ئـەوەی نەگەڕێتـەوە جیناوەکـە بـۆ شـتێك کـە دواکەوتووە لە وێژەو پلەدا (لفظاً و رتبةً )[6].

جا ئەمەیە مەبەستی دانەر کە فەرمووی (كَذَا إِذَا عَادَ عَلَيْهِ مُضْمَرُ )دێڕەکە واتـا هـەروەها واجبـە پێـشکەوتنی خـبر کاتێـك بگەڕێتـەوە جێناوێـك کـە دەگەڕێتەوە بۆ خبرو لکاوە بە مبتداکەوە ، وەکو ئەوەی ووتوبێتی: واجبـە پێشکەوتنی خبر ئەگەر بگەڕێتەوە بۆی جێناوێك کە لکاوە بە مبتداکـەوە ،

---

[1] واتا دێڕی ژمارە (١٣٢)ی ئەلفیە .

[2] پێشتر باسی (٢٤) بەڵگەمان کرد .

[3] واتا / پێشکەوتن و دواکەوتنی خبر دروستە.

[4] لەم ڕستەیەدا (رجلٌ) مبتدایەو نکرەیە بەڵام وەصفکراو (موصوف) ە بۆیە دروستە ببێتە مبتدا .

[5] چونکە (في الدار) پێکەوە دەبنە جارو مجرور هەردووکیشیان (متعلق) ن بە حذف کراوێك کە دەبێتە خبر.

[6] مەبەست لە دواکەوتنی پلە (رتبە) ی خبر ئەوەیە کە یاسا و ئەصل ئەوەیە خبر لە دواوە بێت، وە مەبەست لە دواکەوتنی خبر لە (لفظ) دا ئەوەیە پێشی نەخەیت و بیبەیتە دواوە ، دیارە لە زمانی عەرەبیدا جێناو (الضمير) دەبێت بگەڕێتەوە بۆ پێش خۆی و نابێت بگەڕێتەوە بۆ دوای خۆی.

ئەمەش[1] قسەو ڕاڤەی (إبن عصفور)[2] ە لە هەندێ لە كتێبەكانی دا ، بەڵام ڕاست و دروست نیە[3] چونكە جێناوەكە لە ڕستەی (في الدار صاحبها) دا دەگەڕێتەوە بۆ بەشێك لە خبرەكە نەوەك بۆ خبرەكە ، كەواتە دەبێت ناوێكی مضافي حذف كراو مقدر بكرێت بۆ قسەكەی دانەر كە وتی (عاد عليه) تقديرەكەی (كذا إذا عاد على ملابسه)[4] پاشان ئەو ناوە مضافە_كە بریتیە لە مُلابس _ حذف كراوەو (مضاف إليه) كە بریتیە لە_ جێناوی (ـه) _ لە جێی دانیشتووەو قسەكە بووە بە (كذا إذا عاد عليه) . هەروەها وەكو ڕستەی (في الدار صاحبها) وایە قسەیان (على التمرة مثلها زبدا)[5] ،وە وەكو ووتەی شاعیر كە دەڵێت :

ش٥٤/ اَهَابُكِ إِجْلاَلاً وَمَا بِكِ قُدْرَةٌ    عَلَيَّ،وَلَكِنْ مِلْءُ عَيْنٍ حَبِيبهَا[6].

---

[1] واتا / ئەوەی كە ئەو جێناوە دەگەڕێتەوە بۆ خبرەكە.

[2] ناوی تەواوی (علي بن مؤمن بن محمد بن علي) و ساڵی ٥٩٧ك لە دایك بووەو یەكێك بووە لە زانا گەورەكانی زانستی نحو ، ساڵی ٦٦٩ك كۆچی دوای كردووە.

[3] واتا ڕاڤەو لێكدانەوەی ابن عصفور كە دەڵێت ئەو جێناوە لكاوەی مبتداكە دەگەڕێتەوە بۆ خبر تەواو نیە بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ بەشێك لە خبر وەكو ابن عقيل دەڵێت.

[4] مەبەست ئەوەیە كە ابن مالك فەرمووی لە دێڕی (١٣٣) دا (ئەگەر جێناوە لكاوەكە بە مبتداكەوە بگەڕێتەوە بۆ خبرەكە) بەڵام دەبوو وتبای (بگەڕێتەوە بۆ بەشێك لە خبرەكە) وەكو وتمان . ووشەی ( ملابس ) واتا ئەوەی بەشێكە لە خبرەكە و لەگەڵ خبرەكەدا تێكەڵاو بووە.

[5] ئەم ڕستەیە لە قسەكانی عەرەبەوە بیستراوە و ماناكەی (بەسەر خورمایەكەوە هاو وێنەی خورماكە چەوری) لەم ڕستەیەدا خبرەكە پێشكەوتووەو مبتداشی دواكەوتووە چونكە مبتداكە جێناوێكی پێوەیە كە دەگەڕێتەوە بۆ (التمرة).

[6] كورتەی مانای ئەم دێڕە:من لە تۆ دەترسم لەبەر ئەوەی تۆ گەورەو خۆشەیستی لەلام نەوەك لەبەر ئەوەی تۆ دەسەڵاتی منت هەبێت ، چونكە خۆشەویستی تۆ پڕ چاوانەو ئەوەش وای كردووە لێت بترسم.

لێرەدا (حَبِيبُهَا) مبتدایەو دواکەوتووە (ملءُ عین) خبرەو پێش کەوتووە ، دروست نیە دوابکەوێت چونکە جێناوە لکاوەکە بە مبتداکەوە _ کە بریتیە لە (ها) _ ئەگەڕێتەوە بۆ ووشەی (عین)[1] کە وشەی عین بە شێکە لە خبرەکە ، جا ئەگەر بڵێت (حبیبها ملءُ عین ) ئەوە جێناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوای خۆی کە دواکەوتووە لە (لفظ و معنی) دا.

جا زانایان خیلافیان هەیە لە دروستێتی ڕستەی (ضَرَبَ غُلامُهُ زیداً )[2] لەگەڵ ئەوەی جێناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوای خۆی کە دواکەوتووە لە لفظ و معنادا ٬ بەڵام خیلافیان نیە _ ئەوەندەی من بزانم _ لە نادروستێتی (صاحبها في الدار) کەواتە جیاوازی نێوان ئەم دووانە[3] چیە ؟ دیارە جیاوازییەکە ئاشکرایە ، ئەگەر وورد بیتەوە ، جیاوازی نێوانیان ئەوەیە لەڕستەی (ضَرَبَ غلامە زیداً) ئەوەی جێناوەکەی پێوە لکاوە و ئەوەشی جێناوەکەی بۆ دەگەڕێتەوە هەردووکیان هاوبەشن لەوەی یەك (عامل) یان هەیە[4]، بە پێچەوانەی (في الدار صاحبها) کە (عامل) ی ئەوەی جێناوەکەی پێوە لکاوە جیاوازە لە عاملی ئەوەی جێناوەکەی بۆ دەگەڕێتەوە[5].

---

بەڵگەی ئەم دێڕە : پێشکەوتنی خبرەکە (ملء عین) بەسەر مبتداکە (حبیبها).

[1] ووشەی (عین)کەبە مانای چاو بێت ئەوە (مؤنثي معنوية) بۆیە جێناوی (ها) ی بە مؤنثی بۆ گەڕاوەتەوە.

[2] لەم ڕستەیەدا جێناوی ( ه ) ی لکاو بە (غُلامُهُ) دەگەڕێتەوە بۆ (زیداً) کەلە لفظ و مانادا لە دواوەیە.

[3] واتای ڕستەی (في الدار صاحبها) و ڕستەی (ضَرَبَ غلامُهُ زیداً) هەردووکیان جێناو (ضمیر) تیایاندا دەگەڕێتەوە بۆ دوای خۆی بەڵام یەکەمیان دروست نیەو دووەمیان دروستە.

[4] واتا لەڕستەی (ضَرَبَ غلامُهُ زیداً) عاملی (غلام) و (زیداً) بریتیە لە فعلی (ضَرَبَ) واتا / ضرب عملی کردووە لە (فاعل و مفعول بە) دا.

[5] پێشتر لە دێڕی (١١٧) ی ئەلفیەدا باسی عاملی مبتداو خبرمان کرد.

سێ یەم : ئەگەرخبرەکە لەو ناوانە بێت کەلەسەرەتای ڕستەوە دێن[(١)]، ئەمەش مەبەستە لە ووتەی دانەر ( كَذَا إذَا يَسْتَوْجِبُ التَّصْدِيرَا )وەکو (أيْنَ زيدٌ) لێرەدا زیدٌ : مبتدایەو دواکەوتووە ، أينَ : خبرەو پێشکەوتووە و نابێت بچێتە دواوەو دروست نیە بڵێیت (زیدٌ أینَ) چونکە پرسیار کردن دەبێت لە سەرەتای قسە کردنەوە بێت ، هەروەها وەکو ( أینَ مَنْ علمتُهُ نصیراً؟ )[(٢)] لێرەدا أینَ : خبرەو پێشکەوتووە و مَنْ : مبتدایەو دواکەوتووە , و ڕستەی (علمتُهُ نصیراً) دەبێتە صلەی (مَنْ).

چوارەم : ئەگەر حوکم و بڕیار کورت هەڵهاتبوو لەسەر مبتداکە ، وەکو (إنَّما في الدار زيدٌ وما في الدار إلا زيدٌ )[(٣)] هەروەها وەکو نموونەی (مَا لَنَا إلاَّ اتِّبَاعُ أَحْمَدَ )[(٤)]

** ** **

*** باسی دروستێتی حذف کردنی مبتدا یان خبر ئەگەر زانراو دیار بێت:**

١٣٦. وَحَــذْفُ مَا يُعْلَمُ جَائِزٌ،كَمَا    تَقُولُ زَيْدٌ بَعْدَ مَنْ عِنْدَكُمَا

١٣٧. وَفِي جَوَابِ(كَيْفَ زَيْدٌ) (قُلْ)( دَنِفٌ)    فَزَيْدٌ اسْتُغْنِيَ عَنْهُ إذْ عُرِفْ[(٥)]

---

(١) ئەو ناوانەی لە زمانی عەرەبیدا لەسەرەتای ڕستەوە دێن (الأسماء التي لها صدارة في الكلام) ئەمانەن (اسماء الإستفهام ، و اسماء الشرط ، و( ما) التعجبية ، و (كم) الخبرية ، و ضمير الشأن ) ئەم ناوانە بەردەوام دەبێت لە سەرەتای ڕستەوە بێن.

(٢) پێشتر مانای ئەم ڕستەیەمان کرد ، إعرابی تەواویشی لە کتێبەکەدا کراوە.

(٣) واتا / لەم دوو ڕستەیەدا حوکمی بوون لەو خانووەدا کورت هەڵهاتووە (حصر کراوە بۆ (زیدٌ) واتا : تەنها (زیدٌ) لەو خانووە دایە.

(٤) واتای ئەم ڕستەیە : ئێمە تەنها شوێن ڕێبازی أحمد – مەبەست پێغەمبەری خوایە (ﷺ)دەکەوین.

(٥) واتای ئەم دوو دێرەی ئەلفیە بەم شێوەیە : (١٣٦) حذفکردنی مبتدا یان خبر ئەگەر زانراو و دیار بێت دروستە ، وەکو دەڵێیت (زیدٌ) دوای ئەوەی پرسیارت لێدەکرێت (کێتان لایە) واتا : (زیدٌ عندنا) یان (عندنا زیدٌ) .-

دروستە حذف کرێت هەریەك لە مبتدا وخبر[١] ئەگەر بەڵگە هەبێت لەسەری[٢] ، جا ئایا بە جائزی[٣] حذف دەکرێت یان بە واجبی[٤] ، جا لەم دوو دێڕەدا باسی حذفکردنی جائزی کردووە ، نموونەی حذف کردنی خبر ئەوەیە کە بوترێت (مَنْ عندکما؟) و تۆش لە وەڵامدا بڵێیت (زیدٌ) تقدیرەکەی دەبێتە (زیدٌ عندنا ) هەروەها وەکو ئەمە وایە[٥] _ لەسەر رایەك_ ڕستەی (خرجت فإذا السبع) تقدیرەکەی (فإذا السبع حاضر)[٦] ، شاعیریش ووتوویەتی :

ش ٥٥– نَحْنُ بِمَا عِنْدَنَا ، وَأَنْتَ بِمَا عِنْدَك رَاضٍ ، وَالرَّأْيُ مُخْتَلِفُ.[٧]

---

- (١٣٧) هەروەها لە وەڵامی (زید چۆنە) بڵێ (نەخۆشە) ، لێرەدا بێ نیاز بووین لە وتنی (زیدٌ) چونکە زانراوە ، واتا ئەم دێڕە نموونە بوو بۆ حذف کردنی مبتدا و دێڕی پێشووتریش نموونە بوو بۆ حذف کردنی خبر.

[١] واتا / یەکێکیان حذف دەکرێت بەڵام هەندێ جار دروستە هەردووکیان حذف کرێت ، وەکو لە دواتر باسی دەکەین.

[٢] واتا / لەسەر حذف کردنە.

[٣] جائز ئەوەیە دەتوانی حذفی کەیت و دەتوانی حذفی نەکەیت ، بۆ نموونە لە وەڵامی پرسیاری (مَنْ عندکما؟) دروستە بڵێت (زیدٌ) و خبرەکەی حذف کەیت و دروستیشە بڵێت (زیدٌ عندنا).

[٤] حذف کردنی بە واجبی ئەوەیە دروست نیە باس کرێت ، جا دواتر باسی ئەو شوێنانە دەکەین کە واجبە خبر و مبتدا تیایاندا حذف کرێت .

[٥] واتا حذف کردنی خبر.

[٦] لەم ڕستەیەدا لە دوای (إذا) ی (الفجائیة) وە مبتدایەك هاتووەو خبرەکەی حذف کراوە ، لەسەر ئەو ڕایە کە دەڵێت (إذا الفجائیة) حەرفەو اسم نیە ، چونکە زانایان دوو ڕایان هەیە دەربارەی (إذا الفجائیة) هەندێکیان دەڵێن : ظرفە ، هەندێکیان دەڵێن حەرفە . جا ئەگەر لێرەدا حرف بێت ئەوە (السبع) دەبێتە مبتداو خبرەکەی حذف کراو.

[٧] مانای ئەم دێڕە شیعرە : ئێمە بەوەی هەمانە ڕازین و تۆش بەوەی هەتە ڕازیت ، ڕاو بۆچوونیش جیاوازە.–

تقدیرەکەی (نحن بما عندنا راضون).

هەروەها نموونەی حذف کردنی مبتدا ئەوەیە کاتێك بوترێت (کیف زیدٌ ؟) تۆش دەڵێت (صحیح) واتا (هو صحیح) جا دروستە هەریەك لە مبتداو خبر باس کەیت و حذفیان نەکەیت و بڵێت (زیدٌ عندنا ، وهو صحیحٌ)[١].

هەروەها وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا﴾[٢] واتا (من عمل صالحا فعمله لنفسه ، ومن أساء فإساءته عليها)[٣]

وە ووتراوە : هەندێ جار هەردووکیان _واتا مبتداو خبر_ حذف دەکرێن ئەگەر بەڵگە هەبێت لەسەریان ، وەکو فەرموودەی خوای گەورە : ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ

---

-بەڵگەی ئەم دێڕە :(نحن بما عندنا) لێرەدا (نحن) مبتدایەو خبرەکەی حذف کراوە کەبریتیە لە(راضون )واتا (نحن راضون).

[١] مەبەست ئەوەیە ئەو نموونانەی باسکران بۆ حذف کردنی خبر و حذف کردنی مبتدا حذف کردنێکی جائیزە وەکو باسمان کرد ، واتا : دەتوانین حذف کراو باس کەیت و دەتوانی باسی نەکەیت و حذفی کەیت.

[٢] ئایەتی ژمارە (٤٦) ی سورەتی (فصلت) کورتەی مانای ئایەتەکە (هەرکەسێ کاری چاکە بکات ئەوە کارە چاکەکەی و پاداشتی کارەکەی بۆ خۆیەتی ، هەرکەسێکیش خراپە بکات زیانەکەی بۆ خۆیەتی)

إعرابی تەواوی ئایەتەکە بە م شێوەیە : مَنْ : اسم شرط مبني على السكون في محل رفع مبتدا .

عَمِلَ : فعل ماضي مبني على الفتح ، و فاعله ضمير مستتر تقديره (هو) و (عمل) فعل الشرط .

صَالِحاً : مفعول به . و الجملة الفعلية (عمل صالحاً) في محل رفع خبر لـ (مَنْ) .

فَلِنَفْسِهِ : فـ : رابطة لجواب الشرط . لنفسه : جارو مجرور متعلقان بمحذوف خبر لمبتدا محذوف و التقدير (فعمله لنفسه) وهذا جواب الشرط . و إعراب (وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا) مثل الإعراب السابق اي مثل (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ).

[٣] واتا / لەم ئایەتە پیرۆزەدا لە هەردوو ڕستەکەدا (مبتدا) حذف کراوە.

يَحِضْنَ﴾[١] واتا (فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ )[٢] ، جا لێرەدا مبتداو خبرەکە حذف کراوە کە بریتیە لە ( فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ )، چونکە پێشتر باسکراوە ، جا بۆیە پێکەوە حذف کراون چونکە لە شوێنی (مفرد) دان[٣] ، ئەوەی دیارو ئاشکراش بێت ئەوەیە کە حذف کراو مفردە[٤] و تقدیرەکەشی دەبێتە

---

[١] ئایەتی ژمارە (٤)ی سورەتی (الطلاق) کورتەی ماناکەی (ئەو ئافرەتانەی کە بێ هیوا دەبن لە کەوتنە حەیزەوە لە ژنانتان ئەگەر دوو دڵ بوون _دەربارەی زانینی عیدەیان _ ئەوا عیدەیان سێ مانگە ، هەروەها ئەوانەشی _ کەلەبەر منداڵی_ هێشتا حەیزیان پیا نەهاتووە...)

إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیە : وَاللَّائِي : و / حرف عطف . اللَّائِي: اسم موصول مبني في محل رفع مبتدا. يَئِسْنَ :فعل مضارع مبني على السكون لاتصاله بنون النسوة. نَ : نون النسوة / ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل . و الجملة الفعلية (يَئِسْنَ) لا محل لها من الإعراب صلة الموصول . مِنَ الْمَحِيضِ : جارومجرور متعلقان بـ (يَئِسْنَ) . مِنْ نِسَائِكُمْ : جارومجرور متعلقان بحال من فاعل يَئِسْنَ. و نِسَاء : مضاف. كُمْ : ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه . إِنْ : شرطية جازمة . ارْتَبْتُمْ : فعل ماضي مبني على السكون في محل جزم فعل الشرط . تُمْ : ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل . و الجملة الفعلية (إِنِ ارْتَبْتُمْ) في محل رفع خبر المبتدا . فَعِدَّتُهُنَّ : فـ: رابطة لجواب الشرط . عِدَّة : مبتدا مرفوع وهو مضاف . (هُنَّ) في محل جر مضاف إليه . ثَلاثَةُ : خبر مرفوع ، وهو مضاف . أَشْهُرٍ : مضاف إليه مجرور . وَاللَّائِي : و : حرف عطف .اللَّائِي : اسم موصول مبني في محل رفع مبتدا . لَمْ : حرف نفي و جزم و قلب . يَحِضْنَ : فعل و فاعل . و الجملة الفعلية (يَحِضْنَ) لا محل لها صلة الموصول . بەڵگەی ئەم ئایەتە لێرەدا _ وەکو ابن عقيل لە شەرحەکەدا ئاماژەی پێکردووە _ بریتیە لە حذف کردنی جملەیەکی اسمی کە تقدیرەکەی دەبێتە (فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ) چونکە پێشتر باسکراوە.

[٢] کەواتە ئەم ڕستەیە وەڵامی ڕستەی (وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ)ە يە.

[٣] مەبەست ئەوەیە کە جملەی حذفکراوی (فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ) لە جێی مفردێکە تقدیرەکە دەبێتە (کذلك) وەکو ابن عقيل باسی کردووە.

[٤] کەواتە لەم ئایەتە پیرۆزەدا جملە حذف نەکراوە بەڵکو مفردێك کە دەبێتە خبر حذف کراوە.

(وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ كذلك)[١] ، جا فەرموودەی (وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ) عطف كراوەتەوە بۆ سەر (وَاللَّائِي يَئِسْنَ) ، كەواتە باشتر وايە[٢] نموونە بهێنرێتەوە بە وێنەی (نعم) لەوەلأمی (أزيدٌ قائم؟) چونكە تقديرەكە دەبێتە (نعم زيدٌ قائمٌ )[٣].

* باسی ئەو شوێنانەی كە واجبە خبر تيایاندا حذف كرێت:

| | |
|---|---|
| ١٣٨_وَبعْدَ لَوْلاَ غَالِبًا حَذْفُ الْخَبَرْ | حَتْمٌ وَفِي نَصٍّ يَمِينٍ ذَا اسْتَقَرّْ |
| ١٣٩_وَبَعْدَ وَاوٍ عَيَّنَتْ مَفْهُومَ مَعْ | كَمِثْلِ كُلُّ صَانِعٍ وَمَا صَنَعْ |
| ١٤٠_وَقَبْلَ حَالٍ لايَكُونُ خَبَرَا | عَنِ الَّذِي خَبَرُهُ قَدْ أُضْمِرَا |
| ١٤١_كَضَرْبِي العَبْدَ مُسِيئًا وَأَتَمّْ | تَبْيِينِيَ الْحَقَّ مَنُوطًا بِالْحِكَمْ.[٤] |

[١] واتا / ئەو ئافرەتانەی كە هێشتا حەيزيان پيا نەهاتووە ئەوانيش وان واتا وەكو ئەوانەی كە پێشتر ئايەتەكە باسی كردوون.

[٢] مەبەست ئەوەيە كە بەڵگە هێنانەوە بەو ئايەتە پيرۆزە بۆ حذف كردنی مبتداو خبر تەواو نيە بەڵكو تەنها مفردێك حذف بووە كە بريتيە لە (كذلك).

[٣] كەواتە : لێرەدا مبتداو خبر حذف كراون . ئەم نموونەيە گونجاوە بۆ هێنانەوەی حذف كردنی مبتداو خبر لە ڕستەدا.

[٤] كورتەی مانای ئەم چوار دێڕە بەم شێوەيە : (١٣٨) لە دوای حەرفی (لولا)وە بە زۆری وايە خبری مبتدا حذف دەكرێت بە واجبی ، هەروەها _حذف كردنی خبر واجبە _ ئەگەر مبتداكە ووشەيەك بێت تەنها بۆ سوێند خواردن بە كاربێت .

(١٣٩) هەروەها _ حذف كردنی خبر واجبە_ لە دوای (واو) يێك كە بۆ لەگەڵ دا بوون (معية) بە كاربێت وەكو نموونەی (هەموو خاوەن كارێك و كارەكەی) لێرەدا (كل) مبتدايەو خبرەكەی محذوفە كەلە دوای (واو) ی معيەوە حذف كراوەو تقديرەكەی (كل صانع و صنعتهُ مقترنان) وەكو دواتر لە شەرحەكەدا ڕوون دەبێتەوە .

(١٤٠) هەروەها _حذف كردنی خبر واجبە _ ئەگەر مبتداكە مصدر بێت و لە دوايەوە (حال) هاتبێت و ئەو حاڵەشی نەگونجێت بۆ ئەوەی ببێتە خبر .-

پوختەی مانای ئەم چەند دێڕە ئەوەیە کە خبر واجبە حذف کرێت لە چوار شوێندا:

یەکەم: ئەگەر خبر بێت بۆ مبتدایەك کە لە دوای (لولا)[١] ەوە هاتبێت ، وەکو (لولا زيدٌ لأتيتُكَ)[٢] ، تقديری ئەم ڕستەیە (لولا زيدٌ موجودٌ لأتيتُكَ) جا خۆی پاراست بە وتەی ( غالباً )[٣] لەوەی کە هاتووە باس کردنی خبر لە دوای (لولا) ەوە بەشازی ، وەکو وتەی :

ش٥٦/ لَوْلاَ أَبُوكَ وَلَوْلاَ قَبْلَهُ عُمَرٌ   أَلْقَتْ إِلَيْكَ مَعَدٌّ بِالْمَقَالِيدِ[٤].

لێرەدا (عمر) مبتدايەو (قبله) خبرەو پێشكەوتووە .

جا ئەوەی کە دانەر باسی کرد لەم کتێبەدا [٥] _ لەوەی کە حذف کردنی خبر لە دوای (لولا) ەوە واجبە مەگەر بە کەمی نەبێت_ ئەوە ڕاو بۆچوونی هەندێ لە زانایانە ، ڕاو بۆ چوونی دووەم : ئەوەیە کە حذف کردنی خبر لە

---

- (١٤١) وەکو (لێدانم لە بەندەکە چونکە خراپە کار بوو) هەروەکو (تەواو ترین ڕوونکردنەوەم حەق وڕاستە چونکە پەیوەستە بە حکمەت و داناییەوە).

[١] پێشتر باسمان کرد کە حەرفی (لولا) بۆ سێ شت بەکاردێت ، ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە کە لولا بۆ ڕوونەدانی شتێکە لەبەر بوونی شتێکی تر (حرف امتناع لوجود).

[٢] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە : لولا : حرف امتناع لوجود مبني على السكون لا محل له من الإعراب. زيدٌ : مبتدأ مرفوع ، و خبره محذوف تقديره (موجودٌ) لأتيتُكَ: لَ : واقعة في جواب لولا . أتي : فعل ماضي مبني على السكون لاتصاله بتاء الفاعل . تُ : ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل . كَ : ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به.

[٣] (غالباً) واتا بەزۆری.

[٤] مانای ئەم دێڕە بەم شێوەیە: ئەگەر باوکت نەبووایەو پێش ئەویش عومەری باپیرت نەبووایە ، ئەوە هەموو نەوەی معد ملکەچ دەبوون بۆت . بەڵگە (شاهد) ی ئەم دێڕە : باس کردنی خبر لە دوای (لولا) ەوە بە شازی.

[٥] واتا / لە کتێبی ئەلفیەدا.

دوای (لولا)ەوە واجبەو ئەگەر ڕستەیەك هاتوو خبر تیایدا حذف نەکرابوو ئەوە دەبێت تأویل بکرێت[١] ، ڕاو بۆ چوونی سێ یەم : ئەوەیە کە خبر:یان بوونی گشتی و ڕەهایە[٢] ، یان بوونی تایبەتە[٣]، جا ئەگەر مانای گشتی و ڕەها بێت ئەوە واجبە حذف کرێت وەکو ( لولا زیدٌ لکان کذا ) واتا : لولا زیدٌ موجودٌ[٤] ، بەڵام ئەگەر ماناکەی تایبەت بێت ئەوەیان بەڵگە هەیە لە سەر حذف کردنی یان بەڵگە نیە لەسەری ، جا ئەگەر بەڵگە نەبێت لەسەر حذف کردنـــــی ئەوە واجبە خبرەکە بـــــاس کرێت وەکـــــو (لولا زیدٌ محسنٌ إلـيَّ مـــــا اتیـتُ)[٥]، بەلام ئــــــەگـــــــەر بەڵگـــــــە هەبێت لەسەری[٦] ئەوە دروستـــــــە باسکرێت و دروستیشە حذف کرێت وەکو

---

[١] تأویل : ئەوەیە کە شت لە مانای ئاشکرا (ظاهر) ەوە ببرێت بۆ مانایەکی دوور تر ، جا ئەگەر بەڵگە هەبێت بۆی ئەوە دەبێتە (تأویل صحیح) بەڵام ئەگەر بێ بەڵگەو پاسا بێت ئەوە دەبێتە (تأویل فاسد).

[٢] مەبەست لە بوونی گشتی ڕەها (کون العام المطلق) ئەوەیە کە خبرەکە بە (موجودٌ) تقدیر کرێت ، دیارە (موجود) کەبەمانای (بوون) دێت گشتی یەو تایبەت نیە بە حاڵەتێکەوە و ڕەهایە.

[٣] مەبەست لە بوونی تایبەت (کون المقید أو الخاص) ئەوەیە کە تقدیرەکە واتە تقدیری خبرەکە بە شتێکی تایبەت دەکرێت وەکو (محسنٌ) لەو ڕستەی هێنراوەتەوە ، یان وەکو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت (لَوْلَا قَوْمُكِ حَدِيثٌ عَهْدٍ بِالْكُفْرِ لَنَقَضْتُ الْكَعْبَةَ...) .لێرەدا خبرەکە بریتیە لە (حَدِيثٌ عَهْدٍ ) کە بوونی شتێکی تایبەتە بۆیە حذف نەکراوە.

[٤] لەم ڕستەیە تقدیری خبرەکە بە (موجودٌ) دەکرێت بۆیە بوونێکی گشتی یەو تایبەت نیە بە حاڵەتێکەوە.

[٥] لێرەدا خبرەکە بریتیە لە (محسنٌ) کە مانایەکی تایبەتە بۆیە بە پێی ڕای سێیەم دروست نیە خبرەکە حذف کرێت.

[٦] واتا لەسەر خبرە حذف کراوەکە.

ئەوەی بوترێت : هل زیدٌ محسنٌ إلیك ؟ تۆش لـــــــەوەلاّمدا دەڵێت : (لولا زیدٌ لهلَكْتُ) واتا (لـــــولا زیـدٌ محسنٌ إلـيَّ) جا ئـەتوانی خبرەکە حذف کەیـــــت و دەتوانی حذفی نەکەیت و جێگیری کەیت ، وەکو ووتـەی (أبـي العلاء المعري)[1] کە دەڵێت:

ش٥٧ / يُذِيبُ الرُّعْبُ مِنْهُ كُلَّ عَضْبٍ    فَلَوْلاَ الْغِمْدُ يُمْسِكُهُ لَسَالاَ [2].

جا دانەر ئەم ڕاو بۆچوونەی [3] هەڵبژاردووە لە غەیری ئەم کتێبەدا.

شوێنی دووەم[4] :ئەگـــەر مبـــتداکە دەق بوو[5] لە سوێـــند خـــواردنـــدا، وەکـو ( لعمـرك لأفعلـنَّ ) [6] تقدیرەکـەی (لعمـرك قـسمي) لێـرەدا (عمـرك) مبتدایـەو قسمي : خبرە بۆی و دروست نیە باسکرێت و دەبێت حذف کرێت.

---

[1] ابو العلاء ناوی تەواوی (أحمد بن عبدالله بن سليمان)ە و یەکێکە لە شاعیرو فەیلەسوفە گەورەکانی سەردەمی عەباسیەکان ساڵی ٣٦٣ك لە سوریا لە دایك بووە و ساڵی ٤٤٩ك کۆچی دوای کردووە. جا شیعرەکانی أبو العلاء ناکرێنە بەڵگە (شاهد) ی نحوی چونکە شاعیری سەردەمی عەباسیەکانەو ئەم دێڕەی ئێرەشی وەکو نموونە (تمثیل) هێنراوەتەوە.

[2] ئەم دێڕە شیعرە ماناکەی : ئەتوێنێتەوە ترس لەو هەموو شمشێرێکی بڕندە ٬ جا ئەگەر کێلانی شمشێرەکان نەبوونایە ئەوە هەموو شمشێرەکانی دەتووانەوە بە هێزی و توندی ئەو . لێرەدا خبرەکە بریتیە لە (یمسکه) باسکراوە چونکە بوونێکی تایبەتەو ڕەهاو گشتی نیە.

[3] واتا / ڕاوو بۆ چوونی سێ یەم دەربارەی حذف کردنی خبری لولا.

[4] شوێنی دووەم لەو چوار شوێنەی خبری تێدا حذف دەکرێت بە واجبی.

[5] مەبەست ئەوەیە ئەو ووشەیە تەنها بۆ سوێند خواردن بەکاربێت وەکو (عَمْرُكَ).

[6] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە :لعمرك: لَ :موطئة للقسم . عَمرُ : مبتدا مرفوع. وهو مضاف . كَ : ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه ، و خبره محذوف تقديره (قسمي) لأفعلَنَّ : لـ : واقعة في جواب قسم . أفْعَل: فعل مضارع مبني على السكون لاتصاله بنون التوكيد ، و فاعله ضمير مستتر تقديره (انا) .-

وە ووتـــــراوە : وەکو ئـــــەمە[١] وایە (یمینُ اللە لأَفْعلَـــنَّ) تقدیرەکـــــەی (یمینُ اللەِ قسمي) بــــەڵام ئەمـە[٢] .مەرج نیە ، حذف کراوەکەی خبر بێت بەڵکو دروستە حذف کراوەکە مبتدا بێت و تقدیرەکەشـی (قسمي یمینُ اللە) بە پێچەوانەی (لعمرك) کە بێگومان حـذف کراوەکـەی دەبێـت خـبر بێـت ، چونکە (لعمرك) لامی ابتدای چۆتە سەرو لامی ابتداش دەچێتە سەر مبتدا.
جا ئەگەر مبتداکە دەق نەبوو لەسەر سوێند خواردن [٣] ئەوە واجب نیە حذف کردنی خبرەکە وەکو (عهدُ اللهِ لأَفْعَلَنَّ) تقدیرەکەی (عهدُ اللهِ عليَّ) [٤] لێرەدا عهدُ الله : مبتدایەو عليَّ [٥]: خبرە بۆی ، جا دەتوانی ئەم خبرە حذف کەیت و دەتوانی باسی کەیت .
شوێنی سـێ یـەم : ئەگەر لـە دوای مبتداکـەوە (واو) ێك هـات و ئـەو واوە تـەنها بـۆ لەگەڵـدا بـوون (معیـة) بـەکاربێت وەکـو (کـلُّ رجـلٍ وضـیعتُهُ) لێـرەدا (کُـلُّ) مبتدایـەو (ضـیعتُهُ) معطوفـە بـۆ سـەر (کل) و خبرەکەشـی [٦] حـذف کـراوەو تقدیرەکـەی( کـلُّ رجلٍ وضـیعتُهُ مقترنان )[٧] دیارە خبرەکەشی لە دوای واوی معیتەکەوە دادەنرێت .

---

=مانای ئەم ڕستەیە دەبێتە(بە گیانت قەسەم) دیارە ئەم سوێند خواردنە بەپێی فەرموودە صحیحەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) حەرامەو دروست نیە.
[١] واتا وەکو (لعمرك) وایە.
[٢] واتە : (یمین اللهِ).
[٣] واتا ووشەیەك بێت کە بگوبجێت بۆ سوێند خواردن و بۆ غەیری سوێند خواردنیش.
[٤] ووشەی (عهد الله) واتا (پەیمانی خوا) تاوەکو (لأفعلَنَّ) لە دوایەوە نەبێت ئەوە سوێند نیە.
[٥] دیارە (عليَّ) جارومجرورە و متعلقە بە حذف کراوێك کە ئەو حذف کراوە خبرە ، وەکو لە دێری ژمارە (١٢٣)ی ئەلفیەدا باسکرا.
[٦] واتا خبری (کلّ) حذف کراوە.
[٧] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە : کلُّ : مبتدا مرفوع ، وهو مضاف . رجل : مضاف إلیه مجرور . و : حرف عطف للمعیة . ضیعتُهُ : اسم معطوف علی (کل) . مقترنان : خبر مرفوع و علامة رفعه الألف لأنه مثنی.

وە ووتراوە : ئەم ڕستەیە [(١)] پێویستی بە تقدیركردنی خبر نیە چونكە مانای (كلُّ رجلٍ وضیعتُهُ) واتا هەموو كەسێك لەگەڵ ئیش و كارو پیشەكەیدایە (كلُّ رجلٍ مع ضیعته) ، ئەمەش قسەو ڕستەیەكی تەواوەو پێویستی بە تقدیر كردنی خبر نیە ، ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە (ابن عصفور)[(٢)] لە كتێبی (شرح الإیضاح) دا .

بەڵام ئەگەر واوەكە دەق نەبوو لەسەر (معیە )[(٣)] ئەوە واجب نیە حذف كردنی خبرەكە وەكو ( زیدٌ و عمروٌ قائمان )[(٤)] .

شوێنی چوارەم : ئەگەر مبتداكە (مصدر )[(٥)] بێت و لەدوایەوە (حال ) [(٦)]هاتبێت و ئەو حالەش نەگونجێت بۆ ئەوەی ببێتە خبر ، ئەوە واجبە خبرەكە حذف كرێت چونكە حالەكە جێی دەگرێت ، ئەوەش وەكو (ضربي العبد مسیئاً) لێرەدا ضربي: مبتدایەو و العبدَ : معمولی ضربي[(٧)]، و مسیئاً : حالەو

---

[(١)] واتا : ڕستەی (كل رجلٍ و ضیعته).

[(٢)] ناوی تەواوی (ابن عصفور) : (علي بن مؤمن بن محمد) ەو ساڵی ٥٩٧ك لە دایك بووە و ساڵی ٦٦٩ك كۆچی دوای كردووە.

[(٣)] واتا : ئەگەر بۆ (معیة) و بۆ شتی تریش بێت وەكو هاوبەشی (التشریك) كردن بۆ نمونە.

[(٤)] لێرەدا (قائمان) خبرەو حذف نەكراوە چونكە واوەكە بۆ معیە نیە بەڵكو بۆ بەشداری كردنی هەردووكیانە لە حوكمەكەدا.

[(٥)] (مصدر) كەبە كوردی دەبێتە چاووگ بریتیە لە (الحدث المجرد عن الزمان) واتا مانایەكە خالیە لە كات . جا بابەتی مصدر بابەتێكی گرنگە لە ڕێزمانی زمانی عەرەبیدا بە تفصیل لە زانستی (الصرف) دا دەخوێنرێت.

[(٦)] (حال) یەكێكە لەو ناوانەی كە پێیان دەوترێت (المنصوبات) كە دواتر لە بابەتەكانی داهاتوودا بە تفصیل باس دەكرێت _ إنشاالله تعالى – .

[(٧)] چونكە (ضَرْب) مصدرەو عملی فعل دەكات و پێویستی بە فاعل و مفعول بە هەیە ،جا جێناوی لكاوی (ي) لە ماناد فاعلی (ضَرْب) و (العبدَ) دەبێتە مفعول بە بۆ (ضرب).

جێـی خـبری گرتـووە ، خبرەكـەش حـذف كـراوە بـە واجبـی و تقدیرەكەشـی (ضـربي العبـد إذا كـان مـسيئاً ) ئەگـەر مەبەسـتت داهـاتوو (الاستقبال )[1] بێـت ، بەڵام ئەگەر مەبەستت ڕابـردوو بێـت ئەوە تقدیرەكەی دەبێتە (ضربي العبد إذْ كان مسيئاً) كەواتـە مسيئاً: حالە لە جێناوی شاراوەی فعلی (كـان) كە ووشـەی (العبـد) تەفسيری ئـەو جێناوە دەكـات وە (إذا كـان) یـان (إذْ كـان) دەبێتـە ئاوەڵفرمـانی كاتی (ظرف زمان) و لە جێی خبرەكەیە.
جا دانەر ئاگاداری دا بە ووتـەی (وقبل حـال) بۆ ئـەوەی كە بێگومـان خبرە حـذف كراوەكـە دادەنرێـت لـە پـێش حالەكـەوە ئەو حالـەی كە جێـی خـبر دەگرێت وەكو باسكرا.هەروەها خۆی پاراست بە ووتەی (لا يكـون خـبرا )[2] لەو جۆرە حالـەی كە دەگونجێت ببێتـە خبر بۆ ئەو مبتدایـەی باسـكرا[3] ، وەكـو ئـەوەی گێڕایەتیـەوە _ ئەخفـەش _ ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت _ لـە قسەی عەرەبەوە (زيدٌ قائماً) لێرەدا زيدٌ : مبتدایەو خبرەكەی حذف كراوە و تقدیرەكەشی دەبێتە (ثَبَتَ قائماً)[4] جا ئەم حالە گونجاوە بۆ ئەوەی ببێتـە خبرو دەڵێیت(زيدٌ قائمٌ) كەواتە خبر لێرەدا واجب نیە حـذف كردنـی[5] ، بە

---

[1] چونكە (إذا ) ظرفە و بۆ داهاتوو (الإستقبال) بەكاردێت ، بەڵام (إذ) ظرفە و بۆ ڕابردوو (ماضي) بەكاردێت.
[2] مەبەست ووتەی ابن مالكە لە دێڕی (١٤٠) ی ئەلفیە.
[3] واتا : مبتدایەك كە مصدر بێت و لە دوایەوە (حال) باسكرا بێت.
[4] كەواتە (ثَبَتَ) فعل و فاعلە دەبێتە جملەی فعلی و لە محلی رفعی خبر دایە .و (قائماً) دەبێتە حال بۆ فعلی (ثَبَتَ).
[5] چونكە دەگونجێت بڵێی (زيدٌ قائمٌ) واتا ناوی (قائم) گونجاوە بۆ ئەوەی ببێتە حال و گونجاویشە بۆ ئەوەی ببێتە خبر.

پێچەوانەی (ضربي العبد مسيئاً) لێرەدا حاڵەكەی گونجاو نيە[١] بۆ ئەوەی ببێتە خبر بۆ مبتداكەی پێش خۆی و دروست نیە بڵێیت (ضربي العبد مسيءٌ ) چونكە لێدان وەصف ناكرێت بەوەی خراپەكار (مسیء) ە .

هەروەها ئەو ناوەشی إضافە دەكرێت بۆ لای ئەو مصدرەی باسكرا [٢] حوكمەكەی وەكو حوكمی مصدر وایە ، وەكو (أتمُّ تبييني الحقَّ منوطاً بالحكم)[٣] لێرەدا أتَمُّ : مبتدايەو مضافە و تبيني : (مضاف إليه) و والحقَ دەبێتە مفعولی (تبيين)[٤] ، و منوطا : دەبێتە حال و لە جێی خبری (أتمُّ) ە و تقديری ڕستەكەشی دەبێتە( أتمُّ تبييني الحقَّ إذا كان _او إذ كان _ منوطاً بالحكم )[٥] .

* باسی ئەو شوێنانەی كە واجبە مبتدای تێدا حذف كرێت (مواضع التي يجب فيها حذف المبتدا)

دانەر[٦] باسی ئەو شوێنانەی نەكرد كە مبتدای تێدا حذف دەكرێت بە واجبی[٧] ، بەڵام لە غەيری ئەم كتێبەدا[٨] چوار شوێنی باسكردووە :

---

[١] چونكە خبر جۆرێكە لە وەصفكردن بۆ مبتدا جا (مسيء) كە واتای (خراپەكارە) دەبێتە صفەت بۆ عەبد بەڵام نابێتە صفەت بۆ (ضَرْب).

[٢] واتا : مصدرێك كە دەبێتە مبتدا.

[٣] لەم ڕستەيەدا (أتمُّ) مصدر نيە بەڵام مضافە بۆ لای مصدر كە بريتيە لە (تبيين).

[٤] چونكە (تبيين) مصدرەو پێويستی بە فاعل و مفعولە وەكو فعل.

[٥] كەواتە مانای ڕستەكە دەبێتە (تەواو ترين ڕوونكردنەوەم بۆ حەق هەيە چونكە پەيوەستە بە حكمەت و دانای).

[٦] واتا (ابن مالك).

[٧] مەبەست لە حذف كردنی واجب ئەوەيە دروست نيە ئاشكرا كرێت.

[٨] لە كتێبی (الكافية الشافية) دا كە دانراوی (ابن مالك) ە كتێبی ئەلفيەش پوختەی كتێبی (الكافية الشافية)يە.

یەكـەم : سیـفـەتێـك كـە دابـڕابێـت لە إعـرابـدا لە پـێش خـۆی [(١)] بۆ مـدح كردن وەكـو (مـررْتُ بـزیدِ الـكریمُ ) [(٢)] یان بۆ زەم كردن وەكو (مَرَرْتُ بزیدِ الخبیثُ) [(٣)] ، یان بۆ بەزەی پیا هاتنەوە وەكو (مَرَرْتُ بزیدِ المسكینُ) [(٤)] لەم نموونانەو هاوشێوەكانیاندا مبتدا حذف كراوە بە واجبی و تقدیرەكەیان(هو الكریمُ، وهو الخبیثُ، وهو المسكینُ).

شوێنی دووەم : ئەگەر تایبەت كراو (مخصوص) ی (نعم)و (بئس) [(٥)] بێت وەكو (نعمَ الرجلُ زیدٌ [(٦)] وبئس الرجلُ عمروٌ) لێرەدا زیدٌ و عمروٌ : دەبنە

---

(١) چونكە سیفەت (النعت) جۆرێكە لە (التوابع) واتا ئەو ناوانەی كە پێش خۆیان دەكەون لە إعرابدا ، بەڵام سیفەت هەندێ جار دروستە لە پێش خۆی دابڕێت وەكو ئەو نموونانەی باس دەكرێن.

(٢) إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە : مررْتُ: فعل و فاعله بزیدِ جارومجرورە و الكریمُ : خبر مبتدأ محذوف وجوباً تقدیره (هو الكریمُ) . جا مەبەست لەم (نعت) ە لەم ڕستەیە مدح كردنی زیدە.

(٣) لەم ڕستەیەش (الخبیثُ) سیفەتەو بۆ زەمكردن بەكاردێت و إعرابەكەشی وەكو پێشووتر وایە.

(٤) لێرەشدا (المسكینُ) سیفەتەو بۆ بەزەیی پێدا هاتن (الترحم) بەكارهاتووەو إعرابەكەشی دیارە.

(٥) لە زمانی عەرەبیدا بە فعلی (نعم) و (بئس) دەوترێت (فعلی مدح و ذم) جا دیارە لە مدح كردندا كەسێك تایبەت دەكرێت بەو مدحەو پێی دەوترێت (مخصوص بالمدح) هەروەها لە زەمیشدا پێی دەوترێت (مخصوص بالذم) لە باسەكانی داهاتوودا بە تفصیل باس دەكرێت إنشاالله.

(٦) إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە : نعم : فعل ماضي مبني على الفتح لإنشاء المدح . الرجلُ : فاعل مرفوع . زیدٌ : خبر لمبتدأ محذوف ، و یجوز أن تعرب جملة (نعم الرجل) في محل رفع خبر مقدم . و زیدٌ : مبتدأ مؤخر.

خبر بۆ مبتدایەکی محذوف کە نابێت باسکرێت و تقدیرەکەشی (هو زیدٌ) واتا مەدح کراو (زید) ە (و هو عمروٌ) واتا زەمکراو (عمروٌ) ە.

<u>شوێنی سێ یەم</u> : ئەوەیە کە گێڕایەتیەوە (فارسی )[1] لە قسەی عەرەبەوە (فِي ذمتي لأَفعلنَّ) لێرەدا فِي ذمتي خبرە بۆ مبتدایەکی محذوف کە واجبە حذف کردنی وتقدیرەکەشی دەبێتە (فِي ذمتي يمينٌ)[2] هەروەها هاوشێوەی ئەم ڕستەیەش[3] ، کە ئەویش بریتیە لەوەی کە خبر تێیدا ڕاستەوخۆ بۆ سوێند خواردن بەکاردێت .

<u>شوێنی چوارەم</u> : ئەگەر خبرەکە مصدرێك بێت لە جێی فعل دانشت بێت[4] ، وەکو (صبرٌ جميلٌ) تقدیرەکەی (صبري صبرٌ جميل) کەواتە صبری: مبتدایەو .

صبرٌ جميل: خبرێتی[5] ، بەڵام مبتداکە حذف کراوەکە بریتیە لە (صبري) بە واجبی .

** ** **

---

[1] مەبەست پێی زانایانی ناودار (حسن بن أحمد بن عبدالغفار الفارسي) يە كە پێشتر باسمان كرد.

[2] واتا : يمينٌ : مبتدايەكی حذف كراوە و دواكەوتووە چونكە نەناسراوە.

[3] واتا ڕستەی (فِي ذمتي لأفعلَنَّ).

[4] مەبەست ئەوەیە لە جیاتی ئەوەی فعل باسکەیت مصدرەکەی باس دەکەیت ، واتا: (صبرٌ) لە جێی (اصبرْ)ە.

[5] دیارە صبرٌ : خبرەو جميلٌ : صفەتە.

* باسی فرە خەبەری (تعدد الخبر)

١٤٢_ وَأَخْبَرُوا بِاثْنَيْنِ أَوْ بِأَكْثَرَا     عَنْ وَاحِدٍ كَهُمْ سَرَاةٌ شُعَرَا [(١)].

زانایانی نحو خیلافیان هەیە دەربارەی دروستێتی فرە خبری بۆ یەك مبتدا بەبێ حەرفی عطف وەکو (زیدٌ قائمٌ ضاحكٌ) هەندێکیان لەوانە دانەر[(٢)] پێیان وایە دروستە ، جا ئەگەر ئەو دوو خبرە لە مانادا یەك بن[(٣)] ، وەکو (هذا حُلْوٌ حامض)[(٤)] واتا مزرە ، یان یەك نەبن وەکو نموونەی یەکەم[(٥)] ، بەڵام هەندێکی تریان پێیان وایە فرە خبری دروست نیە مەگەر هەردوو خبرەکە لە مانادا یەك بن ، بەڵام ئەگەر لەمانادا یەك نەبن ئەو کات پێویستە حەرفی عطف بکرێتە نیوانیان ، جا ئەگەر لە زمانی عەرەبیدا شتێکی وا هات[(٦)] بەبێ حەرفی عطف ئەوە دەبێت بۆ خبری دووەم مبتدایەکی نادیار دابنرێت، وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ [(٧)]﴾وە وەکو ووتەی شاعیر :

---

(١) پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە : دروستە خەبەر دان لەیەك مبتدا بە دوو خبر یان زیاتر وەکو (ئەوان بەرێزن و شاعیرن) لەم ڕستەیە (هم) مبتدایەو (سراةٌ) و (شعراء) دوو خبرن بۆی.

(٢) واتا : ابن مالك.

(٣) واتا : بە هەردوو خبرەکەوە یەك مانایان هەبێت.

(٤) لەم ڕستەیەدا (هذا) في محل رفع مبتدا . حلوٌ حامض: دەبنە دوو خبر بۆ (هذا).

(٥) نموونەی یەکەم واتا : (زیدٌ قائمٌ ضاحِك) کە هەردوو خبرەکە جیاوازن.

(٦) واتا دوو خبریان زیاتر بە دوای یەك مبتدا دا هاتن.

(٧) ئایەتی (١٤و ١٥) ی سورەتی (البروج) . کورتەی ماناکەی (هەر ئەوە لێخۆشبووی خاوەنی خۆشەویستی بۆ بەندەکانی ، وە خاوەنی عەرش و بەرزو پایەدارە). إعرابی تەواوی ئەم دوو ئایەتە : وَهُوَ :و حرف عطف . هُوَ : ضمير منفصل مبني في محل

ش٥٨/ مَنْ يَكُ ذَا بَتٍّ فَهَذَا بَتِّي     مُقَيِّظٌ مُصَيِّفٌ مُشَتِّي.[١]

هەروەها وەکو ووتەی :

ش٥٩/ يَنَامُ بِإحْدَى مُقْلَتَيْهِ وَيَتَّقِي     بِأُخْرَى الْمَنَايَا فَهْوَ يَقْظَانُ نَائِمُ.[٢]

وە هەندێکی تریان[٣] ووتویانە دروست نیە فرە خبری مەگەر هەردووکیان لەیەك ڕەگەز (جنس) بن وەکو ئەوەی هەردووکیان تاك (مفرد) بن بۆ نموونە وەکو (زيدٌ قائمٌ ضاحك) یان هەردووکیان ڕستە (جملە) بن وەکو (زيدٌ قامَ ضَحِك) بەلاّم ئەگەر یەکێکیان تاك بێت و ئەوی تریان ڕستە بێت ئەوە دروست نیە کەواتە دروست نیە بڵێت (زيدٌ قائمٌ ضَحِكَ) ، بەم شێوەیان ووتووە ئەم بۆ چوونە[٤] ، بەلاّم ڕوو دەدات لە قسەی إعراب کارانی قورئان

---

-رفع مبتدا . الْغَفُورُ : خبر مرفوع . الْوَدُودُ : خبر لمبتدا محذوف و التقدير (هُوَالْوَدُودُ). ذُو: خبر لمبتدا محذوف و هو مضاف . الْعَرْشِ : مضاف إليه مجرور . الْمَجِيدُ : خبر لمبتدا محذوف . و يجوز أن يكون صفة للعرش مجروراً.

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە شیعرە بەم شێوەیە : هەر کەس خاوەن پۆشاکی خوری ئەستور بێت ئەوە منیش ئەمە پۆشاکە خورییەکەمە کە پارێزەرە بۆ گەرماو هاوین و سەرماش _ واتا بۆ هەموو وەرزێك بەکاردێت.

بەڵگەی ئەم دێرە: لێرەدا (بتی) مبتدایەو سێ خەبەری هەیە ، بەلاّم لای هەندێ لە زانایان خبری دووەم و سێ یەم (مصيف) و (مشتی) نابنە خبری (بتی) بەڵکو دەبنە خبر بۆ مبتدایەکی محذوف.

[٢] مانای ئەم دێرەش بەم شێوەیە : باسی کەروێشك دەکات و دەڵێت : دەنوێ بە یەکێك لە چاوەکانی و بەوی تریش خۆی دەپارێزێ لە مەرگ _ واتا لەوەی ببێتە نێچیر _ جا ئەو بەئاگاو نووستووە.

بەڵگەی ئەم دێرە : (يقظان نائمٌ) هەردووکیان خبرن بۆ یەك مبتدا کە بریتیە لە (هو) ئەمەش ڕای زۆربەیانە.

[٣] واتا : ئەمە ڕای سێ یەمە.

[٤] واتا : بۆ چوونی سێ یەم.

دروستی ئەمە[1] بە زۆری ، وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿ فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى ﴾[2] بە دروستیان زانیوە (تَسْعَى) ببێتە خبری دووەم ، بەڵام مەرج نیە چونکە دەگونجێت حال بێت.[3]

## تێبینی : لێرەدا کۆتایی بە بەشی یەکەمی کتێبەکە هات إن شاء الله-بەشی دووەم لە بابەتی ( کان وأخواتها ) دەست پێدە دەکەین

(1) واتا : دروستی ئەوەی کە دوو خبر هەبێت یەکێکیان مفرد بێت و ئەوی تریان جملە بێت.

(2) ئایەتی ژمارە (٢٠) ی سورەتی (طە) کورتەی ماناکەی (کتوپڕ _ گۆچانەکەی پێغەمبەر موسی علیە الصلاة و السلام_ بوو بە مارێك و بە خێرای دەڕۆشت) إعرابی تەواوی ئەم ئایەتە بەم شێوەیە :فَإِذَا : فَ : استئنافیة . إِذَا: ظرفیة زمانیة غیر جازمة. هِيَ : ضمیر منفصل مبني في محل رفع مبتدا. حَيَّةٌ : خبر مرفوع . تَسْعَى : فعل مضارع مرفوع و علامة رفعه الضمة المقدرة على الألف للتعذر . وفاعله ضمیر مستتر تقدیره (هي) . و الجملة الفعلیة (تَسْعَى) خبرٌ ثانٍ عند بعض العلماء ، و عند جمهور النحاة (تَسْعَى) في محل نصب حال .

(3) چونکە (حال) دەکرێت جملەی فعلی بێت ، وەکو لە باسەکانی داهاتوودا باس دەکرێت.







**خوێنەری بەڕێز:**

**ئەم کتێبە یەکێکە لەمەوسوعە گەورەکانی زانستی ڕێزمانی عەرەبی، و لەجیهانی ئیسلامیدا بە ناوبانگەو وەرگێڕاوتە سەر زۆرێک لەزمانەکان، بۆیە بەندەش بە پێویستم زانی دەقی کتێبەکە دوو بەشەو ئەلفیەی ابن مالك، شەرح و ڕاڤەکەی (( ابن عقیل )) وەکو خۆی وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، لەگەڵ دانانی پەراوێزو ڕوونکردنەوەی زیاتر لەکات و شوێنی پێویست لە پەراوێزی هەموو لاپەڕەکاندا، تۆی بەڕێزیش پێویستە بەوردی بیخوێنێتەوەو هەوڵ دەی لێی حاڵی بی، بۆ سوودمەندبوون لێی.**

**خوای گەورە بەختەوەرو سەرفرازی دونیاو دواڕۆژمان بکات**